د. ئەفراسیاو هەورامی

پێداچوونەوەی زمان
حەسەن عەبدولکەریم





# شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و سۆڤیێت





# شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و سۆڤێت
# لە بەڵگەنامە و چاپەمەنییەکانی سۆڤێت دا

پێداچوونەوەی زمان
حەسەن عەبدولکەریم

بـە پێچەوانــەی بۆچوونــی بەلشــەویکەکانەوە، وەك لــە ڕاپۆرتــەکانی نوێنــەرانی سۆڤیت لە تورکیاوە دەرئەکەوێت، سەرکردەکانی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید لـە مێـژەوە خـەریکی ئامـادەکردن و ڕێکخسـتنی بـوون، واتـە پـاش پـەیمانی لـۆزان و جـێ بـەجێ نەکردنی پەیمانی سـیڤەر بـوو، کـە هیـچ داخوازییـەکی گـەلی کـورد نەهاتـە دی. کـەچی بەلشەویکەکان لە چاپە مەنییەکانیاندا دەنووسن کە ئەو ڕاپەڕینە بە ئاژاوەی ئینگلیـس بوو و پەیوەندی هەبوو بە کێشەی موسڵەوە، یا بۆ گەڕانەوەی سیستمی خەلافەت بوو.

ئەوەی کە ئاگاداری ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەو سـەردەمەی تورکیـا و ناوچەکـە بێـت، دەزانێـت کـە کـاتێك کوردەکـان خـەریکی ڕێکخسـتنی ڕاپەڕینەکـە بـوون ئینگلیـس و هاوپەیمانەکانی لە پـەیمانی لـۆزان بەرامبـەر بـە تورکیـا پاشەکشـەیان کـرد و تورکیـاش گفت و بەڵێنی پێدان کە چیتر باسی موسڵ و ئەو ناوچانەی کەوتبوونە ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنسییەکانەوە (سوریای ئەمڕۆ) نەکات و هەروەها پابەندی ئـەو مەرجانـە بێـت کـە بۆیان داناوە، هاوپەیمانانیش دیارە چیتر باسی پەیمانی سیڤەر ناکەن، واتـا هاوپـەیمانان و تورکیا ڕێککەوتبوون و پاش کونفەرانسی لۆزانیش وتووێژی نێوانیـان هـەر بـەردەوام بوو، ئیتر چۆن ئینگلیس دێت و لە لایەکی ترەوە ئاژاوە دەنێتەوە. لە لایەکی ترەوە ئەو کاتەی کە سـەرکردەکانی کـورد خـەریکی خۆڕێکخسـتن و کۆکردنـەوەی چـەك و تفـاق و هـێز بـوون هێشـتا داروەدەسـتەی خەلافــەت مــابوون. واتــە هــەم ســوڵتان و هــەم حکومەتەکەیشی مابوو، ئەو دەمە دوو حکومەت لە تورکیادا هەبوون، هی سوڵتان و هی کەمالییەکان و دارو دەستەی سوڵتان لە کۆتایی ساڵی *1924* دا تورکیایـان بـە جێهێشـت، ئیتر چۆن ئەو ڕاپەڕینە لە ماوەی دوو مانگدا ڕێك دەخرێت؟.

هـەروەها لـە ڕاپۆرتـەکاندا هـاتووە کـە شـێخ سـەعید و ســەرکردەکانی تـری ئـەو بزووتنەوەیـە لـە لایـەن تورکـە گـەنج و کەمالییەکانــەوە ڕێزیـان لێگــیراوە، هـەر ئـەو کەمالییانە تا ئیشیان بە کوردەکان هەبوو دەچوونە کوردستان و لەبـەریان دەپاڕانـەوەو داوای پشـتگیریی و یارمـەتییان لێدەکـردن، بـەڵێنی چارەسـەر کردنـی کێشـەی کوردیــان پێدەدان و باسی برایەتی و یەکسانی کورد و تورکیان دەکرد. بەڵام پاش ئەوەی کە هیچ بەڵێن و داخوازییەکی کوردیان بەجێ نەهێنا و سەرکردەکانی کورد سوور بـوون لەسـەر

بەدیهێنانی مافی گەلەکەیان کردیانن بە دار دەستی ئیمپریالیزم و موجاهیدی خەلیفـە و سولتان و دژی شۆڕش و... لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە دوو شـتی دژ بەیـەکی ئـەو درۆو دەلەسانەی بەلشەویکەکان بدەم و بڵێم رژێم یـا ئیمپراتورییـەتی سـولتان یـا خەلیفـەی عوسمانی بە دەستی ئەو ئیمپریالیسـتانە روخـا و لـە نـاوچوو، ئیـتر چـۆن ئیمپریـالیزم یارمەتی ئەو لایەنە دەدات کە دەیەوێ دووبارە خەلیفە بگەڕێنێتەوە؟

هـەروەها لـە ڕاپۆرتـەکاندا هـاتووە کـە شـێخ سـەعید لــە بنەماڵەیـەکی ناسـراو و نیشـتمان پــەروەر و شۆڕشـگێڕ و تەنانــەت ڕۆشنبیریشــە، بـاوك و باپـیری لـە لایـەن سولتانەوە لەسەر کێشـەی گەلەکـەیان شـەهید کـراون و خۆیـو بنەماڵەکـەی ئـاوارەیی و زیندان و زیانی زۆریان پێگەیشتووە، ئیتر چۆن ئەو کابرایە ئەمرۆ دەیەوێ خەلافەت و سولتان بگەڕێنێتەوە، لە لایەکی ترەوە دەبێ بەلشەو یکەکان باوەڕ بە ڕاپۆرتی دیپلۆمات و نوێنەر و پیاوەکانی خۆیان لە تورکیادا بکەن نەك بە درۆ و دەلەسەی پان تورکیسـتە خوێن مژورەگەز پەرستەکان.

بەلشەویکەکان زانیارییەکی تەواویان هـەبوو لەسـەر سـەرکردەکانی بزووتنەوەکـە، پێش ئەوەی شێخ سەعید ببێتە سـەرکردەی ڕاپەڕینەکـە و نـاوی بڵاوببێتـەوە، هـەندێ کۆمیتەی شۆڕشگێڕ لە کوردستانی باکوور (تورکیا) لە کاتی خۆی دروسـت بـوو بـوون و ئەم کۆمیتانە پەیوەندییـەکی بـاش و دۆسـتانەیان لەگـەڵ سـۆڤێتدا هـەبوە و بگـرە زۆر جار بە گۆڕینەوەی نامە و هەروەها نوێنەرانی هەر دوو لا هاتوچۆی یەکتریان کـردووە، لـەم بـارەوە هـەندێ بەڵگــەی تریــش هــەن کــە هیــوادارم بڵاوبکرێتــەوە، بــۆ نموونــە سەرهەنگ خالید جەبرانلی، یوسف زیا، دوکتور فوئاد، شێخ عـەبدولقادری کـوڕی شـێخ عوبەیدوڵلا، سەرهەنگ نەورەس و دەیان ناودار و ڕووناکبیر کە لە ناویـاندا یاسـاناس و ڕۆژنامە نووس و نوێنەری مەجلیس و ئەفسەر و...، دەبینـرا و نـاوی ژمارەیـەك لەوانـە لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە و تەنانەت هەندێ لەوانە کە لە ڕاپۆرتـەکاندا ناویـان هـاتووە بـە ڕووناکبـیر و زانـا و مرۆڤـی سیاسـی و شۆڕشـگێڕ دانـراون و زۆربــەیان لەســەردەمی سـولتان و خەلیفـە دا خراونەتـە زینـدان و تووشـی ئـاوارەیی و دەربـەدەری بـوون، ئیـتر چۆن دەبێ بە پیاوی ئیمپریالیزم و سولتان دابنرێن. کۆمیتـەکانی کـورد کـە لـە مـانگی

مـای سـاڵی *1923*دا یـەکدەگرن و بـە نـاوی کۆمیتـەی ئـازادی یـا سـەربەخۆیی کوردسـتان دەست بە چالاکی دەکەن، خالید جەبرانلی دەبێتە سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە و یوسف زیـا (ضیـاء)ش کـە یـەکێك بـوو لـە ڕابـەرانی ئـەو کۆمیتـە یـەکگرتووەو نوێنـەری پێشـووی بـەتلیس بـوو لـە مەجلیسـی تورکیـا، سـاڵی *1923* ئـەرکی پـەیوەندی کـردن بـە شـێخ سەعیدەوەی پێ دەسپێردرێت، کاتێك شێخ سەعید بەڵێنی بەشداری و خۆ بەختکردنی پێـدەدا لـە پێنـاوی سـەربەخۆیی گەلەکـەیدا، ڕابـەرانی بزووتنەوەکـە یـا وردتـر بڵێـین کۆمیتـەی ئـازادی کوردسـتان بـۆ بـە دەسـت خسـتنی چـەك و تەقەمـەنی بڕیـار دەدات پـەیوەندی بکـەن بـە شـێخ مـەحمود و سمکۆ وە. لـەم بـارەوە بەڵگـەی پێویسـت لەبـەر دەستدا نییە، ئەگەر هەشبێت من ئاگام لێی نییە، هـەروەها دەربـارەی هەڵوێسـتی شـێخ مـەحمود و سمکۆ لـەو بارەیـەوە زانیـاریم نییـە، بـەڵام کـوردی باشـووری کورسـتان کـە هێشتا دەوڵەتی عێراق دروست نەکرابوو، هەروەها کوردی سوریا کـە ئـەو کاتـە لـە ژێـر دەسەڵاتی فەرەنسـادا بـوو لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە کوردەکـانی کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی ئـێران کـە لـەو سـەردەمەدا هێشـتا سـنووری نێـوان تورکیـا و ئـێران دانـەخرابوو، لـەو ڕاپەڕینەدا بەشدارییان کردووە وەك عەلی ڕەزا کە ئەندامێکی چالاکی کۆمیتە بووە.

پاش تێکشکانی شۆڕش شێخ سـەعید دەچێتـە عـێراق و لـەوێوە دەچێتـە سـوریا و بەشداری دەکا لە پارتی خۆیبوون دا.

کۆمیتـەی ئـازادی کوردسـتان هـەروەها دەکەوێتـە چـالاکی دیپلۆماسـییەوە وەك پـەیوەندی کـردن بـە کۆمەڵـەی نەتـەوەکان و هاوپەیمانـەکان. لـە کوردسـتانی باشـوور پـەیوەندی دەکـات بـە ئینگلیسـەکانەوەو لـە کوردسـتانی سوریاشـدا پـەیوەندی دەکا بـە فەرەنسییەکانەوە بـە مەبەسـتی بـە دەسـتهێنانی پشـتگیریی ئـەو وڵاتانـە بـۆ مەسـەلەی کورد، بەڵام بە داخەوە فەرەنسا و ئیتالیا بە هۆی ئەو کێشـەو گرفتانـەی کـە هـەیانبوو لەگـەڵ بریتانیـادا لەسـەر دابەشـکردنی ئـەو وڵاتانـەی پـاش ڕوخـانی ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی بەردەسـتیان کـەوتبوو، نـەك تـەنیا هەڵوێسـتی بێلایـەنییان نـەبوو، بـەڵکو کەوتنە وتووێـژ و پێکهاتن لەگـەڵ تورکیـا بـۆ ئـەوەی ڕێگـە لـە کەڵـەگایی ئینگلیزەکان بگرن و ئینگلیزەکانیش وەك باسکرا لەبەر نزیك بوونەوەی تورکیاو فەرەنساو ئیتالیـاو

هەروەها سۆڤێت دەکەونە مامەڵەو وتووێژی بەردەوام لەگەڵ تورکیا. بۆیە ئەو هەڵوێستانە هەموویان بە زیانی کورد تەواو بوون.

بە پێی زۆر سەرچاوە لە شۆڕشی شێخ سەعیددا ئەرمەن و ئاسوری چەر کەس و گەلانی تری ناتورك بەشداری دەکەنو پشتیوانیوهاوهەستیبەرامبەر بە شۆڕشەکە دەر دەبڕنو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ شەهید دەکرێتو ژمارەیەکی یەکجار زۆریشیان لێدەگیرێتو لە لایەن دادگاکانی تورکیاوە بە مەرگ مەحکوم دەکرێن، بەلگەی حاشا هەڵنەگری ئەم ڕاستییەش ڕاکردنی ژمارەیەکی زۆری ئاسوریو ئەرمەنە بۆ کوردستانی باشوورو سوریاو ئێران.

لە لایەکی ترەوە بەشداریکردنی ئەم گەلانەی بە ئایین مەسیحی دژی ئەو بۆچوونەی پان تورکیست بەلشەویکەکانە کە شۆڕشەکەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە گوایا بۆ گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەتو جێبەجێکردنی شەریعەتو یاسای ئیسلامە. هەروەها لە بەلگەکاندا هاتووە لەکاتی هێرشکردنە سەر شاری دیار بەکر، شۆڕشگێڕانی کورد بە دروشمی"بژی کورد" "بژی کوردستان" " بژی کوردستانێکی سەربەخۆ" دەچوونە پێشەوە. لە کاتی دادگایی کردنی شۆرشگێڕە کوردەکاندا تاوانی هەرە گەورە کە لە لایەن دادگاکانەوە دراوەتە پاڵیان،"خەبات بۆ سەربەخۆیی کوردستان" و"جیابوونەوەو پارچەپارچەکردنی تورکیا" بووە، ئیتر بۆ دەبێ چاپەمەنی بەلشەویکەکان ڕاستییەکان بە پێچەوانە بخەنە ڕوو. سەرۆکی دادگای تورك کە حوکمی شێخ سەعیدو هاوڕێکانی دەدات پێیان دەڵێ: هەندێك لە ئێوە کەمو کووڕیو کردەوەی خراپی دەوڵەتی تورکیاو هەروەها پشتیوانی و بەرگریتان لە خەلافەت کردە بیانوو بۆ ئەم ڕاپەڕینە، بەلام هەمووتان لەسەر دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ یەکدەنگبوون".

چاپەمەنی کەمالیستو بەلشەویکەکان لە هەموو ڕووداو و شتێك بۆ بەدناوکردنی شۆڕشەکە کەڵکیان وەرگرتووە، بۆ نمونە دەنوسن کە شۆڕش (ئەوان بە ڕاپەڕینی دژی شۆڕش یا ڕاپەڕینی فەناتیکەکان ناوی دەبەن) کاتێك دەستی پێکرد کە کۆمسیۆنی کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بە کێشەی مووسڵ لە شاری مووسڵدا بوون. پێویستە

بگوترێت کە مووسڵ یـا کـەرکوك بـە گشـتی عـیراقی ئـەمڕۆ هـەر لـە سـاڵی *1919* وە لـە لایەن ئینگلیزەکانەوە دەستی بەسەردا گیراو گێرەو کێشە لـە نێـوان تورکیـاو ئینگلـیز پـەیدا بـوو. ئیـتر باسـی ئـەو وڵاتانـە نـاکرێت کـە بـە سـەرۆکایەتی ئینگلیـس لـە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیایان کردەوەو دەوڵەتیان بـۆ دروسـتکرا. *29*ی ئۆکتۆبـەری ساڵی *924* سـنووری نێـوان عـیراق و ئـێران دانـرا کـە پاشـتر بـەناوی (هێڵـی برۆکسـل) نـاونراو لـە لایـەن کۆمەڵـەی نەتەوەکانـەوە دیـاری کـراو بـۆ چارەسـەرکردنی تـەواوی کۆمیسیۆنێك پێکهێنرا. لە کۆتایی مانگی کانونی دووهەمی ساڵی*1925*دا ئەو کۆمیسیۆنە دێتە موسڵ بۆ کۆکردنەوەی زانیاریو شارەزابوون لە هەڵوێستی دانیشـتوانو بـە گشـتی بۆ لێکۆڵینەوە. کەواتە کۆمیسـیۆنەکە یـا بـە گشـتی کێشـەکە پێـش راپەڕینەکـە بـووەو جاری یەکەم نەبوە کە کۆمیسیۆن دێتـە ناوچەکـەو بگـرە لـە سـێی سـێپتەمبەری سـاڵی *1925*دا واتـە پـاش دامرکاندنـەوەی شۆڕشـەکەی شـێخ سـەعید کۆمیسـیۆنەکە ڕاپۆرتـی گەشتەکەی خۆی ئاراستەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەکـات، واتـە لـە بـەرژەوەندی فـانداتی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بەسـەر ناوچەکـەدا بـەماوەی *25*سـاڵ، بـەپێی ئـەو بڕیارەش دەبێت کوردەکان خۆیان بەڕێوەببەن، دادگاکـان، فێرگـەکان بـە زمـانی کـوردی بێتو زمانی کوردی زمانی ڕەسمی ناوچەکە بێتو تەنیا لە*15*ی دیسـەمبەری سـاڵی*1925* واتـە چـەند مـانگ پـاش سـەرکوتکردنی شۆڕشـەکەی شـێخ سـەعید پێشـنیاری ئـەو کۆمیسـیۆنە لـە لایـەن کۆمەڵـەی نەتەوەکانـەوە پەسـەند دەکرێـتو تەنانـەت سـەرۆك وەزیرانی ئەو سەردەمەی عێراقیش لە پارلـەمانی عـێراقدا دان بـە هـەموو بڕیارەکـاندا دەنێتئەویش بە دیکتەکردنی ئینگلیز.

لە لایەکی ترەوە لە پەیمانی لۆزاندا تورکیا و ئینگلیزو نەیارەکانی ڕێك کەوتبوون لەسەر لابردنی پەیمانی سیڤەرو بەستنی پەیمانی لۆزان، ئیتر دەسـتی تـورك واڵا بـوو و مەترسی ئەوەی نەما چیتر لەگەڵ هـاو پەیمانـەکان تووشـی گـێرەو کێشـەیەکی جیـددی ببێت، واتا کێشەی مووسڵو گرژی نێوان تورکیاو ئینگلیز چارەسـەر کـراوەو ئەگـەر بـە تـەواویش نـەبێ مەترسـی دروسـت بوونـەوەی شـەڕ لـەنێوانیاندا نـەدەکرا. تورکیـا ئـەو توانایـەی نـەبوو لـەباری سیاسـی، ئـابووری، سـەربازیەوە، بـەڵکو خواخـوای بـوو وازی

لێبێنـنو لـە پاشمـاوەی ئیمپراتۆرییەتـە هەڵوەشـاوەو دۆڕاوەکـەیدا دەوڵـەتێکی تورکـی دابمـەزرێنێتو ئەویشیان لـە دەست نـەچێت. ئینگلیزەکـانیش بـە هـۆی ئـەو پـەیمانی دۆستانەی کە تورکیا لەگەڵ سۆڤیت و فەرەنسە و ئیتالیادا بەستبووی تەنیا مابوویـەوە ونـەیدەوێرا چیـتر دەسـتدرێژی بکاتـە سـەر ناوچەکـەو ئەگـەر بیشـی کردبایـە لـە بـەرژەوەندی ئـەو دا نـەبوو، چونکـە ئـەو سـێ دەوڵەتـە بـە تایبـەتی سـۆڤیت کـە پشتیوانییەکی هەمەلایەنەی تورکیای دەکرد، بەهێز بوون و تورکیاش بـۆ ئـەو بیـانووە دەگەڕا کە زیاتر خۆی لە سۆڤێت نزیك بکاتـەوەو دووریـش نـەبوو تورکیـا بـە پاڵپشـتی سوڤێت دووبارە هێرش بکاتەوە سەر مووسڵ.

لـە لایـەکی تـرەوە ئینگلیز ئـەوەی مەبەسـتی بـوو واتـە نـەوتی مووسـڵ دەسـتی بەسەردا گرت و مسـۆگەری کردبـوو، مەترسـی بەلشـەویزمیش بـۆ ئینگلیزەکان و بڵاو بوونەوەی لە ناوچەکەدا و ئاژاوە نانەوەی سۆڤیت بۆ ئینگلیزەکـان دەکـرا. ئینگلیزەکـان بـاش دەیـانزانی کـە تـورك و رووس دوو دوژمنـی گـەورەی یـەکترن و چـەند سـەدەیە دوژمنایـەتی یـەکتریان کـردووە و دەیـان شـەڕی خوێنـاوی و کاولکـەر لـە نێوانیـاندا ڕوویداوە و ئاشت بوونەوەیان نییە و ئەگەر هەشبێت کاتییـە و دۆسـتایەتی ئـەمڕۆیان لـە ڕووی ناچـاری و لەبـەر ئـەو بارودۆخـەی نێـو دەوڵـەتی و ناوچەکەیـە و دژایـەتی و نـاکۆکی کەمالییـەکان و بەڵشـەویکەکان بەرامبـەر بـە ئانتانتـەکان و ئیمپریـالیزم بـە تایبەتی ئینگلیزە. ئینگلیزی کۆنـەکار و خـاوەن ئـەزموونێکی زۆر نەیدەویست تورکیـا بخاتە باوەشی سۆڤیت و لە لایەکی ترەوە لە فەرەنسا نزیـك ببێتـەوە، بـەڵکو وردە وردە لەگـەڵ تورکیـادا هـەوڵی ئـەوەی دەدا کـەلێی نزیـك ببێتـەوەو لـە سـۆڤیتەکان دووری بخاتەوە، ئەنجامەکەش بە مەرامی ئەوان دەرچوو، ئەوەبوو پاشتر تورکیا نزیك بوویەوە لـە ڕۆژئاواییـەکان و بـوو بـە ئـەندامی نـاتۆیش. ئیـتر هـەر بـە جارێ نـەك هـەر باسـی کوردیان نەکرد و نەما بەڵکو لەو هەموو تاوانانەی کە تورکیا بەرامبەر بە کـورد کـردی بێدەنگ بوون و تەنانەت یارمەتی ئابووری، سەربازی، سیاسی ئەوانیش بوو کـە تورکیـا تا ئەمڕۆ توانیویەتی شۆڕشەکانی کورد یەك لە دوای یەك سەرکوت بکات.

ڕۆژ ئاواییـەکان بـاش دەیـانزانی کــە تورکیـا بــەرەو ڕووی ســێ مەترســی گــەورە بووەتەوە، کێشەی کورد، ئابووری لاواز، مەترسی لە سۆڤیتی دراوسێی کە هێرش بکاتـە سەری یاشۆڕشێکی سۆسیالیستی لـەوێ بـەرپا بکـات (تورکیـا مەترسـی یۆنـان و وڵاتـانی عـەرەبی و ئێرانیشـی لێدەکـرا) کەواتــە بـۆ ئــەوەی دەوڵەتەکـەی خۆیـان بپــارێزن و کوردستانیشـیان لـە دەسـت دەرنـەچێت ملکەچی هـەموو مــەرج و ئامۆژگـاری وڵاتـانی ڕۆژئاوا بوون و بەم چەشنە مانەوەی خۆیان مسۆگەر کرد و ئــەوە بـوو کـە تورکیـا بـوو بە هاوپەیمان و دۆسـتی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا. ڕۆژئاواییـەکانیش، بـە تایبـەتی پـاش مردنـی ئــەتاتورك و دواتــر کــە تورکیــا دەبێتــە ئــەندامی نــاتۆ و لەگــەڵ کۆمەڵگــەی وڵاتــە ئەوروپییەکاندا تێکەڵ دەبێت ئیتر باسی تاوانەکانی بەرامبـەر بـە گـەلی کـورد ناکـەن و یارمەتی هەمە چەشنەی دەدەن و دەبێتە پێگەیەکی ستراتیژی بۆیـان و دەورێکـی بـاڵای پێ دەبینن لە سیاسـەتی دژایـەتی کردنـی سـۆڤێتدا، هـەروەها ڕێگـای لـەتبوونێکی تـری وڵاتەکەیان گرت و ڕۆژئاواییـەکانیش کـە دەسـتی هـەرە گرنـگ و بـەرزیان لـە دارشـتنی سیاسەت و ئابوور ی و سەربازی لە ئاستی جیهاندا هەیە و بەبێ ڕەزامەندی ئەوان هیــچ کێشـەیەکی جیـهانی چارەسـەر نـاکرێت، تورکیـا ئـەمرۆ و دوێنـێ خـۆی لــە باوەشـیاندا پاراستووە، بە تایبەتی ڕێکخراوە نێو نەتەوەییەکان. وەك کۆمەڵەی نەتــەوەکان (عصبة الامم) و پاشتر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە هەمیشە لە دەستی ئەواندا بووە.

سـەرکردایەتی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کوردیـش هـەر لـە سـەرەتاوە تـا دوێنــێ بـەهۆی نزیکبوونـەوەی تورکیـا و وڵاتـانی ڕۆژئـاوا لـە یـەکتر کەوتنـە دوور کەوتنــەوەو دژایەتیکردنیان و ئەمەش لە بەرژەوەندی تورکیادا بوو، بووە بیـانوو و فـاکتێکی زیـاتر بە دەستی تورکیا و ڕۆژئاواییەکانەوە بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیــە بەلایـەنگری سـۆڤێت و چەپ و ئانتی ڕۆژئاوا دابنێن کە ئەمە خواستێکی لە مێژینە و ئاواتی تورکەکان بـوو هاتە دی.

ئـەوەی کـە مەبەسـتمان بـوو و لێـی دوور کەوتینـەوە شۆڕشـی شـێخ سـەعید بـوو، باســەکەمان لەســـەر ئـــەوە بـــوو کـــە کەمالییـــەکان و بەلشـــەویکەکان ســـەرهەڵدانی کوردەکانیان بەستووەتەوە بە هاتنی کومیسیونی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ مووسـڵ، واتـە

کێشەی مووسڵ و شۆڕشی شێخ سەعید دوو ئاڵقەی یەك زنجیرە بوون و لەسەر خواستی ئینگلیز ئەو شۆڕشە هەلگیرساوە بۆ ئەوەی تورکیا ناچار بێت دەست لە مووسڵ بکێشێتەوە و چۆك بە تورکیادا بدەن و خەریکی شەڕ بێت لەگەڵ کوردەکان و دەرفەتی ئەوەی نەبێت ئاوڕ لە مووسڵ بداتەوە.

ئێمە پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە ئەو ڕاپەڕینە پاش پەیمانی لۆزان دەس بە ڕێکخستنی کرا، واتە هەر لە ساڵی *1923* کێشەی مووسڵ چارەسەر کرا بوو، بە پێی هاتوچۆی کومیسیونی نەتەوەکان چ پێش و چ پاش شۆڕشەکە، بەڵام هەر ئەوەی ما بوو کە پەیمانەکە مۆر بکرێت و ئەویش کاتێك مۆرکرا کە شۆڕشی شێخ سەعید سەرکوت کرا بوو. ئیتر ناچێتە عەقڵەوە کە ئەم بۆ چوونە تەنانەت گومان و شکی لێ بکرێت، چونکە تورکیا بە ڕواڵەت لە کێشەی لەناوبردنی شۆڕشی کورد سەرکەوتنی بە دەست هێنا بوو، جێ پێی خۆی قایم کرد بوو. بە پێی ئەو بۆچوونە بێت دەبوا مووسڵی بە ئینگلیز نەدابا و شەڕی لەگەڵدا بکردایە، یا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە، ئەگەر شۆڕشی کورد پەیوەندی بە کێشەی مووسڵەوە هەبوە بۆ لە کاتی شۆڕشەکەدا پەیمانەکە مۆر نەکرا، خۆ تورکیا وەك جاران ملکەچی هەموو مەرج و داخوازییەکانی هاوپەیمانان بوو؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بۆچوونانەی کە گوایا شۆڕشی شێخ سەعید پەیوەندی بە کێشەی مووسڵەوە هەبوە، ئەم پرسیارانە دێنە پێش، بۆچی ئەو ڕاپەڕینە پێشتر بە دەستی ئینگلیزەکان هەڵنەگیرسا؟ بۆچی ئینگلیز پشتیوانی سەربازی، دراوی، دیپلۆماسی لە شۆڕشەکە نەکرد؟ بۆچی ڕاپەڕینەکە لە شوێنە نزیکەکانی سەر سنووری کوردستانی ژێر دەستی ئینگلیز، واتە کوردستانی باشوور یا عێراقی ئەمڕۆ دەستی پێ نەکرا تا چەك و تەقەمەنی و یارمەتی ئینگلیز بگاتە دەستیان و کوردەکانی ئەویش بتوانن یارمەتی کوردەکانی کوردستانی تورکیای برایان بدەن و ئینگلیز ئەوانە بنێرێتە یارمەتییان، یاخود ئەگەر هات و شۆڕشەکە تووشی شکست بوو بەرەو کوردستانی ژێر دەستی ئینگلیز پاشەکشە بکەن؟ ئەگەر شۆڕشەکە لە ناوچەکانی نزیك بە ئینگلیز دەستی پێ کرابا کوردی سوریاش بە ئاسانی دەیانتوانی بەشداری تێدا بکەن و هەم لە

بـەرژەوەندی ئینگلیزیشدا بـوو کـە ئـەوانیش لـە ژێـر دەســتی نــەیارێکی خـۆی (واتــە فەرەنسە) بێنەدەر یـاخود سـەرکردەیەکی وەك شـێخ مـەحمود یـا سمـاییل خـانی سمکۆ دەیانتوانی یارمەتی براکانیان بدەن لە کوردستانی باکوور واتە کوردستانی ژێـر دەسـتی تورکیا.

دەبینــین ناوچــەی ڕاپەڕینەکــە زۆر دوور بــووە لــە ناوچــەکانی ســەر ســنووری کوردسـتانی ژێـر دەسـتی ئینگلـیز. راسـتییەك کـە لـێرەدا خـۆی دەنوێنێت ئەوەیـە کــە شۆڕشگێڕەکانی کورد لە باری چەك و تەقەمەنییەوە زۆر دەست کـورت و هـەژار بـوون، بە پێی بەڵگە و نووسراوەی زۆر لەم بارەوە چەکی شۆڕشـگێڕەکان جگـە لـە ژمارەیـەکی کەم کە کوردەکان لەسەرەتای راپەڕینەوە بە هۆی دەست بەسـەرا گرتنـی چـەند شـار و پێگـەی بچووکـی ژاندرمەکانــەوە بـە دەسـتیان هێنـا. ئـەوانیتر زۆربـەیان چـەکی کـۆن و چـەکی ڕاو و تفـەنگی مـاوزەڕ و گۆپـاڵ و خەنجـەر بـووە کـە لـە ئاسـتی سـوپایەکی پــڕ چەکی تورکیا نەیانتوانیوە کاریگەربن. راستە ڕاپەڕینەکـە چـوارده ویلایـەتی گرتـەوەو بە تەواوی مانا ڕاپەڕینێکی جەماوەری بووە، بەڵام لەبەر نەبوونی چەك ئەنجامەکـە وا بوو کە بینیمان، ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵ و هـۆزە کوردەکـان کـە دژی راپەڕینەکـە بـوون پاڵـیـان دابـوو بـە ڕژێمـی داگیرکـەری تورکــەوەو پڕچــەك کرابــوون، ئەمانــە گــەورەترین زیانیــان لــە بزووتنەوەکــە داو هــەر ئــەوانیش بــوون ڕابــەرانی بزووتنەوەکـەیان گـرت و دایانـە دەســت سـوپای تـورك، کـە شـێخ ســەعید لـە پێـش هەموویانەوە بوو.

ئینگلیزەکان ئەگەر یارمەتی ئەو شۆڕشـەیان دابایـە نـەك بـە چـەك و تەقەمـەنی، یاخود دیفاعی لێکردبانایە بە شێوەیەکی راستەوخۆ، یا لە ڕێگای کۆمەڵی نەتەوەکانەوە دژی ڕژێمی کەمالییەکا ن ڕاوەستاباو گوشاری خستبایەتە سەر تورکیا، لای کەم دەیتوانی بڕیارەکانی پەیمانی سێڤەر بگرە لۆزانیشی هێنابایەتە کایـەوەو داوای لـە تورکیـا کردبـا کـە جـێ بـە جێیـان بکـات، بـەڵام دەبینـین هیـچ کـام لــەم یارمەتییانــە، یــا بــە وتــەی کەمالیست و بەلشەویکەکان ئاژاوەی ئینگلیزەکان دیار نییە و بەڵگەیەکیش لـەم بـارەوە ناخەنە بەر دەست.

با لــە لایــەکی تــرەوە بڕوانینــە ڕاســتی ڕووداوەکــان، گــەلی کــورد کــە لەلایــەن کەمالییــەکان و ئینگلیزەکانــەوە درۆی لەگــەڵدا کــرا بــوو - کەمالییــەکان بــە بــەڵێنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردســتان و ئینگلیزەکـانیش بـە پووچـەڵ کردنـەوەی پـەیمانی سـیڤەر و تەنانەت جێ بەجێنەکردنی پەیمانی لۆزانیش - ئەویش لە کاتێکدا تەواوی گەلانی ژێر دەستی ئیمپراتورییەتەکەی عوسمانی دەوڵەتی ناسیونالی خۆیـان بـۆ دروسـتکرابوو وەك وڵاتانی عێراق و سوریا و ئوردون و لوبنان و.... تورکیش بۆ خـۆی دەوڵـەتی دامـەزراند بوو لە جێی ئیمپراتورییەتی عوسمانی و هەر کورد مابوویەوە کە خاوەنی کیـانی خـۆی نەبێت، بۆیە ئـەوانیش کەوتنـە چـالاکی و ڕاپـەڕین بـۆ گەیشـتن بـەو مەبەسـتە بـەپێی مـەنتیقی بەلشـەویکەکان -ئیـتر باسـی ئـەو پـان تورکیسـتانە ناکـەم چونکـە ئەوانـە داگیرکــەر و دوژمنــن- ئـــەو ڕاپەڕینـــە دژی شـــۆڕش و دژی پێشـــکەوتن و نـــاوەڕۆکی کۆنەپەرستانەی هەیە و لـە خزمـەتی ئیمپریـالیزم و دژی سـەروەری کۆمـاری تورکیـای سەربەخۆیە، چونکە کەمالییـەکان هاوپـەیمانیانن و دەوڵـەتی کوردیـش ئەگـەر دروست ببێت لە سەدا سەد دوژمنی سۆڤیت دەبێت و دەبێتە پێگەیەکی ئیمپریالیزم بۆ هـێرش بردنە سەر قەوقاز و سۆڤێت بە گشتی. کەوا بێت دەبێ کوردەکان دەست لە سەر دەست دانێـن و چـاوەڕێی قـەزاو قــەدەر یــا بــەزەیی کەمالیســتەکان بــن یــا راوەســتن بــەڵکو سوڤیتییەکان لە نێوان کورد و کەمالییەکان ناوبژی بکەن بەڵکو شتێك بدرێت بە کـورد و ئامۆژگاری بەلشەویکەکانیش بۆ کورد هەر ئەوە بوو کە ڕژێمـی کـەمال پێشکەوتوو و ئێسـتا خــەبات دژی ئیمپریــالیزم دەکــات و لــە بــەرژەوەندی گــەلی کــورد و شۆڕشـــی سوشیالیسـتی (واتــە یەکیــەتی ســۆڤیت) و بزووتنــەوەی کرێکـاری و زەحمەتکێشــانی جیهاندا نییە و هەر چۆنێك بێت -وەك لە یەکێك لە بەڵگەکاندا هاتووە- کـورد ئەگـەر بکەوێتە ژێر دەستی ئیمپریالیستەکان ڕزگـار بوونـی زۆر زەحمـەتتر دەبێـت تـا لـە ژێـر دەسەڵاتی تورکیادا بن. لە لایەك هەر ئەو ئیمپریالیسـتانە قـەوارە و کیـان و دەوڵـەتیان بۆ گەلانی ژێر دەستی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دروست کرد و لە کوشت و بڕو تاڵان و تەتریك ڕزگاریان کردن، کەچی ئەم یاسایە کورد ناگرێتەوە. مـن لـێرەدا نامـەوێ باسـی گـەلانی باڵکـان و وڵاتـانی تـری ئاسـیا و ئـەوروپا و ئـەفریقایی بکـەم، لـە ڕوانگـەی یـا

فەلسەفەی -باشترە بڵێین ئامۆژگاری- سۆڤیتییەکانەوە چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە چوار چێوەی دەوڵەتێکی سۆسیالیستیدا دەکرێت واتە بە هاتنە سەر حوکمی پرۆلیتاریای تورك لە تورکیادا کە ئەو دەمە ئامادە دەبێت مافی چارەی خۆ نووسین مسۆگەر بکات. لە لایەکی ترەوە تەنیا ئەو مافە بە کورد نادات کە داوای ئۆتۆنۆمیش لە ڕژێمی ئەتاتورك بکات، بەڵکو وەرگرتنی مافی کولتوریش بۆ کورد تەنیا پاش لێدان و لەناوبردنی سەرهەڵدانی دژی شۆڕشی فەناتیکەکانی کورد و شێخ و دەرەبەگ و ڕووناکبیرەکانی کورد دەزانێت واتە بە لەناوبردنی ئەرستۆکراتییەتی کورد. ئەرستۆکراتییەتی هەموو گەلێك دەوری سەرەکی و سەرکردایەتی سەربەخۆیی نەتەوەیی خۆیان لەتەواوی جیهان دا بینیوە؛ ئەو ئەرستۆکراتییەتەی کورد واتە سەرکردەکانی شۆرش بەپێی هەموو بەڵگەو نوسراوەیەك لەباشترین و روناکبیرترین و شۆرشگێڕترین پیاوی کوردستان بوون و هەروەها ڕێکخراوە سیاسییەکانی کورد، وەك کۆمیتەی سەربەخۆیی کوردستان بەسەرۆکایەتی خالید بەگی جەبرانلی پێکهاتبوو، ئەمانە بەشدارییان کردبوو لەو شۆڕشە جوانە مەرگەدا . بەڵام بەرێنمایی یان چەپڵەلێدانی بەلشەویکەکان ئەوئەرستۆکراتییانەی کورد لەناوچوون و خرانە زیندان یا کوژران یان لە وڵات وەدەرنران، کەچی پاش ئەوان نە کورد شتێکی پێدراو نەهیچ، بەڵکو سەدان شارو گوندی کوردستان کاولکران و کوردەکان لەوڵاتی خۆیان دوور خرانەوەو تورکیان هێنایە جێیان.

بەڵام ئەو گەلانەی کە لە ژێر دەستی ئیمپراتورییەتە رزیوەکەی عوسمانیدا بوون و رزگاریان بوو نە داوای ئەتۆنۆمی یان بۆ کراو نەمافی کولتوری و گەیشتنە کیانی خۆیان و چاوەڕێی هەلومەرجی شۆڕشی سوشیالیستی یا بەزەیی پێدا هاتنەوەی داگیرکەرانیان نەکرد و هەر بە یارمەتی ئەو ئیمپریالیستانە دەوڵەتی خۆیان دروست کرد، ئەو ئیمپریالیستە یان لە سوڵتان و کەمالییە ڕەگەز پەرستەکانی تورك پێ باشتر بوو و پێشکەوتوو تر بوون و هیچ نەبێ ڕێگای خوێندن و نووسین بە زمانەکەی خۆیان لێناگیرێت و وڵاتەکەیان کەمتر تاڵان ئەکرێت و زیاتر لە سایەی سەری ئەوانەوە پێشدەکەون، هەر ئەو ئیمپریالیستانە دەبنە گەرەنتی ئەوەی کە چیتر تورك

دەستدرێژی نەکاتە سەریان و ئەوانیش وەك تورك ئالا، دەوڵەت، پەرلەمان... یان هەبێت نەك هەر بە ژێر چەپۆکەیی تورك بمێننەوە کە بە درێژایی چەند سەدە دەیچەوساندنەوەو ڕاو ڕووتی دەکردن، ئەوانە چیتر باوەڕیان بە برایەتی موسوڵمان و فەرموودەکان و بەڵێنەکانی سوڵتان و خەلیفە و کەمال نەماوە.

بەڵگە و دیکۆمێنتی یەکجار زۆریش بە دەستەوەن کە سوڤێت ڕۆڵێکی گرنگی هەبوە لە پووچەڵ کردنەوەو سەر نەگرتنی پەیمانی سیڤەردا، ئەو پەیمانەی کە ئوتۆنومی بۆ کوردستان دانابوو پاشانیش دەبوو بە سەربەخۆیی -هیوادارم لە هەلومەرجێکی تردا بتوانم بلاویان بکەمەوە-. من نامەوێ ئەو سەرنەگرتنەی پەیمانی سیڤەر بخەمە ئەستۆی سۆڤێتەوە، بەڵکو لەو بڕوایەدام ئەگەر هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئینگلیز بیانویستبایە ئەو پەیمانە جێبەجێ بکرێت کەس نەبوو بتوانێ ڕێگای لێ بگرێت، بەڵام دەمەوێ بڵێم لە پەیمانی سیڤەردا خراپ یا چاك کەم یا زۆر دان بە بوو نی کیان و قەوارەیەکدا نراوە بۆ کورد و ئیمپریالیستەکان دەست پێشخەری ئەم دەستکەوتە بوون، بەڵام ئایا کەمال و بەلشەویکەکان بەرامبەر بە پەیمانی سیڤەر ئامادەبوون یا گەلاڵەی پڕۆژەیەکیان هەبوو بۆ چارەسەری کێشەی کورد یان کردیان؟

لەبەر ئەوە ڕاپەڕینی کوردەکان لەو سەردەمەدا سەرەڕای کەموکوڕی و شکستی ئەو شۆڕشە، سوور بوونی گەلی کورد دەردەخات لەسەر گەیشتن بە سەربەخۆیی خۆی وەك گەلانی تر و چیتر نەیویستووە لە چوار چێوەی تورکیادا بمێنێتەوە، هەروەها پەرچدانەوەی بۆ چوونی بەلشەویکەکان بوو کە تاقمێکیان لە ڕووناکبیر و ئەرستۆکراتییەکانی کورد ڕاگرتبوو نەك تەنیا بەشداری شۆڕشەکەیان نەکردو بێ لایەن نەبوون بەڵکو پشتی لەشکرە سەرکوتکەرەکەی تورکیایان گرت و کوشندەترین زیانیان لە شۆڕشەکەدا و تەنانەت داوای لکاندنەوەی ویلایەتی مووسڵیشیان بە تورکیاوە دەکرد و لە ڕێگای هەندێ نوێنەری دەستەمۆکراوی کورد لە مەجلیسی تورکیاوە بە ناوی گەلی کوردەوە دژی دابڕینی ویلایەتی مووسڵ لە تورکیا بوون، نامەیەکیش هەر لەم بارەوە بە ناوی نوێنەرانی گەلی کوردەوە ئاراستەی کونفرانسی

لۆزان دەکەن و تێیدا باسی یەکسانی گەلی کورد و تورك لە تورکیای نوێدا دەکەن، بەڵام ئەوانیش هیچیان پێ ناکرێت جگە لە خزمەت کردن بە ئەتاتورك.

مەبەستێکی ترم لە ڕوونکردنەوەی هەندێ بۆچوونی نازانستییانەی کورد ناسی سۆڤیتی و وڵاتانی تر کە پاشان هەندێ نووسەری کوردیش کاوێژیان دەکردەوە، ئەوەیە کە گوایا ڕاپەڕینەکەی کورد هاوکات یا پەیوەندی هەبوە بە هاتنی کومیسیونی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ مووسڵ. پێشتر ڕوونکردنەوەیەکم لەم بارەوە خستە ڕوو، بەڵام ئەی بۆ وای دانەنێین کە رابەرانی کورد سوودیان لەو گێرەو کێشەیەی نێوان تورکیا و ئینگلیز. وەرگرتووەو ویستوویانە ئەو هەلەش بقۆزنەوە کە شتێکی ڕەوا بووە، بەڵام کە کورد شۆڕشەکەی سەرنەکەوتووەو سەرکەوتن بۆ ئینگلیزەکان ماوەتەوە ئەوە شتێکی ترە. خۆ دووریش نەبوو هەر دوو لا واتە کورد و ئینگلیز سەرکەوتبان، ئەنجا ئەو کاتە دەنووسرا ڕێبەرانی کورد کەڵکیان لەو هەلە مێژووییە وەرگرت. ڕەنگە بە بۆچوونی ئەوا ن کەمالییەکان هەڵوێستیان باش بووە بەرامبەر بە کورد و شتی باشیان بۆ کورد کردووە، ئەوە کورد بووە کە خیانەتی لەوان کردووە، یاخود کەمالییە ڕەگەزپەرستەکان لە داخی کردەوەی کوردەکان کوردستانیان خاپوور کرد و ڕۆڵەکانی گەلی کوردیان لەناوبرد و هیچیان بۆ کورد نەکرد، ئەم بۆچوونە بێ سەروبەرانە ناچێتە عەقڵی کەسەوە، گریمان ڕاست بێت سەرهەڵدانەکە هاوکات بوو بێت لەگەڵ هاتنی کومیسیونەکە بۆ مووسڵ، بەڵام ئایا بۆ لاواز کردنی دوژمن و داگیرکەری وڵاتەکەت کە لەولاوە هەڕەشەی لێدەکرێت و بەهۆی کێشەی مووسڵەوە شڵەژاوە، بۆ ڕەوانییە کوردیش بێتە مەیدانەوەو داوای مافی خۆی بکات و دووریش نەبوو کورد زیاتر سەرنجی ئینگلیز بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و لە مەسەلەکەوە بگلێنێت و دژایەتی نێوان تورکەکان تیژ تر بکات و تەنانەت بگاتە ئاستی شەڕ و پێکدادانی هەردوولا، ئەوسا ئینگلیز هانای بۆ کورد ئەبرد و ناچار ئەبوو یارمەتی کورد بدات بە چەك و پارە و لە باری سیاسی و دیپلوماسی و لە ڕێگای کۆمەڵەی نەتەوەکانەوەو کوردیش زیاتر هان ئەدرا داوای جیابوونەوەو سەربەخۆیی خۆی بکات و ئینگلیزیش جارێکی تر تورکیای تەمبێ ئەکرد و دوور نەبوو کوردستانیش وەك نەتەوەکانی تر لە تورکیا دا بڕایە، خۆ

ئەگەر هەڵگەڕانەوەی شێخ مەحمود لە ئینگلیس و نامە نووسینی بۆ سوڤیتەکان و بەستنی پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ تورکیای کەمالیدا نەبوایە، دوور نەبوو ڕەوتی ڕووداوەکان و چارەنووسی گەلی کوردیش ئەمڕۆ بە جۆرێکی تر بوایە، بۆیە سیاسەتی یەکنەگرتووی کورد لەو سەردەمەدا زیانێکی گەورەی بۆ گەلی کورد هەبوو کە قەرە بوو ناکرێتەوەو زیاتر ئینگلیسەکانی خستە شکو گومانەوەو نەیاندەویست شێخ مەحمودێکی تر لە باکووری کوردستان ببینن و گەرەنتی ئەوەشیان نەبوو و کوردی باکوریش ئەگەر هانایان بۆ ئینگلیزەکان بردبێت هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە کە ئینگلیزەکان پۆزەتیفانە وەڵامی دابێتنەوە، خۆ کوردی باکووریش دەیتوانی داوای خۆ لکاندن بە کوردستانی ژێر دەستی ئینگلیسەوە بکات و ئەو کاتە کورد لەوێ نیوچە مافێکی پێدرابوو لە کاتێکدا لە تورکیا هیچ مافێکی نەبوو، ئەگەر کورد بە خاك و دانیشتووانیەوە سەر بە کوردستانی باشوور بوایە، هەلی سەرکەوتنی زیاتر دەبوو کەشتێك بە شتێك بکات و بەربەرەکانێ لەگەڵ دەوڵەتی عەرەبی عێراق زیاتر و کاریگەرتر دەبوو و هەم ئینگلیزیش زیاتر دەچوو بە دەم چارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە و کوردستانی باشوور ئەگەر بە فیدرالییەت یا سەربەخۆیی گەیشتبا ئەوە پاڵپشتێکی گەورە دەبوو بۆ بەشەکانی تری کوردستان.

باوا دابنێین ئینگلیز یارمەتی یا هانی کوردەکانی دابێت بۆ ڕاپەڕین دژی تورکە کەمالییەکان، کە ئاشکرایە ئەم یارمەتیدانە لە بەرژەوەندی خۆیدا بووە نەك کورد، باشە، ئایا دەکرا کوردەکان ئەو یارمەتیدانە ڕەت بکەنەوە؟ ئەویش لە کاتێکدا کە هێشتا ڕژێمی نوێ لە تورکیا جێ پێی خۆی پتەو نەکردبوو، لە لایەکی ترەوە ئینگلیز لە دروست کردنی دەوڵەتێکی نوێ و سەربەخۆ بۆ کورد هیچ جۆرە زیانێکی لێنەدەکەوت بەڵکوو سوودمەند دەبوو لێی. هاوپەیمانان بە تایبەتی ئینگلیز دەیانزانی کە تاوانێکی گەورەیان بەرامبەر بە گەلی کورد کردووە و دەیکەن چونکە زۆر دەوڵەتیان لەسەر خاکی ئیمپراتورییەتە ڕوخاوەکەی عوسمانی دروست کرد و هەر تەنها کورد مایەوە، ئەو کوردەی کە هەمیشە لە ڕاپەڕین و خەبات و قوربانیدانیدا بووە و بە کردەوە زۆربەی ڕاپەڕینەکانی بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بووە بە تایبەتی پاش شەڕی

جیهانی یەکەم. کورد بە پێچەوانەی زوربەی ئەو گەلانەی کە بوونە خاوەن کیان و قەوارەی خۆیان ئامادەی خەبات بووەو لە باری ژمارەی دانیشتوان و پان و بەرینی ولاتەکەیەوە گەورەتر و زیاتر بووە لە هەندێکیان، ئیتر باسی باری جیۆپۆلەتیکی و ئابووری کوردستان ناکەین کە جێگای تایبەتی و گرینگایەتی بووە و هەیە.

لێرەدا نابێ ئەوەش لە یاد بکەین کە روسیای قەیسەری هاوپەیمانی ئینگلیز لە گۆڕەپانەکەدا نەماو نەیار و دوژمنێکی سەرسەخت (واتە سوڤیت) جێگای گرتەوە و خەریکی پەلهاویشتن و دەستدرێژی بوو بۆ سەر ناوچەکە و بوو بوو بە هاوپەیمانێکی ستراتیژی تورکیا ولاتانی وەك فەرەنسا و ئیتالیاش کە هاوپەیمانی دوێنێی ئینگلیز بوون لەسەر دابەشکردنی ئەو خێر و بەرەکەتەی پاش روخانی ئیمپراتورییەکەی عوسمانی دەستیان کەوتبوو، کەوتبوونە دژایەتی یەکتر بە تایبەتی بەرامبەر بە ئینگلیز کە تا ئەو سەردەمە وەك یەکەم زلهێزی جیهان خۆی پاراستبوو، لە لایەکی ترەوە ئەمریکاش کە تازە هاتبوە گۆڕەپانەکەوەو خۆی دەنواند تەنگی بە ئینگلیز هەڵچنیبوو، واتە نەیارەکانی زۆرتر و بەهێز تر بوون و بەرە بەرە جێ پێیان لەق کردبوو و ناچار لە زۆر کێشەی جیهانیدا وازی لە کەڵەگایی و پەلهاوێشتن هێنا و وردە وردە کەوتە پاشە کشە و تەنانەت سازش کردنەوە بە تایبەتی بەرامبەر بە تورکیا، کە ئەمانە هەموویان لە بەرژەوەندی کورد و کێشەکەیدا نەبوو، واتە هاوپەیمانەکان وەك سەردەمی شەڕ یەکگرتوو نەبوون و چیتر لەسەر کێشە نێو نەتەوەییەکان یەك دەنگ نەبوون و هەریەکە بەلای خۆیدا ڕایدەکێشا، بۆیە هەر کام لەوانە لەو ولاتانەدا کە جێگیر بوو بوون هەوڵی سەقامگیربوونی خۆی دەدا و ئامادە نەبوو ئەوەی کە دەستی کەوتبوو لە دەستی بدات، بۆ وێنە بەشێکی کوردستان کە کەوتبوە ژێر دەستی فەرەنسا (واتە کوردستانی سوریا) و بەشێکی تریش واتە کوردستانی باشوور (ویلایەتی مووسڵ) کەوتبوە دەستی ئینگلیس. ئەوەشی کە لە ژێر دەستی ئیمپراتورییەتە نەخۆشەکەی عوسمانی یا تورکیای نوێدا مابووەوە، تورکەکان هەوڵیان دەدا بە هەر شێوەیەك بووە لە دەستی نەدەن و هەرچی ڤین و توڕەیی تورکە ڕەگەزپەرستەکان بوو کە بە ئیمپراتورییەتەکەیان لە دەست دابوو ڕژا بەسەر گەلی کورددا و خراپتر لە هەمووی لە

کوردستانی باکوور واتە کوردستانی تورکیا جگە لە ویلایەتی مووسڵ و کوردستانی ژێـر دەستی فەرەنسا (واتە کوردستانی سوریا) هیچ هـێزێکی هاوپـەیمانانی تیا نـەبوو، هـەر چـەندە لـە کـاتی شـەڕدا بەشـێکی زۆری لــە لایــەن هێزەکـانی روسـیای قەیسـەرییەوە داگیرکرابوو، بەڵام لەبەر ڕوودانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سالی *1917* ئەو لەشکرە کشایەوەو دوور نـەبوو ئەگـەر دەوڵـەتێکی کوردیـش لـەو کاتـەدا دروسـت نــەبوایا رووسـیاش وەك ئەندامێکی بەرەی هاوپـەیمانان ئـەویش وەك ئینگلـیز و فەرەنسـا بەشـێکی کوردسـتانی دەخستە ژێر دەستی خۆی، خۆنەدەکرا ئەو لەو خێر و بەرەکەتەی شەڕ بێ بـەش بێـت و کوردەکانیش بۆ خۆیان ئامادە بوون کـە کوردسـتان بکەوێتـە ژێـر چـاودێری روسـیای تزارییەوە، یا لای کەم بکەوێتە چوار چێوەی ئیمپراتورییەکەی رووسیاوە، لەوەی باشـتر بوو کە لە چوار چێوەی تورکیادا بمێنێتەوە.

ئەوەش نابێت لە یاد بکرێت کە هەڵگەڕانەوەی شێخ مـەحموود لـە ئینگلیزەکـان و پەیوەندی نزیکی بە کەمالییەکانەوە، هەروەها پەیوەندی کردنی بە سۆڤێتەوە فاکتەری وا نـەبوون کـە لـە چارەنووسـی گـەلی کـورد و گۆڕینـی هەڵوێسـتی ئینگلیزەکـاندا ڕۆڵـی خۆیان نەبینن، واتە کـوردی باشـوور و کـوردی بـاکوور لەگـەڵ سمکـۆ و کوردەکـانی ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنساشـدا هـەر یـەك بـە لایـەکدا لێیـان دەخـوڕی و بـەکردەوە کەوتبوونـە بەربەرەکانێی یەکترەوە، گەرچی ئەم پێشهاتە پاکانە ناکات بـۆ هیـچ کـام لـەو زلهێزانـە، نە ئینگلیز لە باشووری کوردستان ئۆتۆنۆمی سەقامگیر کرد و ستاتوسێکی رەسمی پێدا، ئیتر لەبەر بەرژەوەندی خۆی یا لەبەر نەتوانینی پشتی کوردەکـانی باکوریشـی نـەگرت و پشتی سەیید تەها و سمکۆشی بەردا و نەفەرەنسایش لە کوردستانی ژێر دەستی خۆی مــافێکی بــۆ کــورد دابــین کــرد، ســۆڤێتیش بــە پشــتیوانی کردنــی کەمالییــەکان لەســەرکوتکردنی چـەند بزووتنــەوەی کـورد لەوانــە بزووتنــەوەی شـێخ ســەعید کــە راسـتەوخۆ دەسـتی هـەبوو، نـەتوانی بـەهۆی ئـەو پەیوەندییانـەوە کــە لەگــەڵ ڕژێمــی تورکیای نوێ و هـەندێ لایـەنی کورد کـەڵك وەرگرێـت و هـەندێ داخـوازی گـەلی کـورد دابین بکات، بەڵکو نەیتوانی ڕێگا لەو کارەساتە بگرێت کە بەسەر گەلی کوردماندا هێنرا تەنانەت پاش سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی شێخ سەعید.

خاڵێکی تر کە لەو سەردەمەدا هێنرا بوویە کایەوە کێشەی ئاسوری و ئەرمەن بوو، ئەوانیش داوای کیانی خۆیان دەکرد و سەرنجی وڵاتانی ئانتانت بە تایبەت ئینگلیز و فەرنسا و هەروەها کۆمەڵەی نەتەوەکان، لەم لایشەوە یەکیەتی سۆڤیت و ئەمریکای راکێشا بوو، ئەم کێشانەش پەیوەندی بە کورد و کوردستانەوە هەبوو، بگرە ئەرمەنەکانیش داوای بەشی هەرە زۆری کوردستانیان دەکرد و بەهۆی مەسیحی بوونی ئەو دوو گەلەوە هاوسۆزییەکی هەمە لایەنە لە لایەن دەوڵەتانی ناو براوەوە بەرامبەریان هەبوو، بە گشتی ئەمەش کۆسپێك بوو لەسەر ڕێگای گەلی کوردا، بەڵام خۆ هەر دەکرا بە چارەسەر کردنی کێشەی کورد کێشەی ئەوانیش لە چوار چێوەی کوردستاندا -چونکە هەردوو گەل لەسەر خاکی کوردستان دەژین- چارەسەر کرابا باشتر و زووتریش زەمینەی بۆ ئامادە دەکرا، بە کورتی نەدەکرا پشت گوێ بخرێت و چاوپۆشی لێ بکرێت و لەسەر هەڵوێست و سیاسەتی زلهێزەکان بێ کاریگەری نەبووە.

دەسەڵاتدارانی تورك باش دەیانزانی کە پاش کونفرانسی لۆزانی ساڵی *1923* کوردەکان ئارام ناگرن و بە هەموو شێوەیەك خەریکن دیسانەوە کۆمەڵگای جیهانی ئاگادار بکەنەوەو هاوکاتیش خەریکی خۆ ئامادە کردنن بۆ ڕاپەڕینێکی تر، کەمالییەکان پاش ئەوەی بنەماڵەی سوڵتان خاکی تورکیایان بەجێهێشت کێشەی دارو دەستەی سوڵتانیان لە کۆڵ بوویەوەو لەگەڵ فەرەنسا و ئیتالیاش ڕێك کەوتبوون و پەیمانیان بەستبوو و وتووێژیان لەگەڵ ئینگلیز هەر بەردەوام بوو و سۆڤێتیش هەر بەردەوام بو لە پشتیوانی کردنی تورکیا و ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی پێدەدا و لەگەڵ ئێرانی دراوسێش لەسەر سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورد هاودەنگ و هاوکار بوون. دەسەڵاتدارانی تورك باش دەیانزانی کە کوردستانی باشووریان لە دەست چووە و باسی گەڕاندنەوەی مووسڵیش هەر بۆ ئەوە بوو ئینگلیز وازیان لێ بهێنێ و لەگەڵیان بکەوێتە مامەڵەوەو چیتر تورکیا پارچە پارچە نەکرێت، ئەگینا دەبوا تورکیا کە خۆی بە میراتگری ئیمپراتورییەتە روخاوەکەی عوسمانی دەزانی داوای گەڕانەوەی ئەو وڵاتانەی کە لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپا لە دەستی چوو بوون بکات. خۆ ئەگەر

مرۆڤ بێتە سەر راستی چ جیاوازییەك هەبوو لە نێوان کوردستانی ژێر دەستی تورکیا و لوبنان و ئوردن و سوریاداو...،

چەك و تەقەمەنی سۆڤێت، ڕێگادانی فەرنسا بە لەشکری تورك کە بە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی ئەودا تێپەڕێت و بڕواتە ناوچەی ڕاپەڕینەکەو واز هێنانی ئینگلیز لە گوشار خستنە سەر تورکیا و تەنانەت بێ لایەن کردنیشی هەر لە پەیمانی لۆزانەوە. تورکیا ئەگەر هێزی هەبوایە یابیتوانیایە بە بێ یارمەتی سۆڤێت و فەرەنسا بەو کارە هەڵدەستا، واتە پاش ئەوەی کە خالید جەبرانلی و یوسف زیا و چەند ئەندامی تری سەرکردایەتی بزووتنەوەکە گیران لە زستانی ساڵی *1924*دا، تەنانەت پێش ئەوەش هێرشی دەهێنا بۆ کوردستان و پێشی بزووتنەوەکەی دەگرت. کەوابوو تورکیا هەر لە سەرەتاوە ئاگای لە ڕێکخستنی بزووتنەوەکە بوو، بۆیە تا ئەو رادەیەی کە پێی کرا زۆربەی ڕێبەرانی بزووتنەوەکەی گرت و لە ناوی بردن، بەڵام بۆ هێرش و ناردنی لەشکر بۆ کوردستان، بەبێ یارمەتی فەرەنسا و سۆڤیت و هەروەها رازیکردنی ئینگلیزو وپاشەکشە کردنی بەرامبەر بەو سەرکەوتوو نەدەبوو. پاش گیرانی سەرکردە چالاکەکانی کورد کە شێخ سەعید وەك سەرکردەی بزووتنەوە کە دادەنرێت لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە هەوڵی گرتن یا لەناوبردنی ئەویش دەدرێت، بەڵام بە بیانوویەکی ترەوە، ئەوە بوو کە *15* پولیس دەچنە سەر ماڵی شێخ سەعید و داوای لێدەکەن کە چەند کوردی تاوانبار کە گوایا لە ماڵی شێخ سەعید خۆیان شاردووەتەوە، یاخود پەنایان بۆ بردووە بیاندات دەستیان. بەڵام کە شێخ ئامادە نابێت و داوایان لێدەکات کەلەبەر خاتری ئەو ئەوانە نەگرن، لەوەڵامدا ئەفسەرە تورکەکە دەڵێ ئێمە خاترو ڕێزی هیچ کەس ناگرین جگە لە یاساو قانون، قانونی ئەویش ئەو دەستورو فەرمانە بوو کە کەمالییەکان دابوویان بۆ گرتنی ئەو کەسانە، بەڵام هەر مەبەستی سەرەکییان گرتن یا کوشتنی شێخ دەبێت، شێخ کە دەبینێت ئەو پۆلیسە ملهوڕانە دەست بەرداری نابن، کار دەگاتە شەڕ و پێکدادان و چەند سەربازێك دەکوژرێن و ئەوانی دی لەگەڵ ئەفسەرەکەدا لەسەر ئەمری شێخ بەدیل دەگیرێن. ئەم رووداوە

دەبێتە سەرەتای راپەڕینەکە، ئەو راپەڕینەی کە بڕیار بوو لە رۆژی نەورۆزدا دەستی پێ بکرێت واتە *15* رۆژ پێش ئەو رووداوە.

دیارە تێکدانی بەرنامە و پلانی راپەڕینێکی چەکدارانە کە دوژمن ئاگادار بووبێ لێی زیانێکی گەورەی لە چارەنووسی ئەو شۆڕشەو بە تایبەتی رێبەرەکانیدا، لە باری سەربازییەوە ئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە دوژمن پێش هێرشێکی چەکدار و هاوکات لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان بە تایبەتی کە بڕیار دەدرێت دیاربەکر ئازاد بکرێت و چەك و تەقەمەنی سوپای تورك بکەوێتە دەستی شۆڕشگێڕەکان و ئەوێ بکەنە پایتەختی کوردستان. تێکدانی پلانی شۆڕشەکە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە هێزەکانی دوژمن ئامادەی بەرەنگاریی بوون، ناوچەکانی تریش کە بڕیار دەبێت هاوکات راپەڕن و شارو گوندی تر ئازاد بکەن و سەر لە دوژمن بشێوێنن و هێزی دوژمن هەر لە گەنجە و ناوچەی دیاربەکر بەرەو رووی راپەرینەکە نەبێتەوە، هەروەها سەرنەکەوتنی شۆڕشگێڕەکان لە کاتی هێرشیان بۆ سەر دیاربەکر کە کارێکی یەکجار خراپی کردە سەر ورەی خەڵك و ناوچەکانی ترو دوای گیرانی شێخ سەعید و هاوڕێکانی کە دوژمنی زیاتر هار کرد و چەند هۆیەکی تر وەك خیانەتی هەندێ لە سەرۆك خێڵە کوردەکان، ئەمانە هەمووی شۆڕشەکەی بەرەو هەڵدێرو شکست برد. تاوانی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی کورد هەر لەوەدا نەبوو کە شان بەشانی تورك کوردستانیان وێران و کاول کرد و دەیان هەزار رۆڵەی کوردیان لەناو برد و هەندێکیشیان بە ناردنی بروسکە و نامە پشتیوانییان لە کەمال کردو راپەڕینەکەیان مەحکوم کرد، بەڵکو شێخ سەعید و هاوڕێکانی لەلایەن ئەوانەوە گیرا لەسەر پردی رووباری موراد و تەسلیم بە هێزە سەرکوتکەرەکەی تورك کرا. یەکێك لە هەڵەکانی شێخ سەعیدیش ئەوە بوو کە خۆی لە گۆڕەپانی شەرەکەدا بوو و بۆ بەرزکردنەوەی ورەی خەڵك لە هاتو چۆدا بوو، ئەگەر نا زۆر زەحمەت بوو بەو چەشنە بە دیلی بکەوێتە دەستی دوژمن _تەنانەت ئەگەر شۆڕشیش سەر نەکەوتبا_. بزووتنەوەکە بە گیرانی شێخ و هاوڕێکانی بەبێ رابەر مایەوە و بوو بەهۆی ورە بەردانی خەڵك بەتایبەت شۆڕشگێڕەکان و جاری یەکەم نەبوو کە کورد بۆ خۆی بە کوشتن یا بەدیل گیرانی رابەرەکەی کۆتایی

بـە شۆڕشـەکەی هێنــاوە، ئەمــە هــەر تایبــەت نییــە بــە کـوردەوە و لــەناو زۆر گــەلی تریشدا روویداوە.

هەڵەیـەکی تـری شـێخ سـەعید و ڕێبەرایـەتی بزووتنەوەکـە ئـەوە بـوو کـە شـەڕی بەرەیی کراوە، مادام کاتی راپەڕینەکە لای دوژمن ئاشکرا بووە و خۆی بۆ بەرەنگاری یا لەناو بردنی ئامادە کردووە، دەتوانێت ئەگەر سەرکوتیشی نەکات بەرامبەری راوەسـتێت و پێگەکانی دوژمن دەتوانـن پارێزگـاری لـە خۆیـان بکـەن و بەرپـەرچی هـەر هێرشـێك بدەنــەوە و چــەك و تەقەمــەنی باشـیش بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەیــە و هــەروا هــێزی یارمـەتیدەریش هەیـە، شۆڕشـگێڕانی کوردیـش کــە لــە بــاری چــەك و تەقەمەنییــەوە بەرامبەر بە دوژمن زۆر لاوازتر بوون لەوەی کە لە هێرشکردندا سـەرکەوتن بـە دەست بهێنن و پێویست بوو ئەوان حاڵەتی دیفاع و پارێزگاری لە خۆ بگرنــە بـەرو بـە دانـانی کەمین و شەڕی پـارتیزانی زیـانی زۆر تـر بـە دوژمـن بگەیـەنن، نـەبوونی ڕێگـاو بـان و نەبوونی هۆی گواستنەوەی هـێزو چـەك و تەقەمـەنی و نـەبوونی شـارەزایی لای هـێزی داگیرکەر لە ناوچەکەدا، هەروەها مـاندوو بوونـی لەشـکری تـورك کـە ژمارەیـەکی زۆری لەشکری سوڵتانی راکردوو بوون و بـە دڵ و بـە گیـان شـەڕیان نـە دەکـرد و ژمارەیـەکی تریشـی کـە بـە کـەمال وەفاداربوون بـێ ئـەزموون بـوون، شـاخاوی بوونــی ناوچەکــە و گەلێك هۆی تر لە بەرژەوەندی شۆڕشگێڕانی کورد بوو کە دەیانتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر درێـژە بـە خـەباتی خۆیـان بـدەن و دوور نــەبوو ڕەوتـی ڕووداوەکـان بـە شـێوەیەکی تـر کۆتاییان پێ بهاتایە.

زۆر زەحمەتــە بــاوەڕیش بکرێــت کــە تورکیــای نــوێ کــە لەســەر کــەلاوەی ئیمپراتورییەتە ڕوخاوەکەی عوسمانی دروست بوو بـوو لـە بـاری ئـابوری و سـەربازی و سیاسـییەوە کـە چـەند مـانگ پێـش راپەڕینەکـە لـە دوو دەسـەڵاتیی (واتـە دەسـەڵاتی سوڵتان و دەسەڵاتی کەمالییەکان) ڕزگـاری بـوو بـوو و هێشـتا لـە لایـەن کۆمـەڵگای نێـو دەوڵەتی و زۆر دەوڵەتەوە بە ڕەسمی نەناسرابوو گێرە و کێشەی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ بە تەواوی چارەسەر نەکرابوو، شەڕی تورکیاش لەگەڵ یۆنان کە بەسـەرکەوتنی تورکیا کۆتایی پێ هات وەك کێشـەی کـورد نـەبوو کـە وا بـە ئاسـانی ڕژێـم بتوانـێ کۆتـایی پـێ

بێنێت، چونکە کورد وەك هێزێکی دەرەکی نــەبوو، لـە لایـەکی تـرەوە وەك شـەڕ لەگـەڵ یۆنان، کورد و تورك بە ناوی برایەتی و ئیسلامییەتەوە هانبدات.

شۆڕشـی شـێخ سـەعید هـەر وەك باسـکرا گوشـارێکی گـەورەی خسـتە سـەر ڕژێمـی کەمالییەکان بۆ چۆکدادان و پاشەکشەی زیاتری ئەو ڕژێمە نوێیە بەرامبەر بە فەرەنسا و ئیتالیـا و هـەروەها ئینگلیـز، پێکهاتنی کەمالییـەکان لەگـەڵ ئـەو دوو دەوڵەتــەدا لــە لایەکی ترەوە بووە هۆی نزیکبوونەوەی زیـاتری دوو ڕژێمـی ئـێران و تورکیـا، هـەروەها تورکیا وازی هێنا لەو داواکارییانەی کـە هـەیبوو بەرامبـەر بـە دەوڵـەتانی دراوسـێی بـە تایبەتی سوریا و عێراق لەسەر هەندێ ناوچەی سنووریی.

یـەکێك لـە کوردناسـە سـۆڤێتییەکان بـە نـاوی (کوزینتسـوف. ئـا. ئـا) کـە پێشـتر کونسوڵی سۆڤێت بووە لە تەورێز، لە ساڵی *1966*دا بیلوتێنێکی بــە نـاوی (کێشـەی کـورد لە قۆناغی یەکەمی قەیرانی کاپیتالیزم)دا، لەم بارەیەوە نووسیووەو زۆر شـتی ئاشـکراو و ڕوون کردووەتـەوە، بـە تایبـەتی هەڵوێسـتی دەوڵـەتی سـۆڤێتی بەرامبـەر بـە کێشــەی کورد و پــەیوەندی سـەرکردەو ڕێکخـراوە کوردییـەکان، بەرێبـەرانی سـۆڤێتەوە، نـاوبراو لەبەر ئەوەی کە خۆی لە سـەردەمی شـەڕی جیهانی دووهـەمدا بـۆ ماوەیـەك کونسـوڵی سۆڤیت بووە لە تەورێز و هــەروەها دەستیشـی گەیشـتووەتە هـەندێ ئارشـیفی سـۆڤێتی شتی زۆری بڵاو کردووەتەوە، بەڵام ئەم بلوتینە کە وەك کتێبێکە ناکەوێتە بـەر دەسـت خوێنــەران و مۆڵـەتی بـڵاو کردنـەوەی پێنـادرێت و لـە لایـەن کاربەدەســتانی ئاسایشــی سۆڤێتەوە (کەی. جی. بی) دەست بەسەر ئـەو نووسـینەدا دەگیردرێت. لەسـەر شۆڕشـی شـێخ سـەعید هـەندێ بـۆ چوونـی خـۆی و بۆچوونـی لایەنـەکانی تـر دەگێڕێتــەوە کــە پێویستە ئاماژە بە هەندێ لە نوسین و بەڵگەو دیکومێنتەکانی بدرێت.

*1*-ڕاپەڕینەکــەی شــێخ ســەعید لــە بــاری بــەربڵاوی و ڕێکخراوەییـــەوە لـــە مێژووی کورددا بـێ وێنـە بـووە و لـە ژێـر دروشمـی خـەبات بۆسـەربەخۆیی کوردسـتان گەشەی کرد. ل/*252*

*2*-ڕاپەڕینەکە *3/1* ی خـاکی تورکیـای گرتبـووەوە و دانیشـتوانی ئــەو ناوچانــە بــە هەزاران خەباتگێڕی چەکداریان ئاڕاستەی ئەو ڕاپەڕینە کرد. ل/*202*

سەبارەت بەو بۆچوونانە کە هەندێ کەس دەڵێن بۆ گەڕانەوەی خەلیفە و شەریعەتە دەڵێ:

*3*-زۆر زەحمەتە ڕاپەڕیوەکان بۆ مەبەستێکی وا ئەوەندە بە بیروباوەڕو ئیمانەوە شەڕبکەن، بە تایبەتی کە ئەوانە زۆر لە ئیسلامی ئوسولییەوە دوورن. نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە لەو ڕاپەڕینەدا ئەو هۆز و تیرە و عەشیرەتانەی بەشدارییان کردووە تیایدا، سەر بە قزلباش و یەزیدی و زازاو... هتد بوون و ئەم ڕێبازە ئایینییانەش لە بارەی ئایدیۆلۆژییەوە زیاتر مۆرکی مەسیحییەتیان پێوەیە تا موسوڵمانیەتی و دژی موسوڵمانیەتین. تەواوی مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد نیشاندەری ئەوەیە کە کوردەکان هەمیشە دژی سوڵتان و کاربەدەستانی خەباتیان کردووەو چەند سەدە ئەو کاربەدەستانەی سوڵتان، سەرکردەکانی کوردیان کوشتووەو گرتووە یاخود دووریان خستوونەتەوە. مێژووی گەلی کورد و ئیدەئالی نەتەوایەتی ئەو گەلە بۆ داهاتوو سەربەخۆیی کوردستان بووە، ئەوەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە کە گوایا کوردەکان ویستوویانە خەلافەت بگەڕێننەوە ل/*203*

*4*-چەوساندنەوەی نەتەوایەتی لە لایەن تورکە شۆڤینیستەکانەوە کە گەلی چەند ملیونی کوردیان لە زمانی خۆیان بێبەش کردووە، بووەتە کارەساتێکی گەورە بۆ ئەو گەلە و جێی تەحەممول نییە.

چەوساندنەوەی ئابووری کوردەکان، لە لایەن ژاندارم و مووچەخۆر و فەرمانبەرانی تری تورکەوە کە نەك تەنیا کردوویانەتە یاسایەکی دەوڵەتی وەك باج و لێیان وەردەگرن بەڵکو بووەتە سەرچاوەی ژیان و دەوڵەمەند بوونیان. تەواوی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئابووری ناوچە کوردنشینەکان ئەو کاتانە گەشە و پێشکەوتنیان هەبوو کە لەگەڵ بازارەکانی ڕۆژئاوا، قەوقاز و چەند ناوچەی تری روسیا – پەیوەندی ئابوورییان هەبوو، ئێستا ئەم پەیوەندییانە نەماون و لە ئەنجامدا بەرهەمی ژیانیان بە خەسارچوو و بوو بە هۆی هەژاری و ژیانی کولەمەرگی ئەو خەڵکە کە هۆیەکی تری ڕاپەڕینەکە بوو. ل *205* و *206*

*5* -فاکتەری دووهەمی ئابووری ماڵیات و باج و بەرتیلی جۆراوجۆر بوو کە لە لایەن کاربەدەستانی تورکیاوە لەو خەڵکە وەردەگیرا، بۆ وێنــە دەوڵـەتی تورکیـا بـۆ ڕاگرتـن یـا پارسـەنگی بودجـەی دەوڵـەت لـە سـاڵی *1924* دا بـۆ نـان و نـەوت و شـەکر و سـابوون و پێداویستییە سەرەتاییەکانی تر باجی دووسی قات کـرد، بـۆ قوماشـی لۆکـە کـە تـەواوی کوردەکان لەبەری دەکەن ماڵیاتیان دووقات کرد.

زەریبەی ساڵانە بۆ هەر بنەماڵەیەك (*45*) لیرەیە، ئەوەش لە کاتێکدایە کە داهـاتی ساڵانەی هەر بنەماڵەیەك *120-130* لیرەیە، واتە دەبێ یەك بەش لە سێ بەشـی داهـاتی خۆیان وەك زەریبە بدەن بە دەوڵەت، وەك لە بەڵگەکانەوە دەردەکەوێ ڕێژەی زەریبــەی کەمالییەکان زۆر لەهی سەردەمی سوڵتان زیاترە. ل/*207*

*6*-کاربەدەســتانی تــورك ڕێگــای گــەرمیان و کوێســتانی لــە ئــاژەڵدارە کوردەکــان گرتووەو بە زۆر نیشتەجێی کردوون و لە ئەنجامی ئەمەشدا مەڕو ماڵاتی کوردەکـان لـە ناوچوون و بوو بە هۆی برسیەتی و هەژاری بۆیان. هەروەها گواستنەوەی کوردەکان بـۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا و هێنانی تورك بۆ کوردستان هۆیـەکی تـری ڕاپەڕینەکـە بوو. ل/*208*

*7* -دوای شەڕێکی دوور و درێژ و خوێناوی و بە هۆی ئەو یارمەتیـەی کـە لـە دەرەوە بە تورکیا کرا، شۆڕشـەکە سـەرکوت کـرا، پاشـان دانیشـتوانی بـێ تـاوانی کـورد بـە ژن و منداڵ و پیر و گەنجەوە بێ بەزەییانە لە ناو دەبران، ئەم تۆڵە سـەندنەوە خوێناوییـەی تورکەکان بۆ ئەو مەبەستە بوو کە جارێکی تر ئەو کوردانە بیر لە ڕاپـەڕین نەکەنـەوە، پاشان دەستیان کرد بە گواستنەوەی خەڵك بۆ ڕۆژئاوای ئەناتولی و بارودۆخی نا ئاسایی و تایبەتی بۆ ناوچە کورد نشینەکان ڕاگەیـەنرا و کاربەدەسـتی سـوپاییان بـۆ دانـان کـە خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك بوون. ل *222-223*

*8*-وەحشـیگەری و تــاوانی دەســەڵاتدارانی تورکیــا بەرامبــەر بەخــەڵکی بێتــاوانی کوردستان دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە. بە ڕاستی تۆقێنەرو سامناك بوو.

لـەم خشـتەیەی خــوارەوەدا هەرچــەند زۆر کــەمترە لــەو شــتانە کــە ڕووی داوەو هەموو ناوچەکان ناگرێتەوەو تەنانەت هی ئـەو شـوێنانەش تـەواو نییـە – قوربانییـانی

تـیرۆری تـورك دەخەینــە روو كـە وێنەیــەكی ناتــەواوی ئـــەو تاوانانـــەمان دەخاتــە بەردەست. ل/*224*

| ناوچە | ژمارەی ئەو گوندانەی وێرانكراون | خانووی سوتێنراو | كوژراوان |
|---|---|---|---|
| جەبەكوار | *22* | *1065* | *2077* |
| میدیات | *16* | *1450* | *977* |
| دارخینی | *54* | *2650* | *2320* |
| كەنج | *16* | *543* | *1120* |
| حەباب | *21* | *925* | *912* |
| نەسیبین | *10* | *420* | *574* |
| دیاربەكر | *14* | *838* | *672* |
| گیرپوران | *4* | *72* | *176* |
| باجارین | *15* | *536* | *1015* |
| ئەفنات | *13* | *590* | *864* |

# باڵیوزخانەی یەکیەتی سوڤیێت لە تورکیا سەرکردەی ڕا پەرینی دژی شۆڕش لە تورکیا کێیە؟

شێخ سەعید ناسراو بە کـوردە، مرۆڤێکـی زۆر تێگەیشـتوو ڕووناکبـیرە و تەنانـەت نووسەریشە، تا هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم و لە کاتی جەنگەکەشدا، کاتێك کـە تورکە لاوەکان لەسەر دەسەڵات بـوون، سـیمپاتێکی (لایەنگرییـەکی) زۆریـان لێدەکـرد و ڕێزیان دەگرت و بە هەموو جۆرێك دەچوون بە پیریەوە.

شێخ سەعید لـە ڕاپـەڕینی مـارتی *1914*ەی کوردەکـان هیـچ بەشـدارییەکی نـەکرد. جێی گومان بوو کە ناوبراو لەو بزوتنەوەیەدا هیچ بەشدارییەکی کردبێت، ئەگەر نا لە لایـەن دەوڵـەتی ئـەو سـەردەمەی تورکیـاوە بـاوەڕی پـێ نـەدەکرا. لـەم وەختـەدا چاپەمەنییەکانی دەرەوە بڵاویان کردووەتەوە کە شـێخ سـەعید خـۆی شـاردووەتەوە لـە کونسوڵی روسیای تزاری (قەیسەری). ئەم هەواڵە هیـچ راسـتییەکی تێـدا نییـە، تـەواوی بەشـداربووانی راپەڕینەکـەی *1914* کـە توانیبوویـان خۆیـان لـە کونسـوڵی بیتلیـس بشارنەوە لە لایەن دەسـەڵاتدارانی تورکیـاوە گـیران و دەسـبەجێ هەڵواسـران، لـە مـارتی *1916*دا کـاتێك کـە بیتلیـس لـە لایـەن رووسـەکانەوە داگیر کـرا شـێخ سـەعیدی کـوردی فریـای هەڵهاتن نەکـەوت و لـە لایـەن ئێمـەوە دەسـگیر کـرا، شـێخ سـەعید پێشـنیاری خزمەت و هاوکاری خۆی بەسەرکردەی گشتی سوپای روسـیا راگـەیاند کـە رەتکرانـەوەو وەرنەگیران، ئەویش بەهۆی ئەو پەیوەندییە نزیکەی کە بە تورکە لاوەکانـەوە هـەیبوو، سـەعیدیان وەك ئەسـیرێك نـاردە نـاوەندی قووڵایـی رووسـیا، لـە *1916* تـا *1923* هیـچ شوێنەوارێکی دیار نابێت. تەنیا لە *1923* شێخ لە ئاسۆوە دەردەکەوێت و دێتە ئانکـەرەو لەوێ خۆی بە پیاوێکی پیرۆز و چاك دەنوێنێت و گوایا دەسـتی لـە هـەموو کاروبـارێکی دنیا هەڵگرتووە. پاش ماوەیەك شێخ سەعید لە ئەنکـەرە ون بـوو، ئێسـتا لـە راپـەڕینی

دژی شۆڕش دووبارە دەرکەوتووەتەوە و بووەتە سەرکردەی ڕاپەڕیوەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەناتولی.

ڕاپەڕینەکە سەرنەکەوت چونکە کاتی لە باریان لەبەرچاو نەگرتبوو بۆ ئەو ڕاپەڕینە، دیارە لە کاتێکی وەهای ساڵدا تەواوی چیا و ڕێگا و بانی کوردستان بە هۆی بەفری زۆرەوە هاتوچۆیان پیادا ناکرێت و دەبێتە هۆی لەناوچوونیان. ئەوان ناتوانن لەگەڵ ژن و منداڵ و مەڕ وماڵاتیان پەنا بەرنە چیاکان و لە شوێنە دەشتاییەکانیشدا هەموو کاتێك دەکەونە بەر مەترسی و هەڕەشەی سوپای تورکیا.

سەرەڕای ئەمەش ڕووبەڕوو بوونەوەی تورکەکان لەگەڵیاندا زۆر دژوار دەبێت، چونکە شەڕ لە شوێنە سەخت و دەست پێ ڕانەگەیشتووەکان دەبێت. بێگومان بڕیاردرابوو ڕاپەڕینەکە لە بەهاردا دەست پێ بکا، بەڵام لەبەر چارەسەر کردنی کێشەی مووسڵ کاتی ڕاپەڕینەکە لە لایەن سەرکردەکانەوە پێش خرا.

# باری جوگرافی و ئابووری و ئیتنوگرافی ناوچەی ڕا پەڕین

پەرەسەندنی ڕاپەڕینی کوردەکان بە جۆرێك بوو کە لە ماوەی مانگێکدا ئەم ویلایەتانەی گرتەوە: دەرسیم، خارپووت، میمرووت ئەل ئەزیز، مالاتیا، ئارگانا، دیاربەکر، گەنج، بیتلیس، قازی خواروو، ئەرزرۆم، ئەرزەنجان.

درێژایی ناوچەی ڕاپەڕین دووسەد و بیست کیلۆمەترە، لە کازی - ڤاراتەوە تا ئیزئوغلی سەر فورات و پانییەکەی سەد و شەست کیلۆمەترە لە ناوچەی (کیگی)یەوە تا دیار بەکر. لە باری تۆبۆگرافییەوە ناوچەی ڕاپەڕینەکە ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە: ناوچەکە زۆر کوێستانییە، لە هەندێ شوێندا بەرزاییەکەی دەگاتە *2500* تا *3000* مەتر. ئاوێکی زۆری لێیە کە ڕووبارەکانی دیجلە و فورات و لقەکانیان لێرەوە پێکدێن. هیچ ڕێگایەکی پێدا ناڕوات بە تایبەتی لە زستاندا کە سەرماکەی زۆر سەختە لە باکوور - ڕۆژهەڵاتی ناوچەی ڕاپەڕین زنجیرە چیا بەرزەکانی (بین-گل) - (داخە) و لە ناوچەکانی (وارتا) (کیگی) (گینج) کە لە هەندێ شوێندا بەرزاییەکانیان لە هەزار تا دوو هەزار و شەش سەد مەتر لە ئاستی دەریاوە زیاترە. هەر لە ناوچەی ڕاپەڕیودا لە لای ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات زنجیرە چیای بەرزی (ئانتی تاڤر) کە بەرەو باشوور شۆڕ دەبنەوە تێدەپەڕێت.

ناوەندە گرنگەکانی ناوچەی ڕاپەڕین: پالوو، چا باجور و گەنج کە دەکەونە باکووری ئانتی تاڤر، هەروەها پیران - بارەگای شێخ سەعید - خانی و ئیلجا کە دەکەونە باشووری ئانتی تاڤر.

سێ کوچکەی پالوو، گەنج، پیران ئەو شوێنەی کە یەکەمجار لە *13-1925/2/17* لەوێوە ڕاپەڕینەکە دەستی پێکرد کەوتووەتە ناوەندی چیاکانی ئانتی تاڤر. شاخەکانی

تاڤر کە بەرەو باشوور کەم کەم نزم دەبنەوە و تا دەگەنە دیار بەکر بەرزاییەکی وایان نامێنێت.

هەندێ زنجیرە چیا کە لە باکوور –ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشوور- ڕۆژئاوا کشاون لە ناوچەی گولی گلجیك و ئەرگانەوە تا چیرموك و سیڤەریك لە بەر بێ ڕێگایی ڕاپەڕیوەکان بە باشی دەتوانن بەرامبەر هێرشی تورك لە لای باکوور و ڕۆژئاواوە لە خۆیان پارێزگاری بکەن. زۆربەی ئەم چیایانە بە جەنگەڵ داپۆشراون، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی ناوچەی پالوو کە جەنگەڵەکانی زۆر چڕن. لەزۆر جێگادا زنجیرەی چیاکان لێك جیاناکرێنەوەو سەر لە مرۆڤ تێکدەدەن. ئەمەش وەك قەڵایەکی لە گرتن نەهاتووە بۆ ڕاپەڕیوەکان بەرامبەر سوپای دەوڵەتی کە لە باری جوگرافییەوە شارەزاییان زۆر لەوان کەمترە. بێگومان شاخاوی بوونی ناوچەکە خاڵێکی پۆزەتیفە بۆ ڕاپەڕیوەکا ن و لە باری ئەنجامدانی چالاکییەوە بۆ سوپای دەوڵەتی زۆر سەخڵەتە.

ناوچەی ڕاپەڕینەکە زۆر بە باشی لە باکوورەوە لەبەر چیا سەخت و دەست پێ نەگەیشتووەکانی ئانتی – تاڤر و ڕووباری فورات لە گەنجەوە تا پالۆو هەروەها لە ڕۆژئاواوە بە هۆی چیاکانی ماستارداغ، خاجەداغ، گەلوجیك داغ و گولی گوێلجیك و ڕووباری فوراتەوە پارێزراوە. هەروەها ناوچەی ڕاپەڕینەکە لە باکوور و ڕۆژئاواوە بەهۆی ڕووباری فوراتەوە گەمارۆ دراوە، هەروەك وترا ناوچەکە لە باکوورەوەو بەشێکی لە ڕۆژئاواوە لە ناوچەی چیرمیوك پارێزگاری لێ دەکرێت.

لای سەرە وەی ڕووباری دیجلە بە هۆی ئەو ڕووبارانەی کە لەلای چەپیەوە دەڕژێنە ناوی، تەواوی ناوەندی ڕاپەڕینەکە دادەبڕێت و جیای دەکاتەوە، ئەو ڕووبارە گرنگانەی دەڕژێنە ناو دیجلەوە و ناوچەی ڕاپەڕینەکە لە باکوورەوە بۆ باشوور جیا دەکەنەوە بریتین لە: دیبین سوو، ئە مبارچای، میرزا، باتمان سوو، ئیلجی، گولپ سوو.

دیجلە بە درێژایی خۆی لە ئارگانەوە تا دیار بەکر بە ڕۆخە چیاکانیەوە لەگەڵ ڕووباری فورات سنووری سروشتی باشن کە پارێزگاری دەکەن لە ناوچەی ڕاپەڕین لە لای ڕۆژئاواوە. ئەو ڕووبارانەی کە لە سەرەوە ناویان براو دەڕژێنە ناو دیجلەوە و لە باکوورەوە بۆ باشوور دەڕۆن پێکەوە لەگەڵ زنجیرە چیاکانی ئانتی – تاڤر سنوورێکی

وایان دروستکردووە کە سوپای دەوڵەتی بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت هێرش یا چالاکییەك بنوێنێت. دیجلە و فورات بە گۆمەکانیانەوە کە بە ناو چیاو گاشە بەردەکاندا تێدەپەڕن، بە هۆی خوڕی و قووڵاییەکانیانەوە شوێنی لێ پەڕینەوەیان یەکجار کەمە.

بەم چەشنە هەڵکەوتنی سنووره ئاوییەکان لەگەڵ زنجیرە چیاکانی ئانتی -تاڤر ناوچەی راپەڕینەکەیان وا لێکردووە کە دەست پێگەیشتنی لە لای باکوور و ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتەوە زۆر دژوارە. لە باری نەبوونی ڕێگاوبانەوە ناوچەکە تایبەتمەندییەکی هەیە. لە تەواوی ناوچەکەدا یەك ڕێگای شۆسەیی هەیە کە ئەویش خراپ و تێکچووە، ئەم ڕێگایە خەرپووت، مەئمورییەت ئەلعەزیز، بە ئەرگان و دیار بەکرەوە دەبەستێتەوە و ئەم ڕێگایە تەنیا بە گۆشە، /سیلکە،/ ی باشووری ڕۆژئاوای ناوچە ڕاپەڕیوەکەدا تێپەڕ دەبێت. یەك ڕێگا نییە کە بە ناو ناوچەکەدا واتە لە ڕۆژ ئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات تێپەڕ ببیت، تەنانەت ڕێگای عەرەبانەیشی لێ نییە. واتە لە باکوورەوە بۆ باشوور تەنیا چەند کوێرە رێی کاروانی لێیە کە ئەوانیش زۆربەیان لە کاتی زستان لەبەر بەفر دەبەسترێن. جگە لەوەش تەواوی ئەم کاروانە ڕێیانەش بە تەنگەبەری رووبارەکان تێپەڕ دەبن و هەر لەبەر ئەوەش راپەڕیوەکان بە گرووپی بچووك بچووك دەتوانن بیانبەستن. کوێرە ڕێگا و باریکە ڕێگاکان بۆ ڕاپەڕیوان زۆر لە بارن بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە شارەزان و ڕاهاتوون لەسەر شەڕی ناوچە شاخاوییەکان.

لە باری ئاوو هەواوە، ناوچەکە بۆ چالاکی سەربازی لە زستاندا زۆر نالەبارە زستان لەم ناوچانەدا لە مانگی دیسەمبەرەوە دەست پێدەکات و تا مانگی نیسان و سەرەتای مانگی مارس هەر بەردەوامە، زستان پلەی سەرما دەگاتە *25-20* ژێر سفر و هاوینان *40* تا *45* پلە.

## لە باری ئیتنۆگرافییەوە

ناوچەی ڕاپەڕینەکە زۆربەی دانیشتوانی کوردن، ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی ڕاپەڕین دەگاتە پێنج سەد هەزار نەفەر. بە گوێرەی ئەو سەر ژمێرییەی کە

داویەتی و تا ئێستا یەکەم سەرچاوەیە کە تورکەکان خۆیشیان پشتی پێدەبەستن بەراوردی ڕێژەی ژمارەی کورد و تورك لە ناوەندە گرنگەکانی ڕاپەڕینەکەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

| ژمارەی گشتی کورد | تورك | قزلباش | یەزیدی | کورد | ناوی ناوچەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| 237530 | 267416 | 182580 | - | 54950 | ویلایەتی مەئموریە العزیز |
| 38000 | 15460 | 27800 | - | 12000 | سنجاقی دەرسیم |
| 7581 | 2455 | 5075 | - | 2500 | قەزای چەمیش – کێرك |
| 59207 | 36481 | - | 2000 | 57207 | سنجاقی دیاربەکر |
| 10777 | 2500 | - | - | 10777 | قەزای ئیلجە |
| 69166 | - | - | 2500 | 66666 | سنجاقی ئەرگان |
| 18834 | 12588 | 700 | - | 18134 | قەزای پالوو |
| 18467 | - | - | - | 18467 | سنجاقی گەنج |
| 18331 | - | - | 836 | 17965 | قەزای کەلب (قەلەب) |

لەم خشتەیەی سەرەوەدا دەردەکەوێ کە کورد زوربەی دانیشتوانی ویلایەتە ڕاپەڕیوەکان پێکدێنن و لە تورکەکان ژمارەیان زۆرترە، دیارە ئەوانەش کە بەقزلباش و یەزیدی دانراون هەر کوردن، لەو ناوچانەی کە باسمان کردن دانیشتوانی کورد دووقاتی تورکن (ویلایەتی خارپووتی لێدەرچێ) جگە لەوەش هەندێ ویلایەتی گرنگی وەك: گەنج، ئارگان، قازی، کەلبی، ئیلجە دانیشتوانی دەتوانین بلێین هەر هەمووی کوردن.

لەم ناوچانەدا پاشماوەی گەلانی ئەرمەن، خالیدی، یاقوبی، سوریيە کاسولیکەکان، قەرەچ، جوو، ئاسوری و نەستووری کە کاتی خۆی لێرە نیشتەجێ بوون دەژین، لەم گەلانەی کە ناویان برا بە پێی راگەیاندنی تورکەکان ئەرمەنی و نەستوورییەکان

بەشداری ڕاپەڕینە کە دەکەن. بە پێی ڕۆژنامەکانی تورکیا شێخ سەعید بەڵێنی داوە کە لەگەڵ پێکهاتنی کوردستانی سەربەخۆ، ئەرمەنستانی سەر بەخۆش دروست بکات. کوردەکانی ئەم ناوچانە زۆربەیان جوتیارن، بۆ وێنە لە سنجاقی دیاربەکردا ژمارەی تورکەکان *36481* نەفەر و کوردەکانیش *59207* نەفەرن، لە ناو شاری دیاربەکردا *15000* تورك دەژین لە کاتێکدا تەنیا *4130* کەس کورد دەژین.

بە پێی ڕاگەیاندنی پالکوڤنیکی گین شناسی روسیا کارتسوڤ کە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی *1896* و هەروەها زانیاری مایڤسکی و – ت لە ساڵی *1904* لەم ناوچەیە ئەم خێڵ و هۆزە کوردانە دەژین: حەسەنلی، بیلیکلی، جبرانلی، راجی، کوتانلی، مووت، پێنجینارلی، سینگاری، عەلی کانلی و قزلباشەکانی دە رسیم. ئەوانەی کە ژمارەیان زۆرە خێڵ و هۆزی حەسەنلی و جەبرانلین، یەکەمیان کە لە قەزاکانی مەلا زگیرت، بولانیخ، خنیس جێگیر بوون لەرابوردوودا، پێنج فەوج سوارەیان هەبوە، دووهەمیان کە لە قەزای شەڕکەری ئەمڕۆ واتە وارتا دەژین دوو فەوجیان پێکهێنا بوو، ئەم هێز و خیلانە بە شەڕ کەری و ئازایی و نەبەزییان ناسراون و شانازییان پێوە دەکرێت.

بە پێی ئەوەی کە لە چاپەمەنییەکانی تورکیادا بلاو کراوەتەوە، ئەم تیرەو هۆزانە لە ڕاپەڕینەکەدا بەشدارییان کردووە: حەسەنلی، جیرانلی، لیتچلی، خینی/ ئەکشەم. *.1925/11/25*

لە کاتی دەس بە سەرا گرتنی دیار بەکر لە لایەن ڕاپەڕیوەکانەوە، کوردە زازاییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوە، کە هاوکات لەگەڵ هێرشی شۆڕشگێڕەکان بۆ سەر شاری دیاربەکر، ئەوان لەناو شاردا دەستیان کردووە بە ڕاپەڕین و بەم شێوەیە شێخ سەعیدیان هێنایە ناو شار – زازا زا راوەیە کە کوردەکانی دەرسیم قسەی پێدەکەن.

لە باری ئایینییەوە دانیشتوانی ناوچەی ڕاپەڕین، جگە لە ئیمامی سونی بەسیکتە ئایینییەکانی تر کە بە پێی بۆ چوون و ڕێ و ڕەسمی تایبەتی خۆیان دژی ئورتوکسالی سونیزمن وەك قزلباش و عەلی یەڵلاهی‌یەکان لە ناوچەی دەرسیم دەژین. ئەم گروپە ئایینییانە کە ژمارەیان زۆرە باوەڕیان بە جۆرە کولتێك هەیە کە لە مەسیحییەت و موحەممەدییەت و زەردەشتی تێکەڵ بووە و پێکهاتووەو دژی ئورتوکسالی سوننین. لەم

بارەوە پالکوڤنیك کارلسوف دەنووسێت: ژمارەی هەرە زۆری گروپی عەلی ئەڵلاهی یا قزلباش لە کێوەکانی دەرسیم و باکووری دەشتی خارپوت دەژین، کە لە کوردەکانی تر نەك تەنیا لە باری ئایینییەوە بەڵکو لە باری زاراوەیشەوە جیاوازن.

کوردەکانی دەرسیم نیوە کۆچەرین و باری ژیانیان زۆر لەوانی تر باشترە، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە کە لە چیاکاندا دەژین و لە هێرشی مووچە خۆرانی دەوڵەت دوور کەوتوونەتەوە."

هەروەها یەزیدیشی لێدەژین کە ڕەشایی و تاریکی دەپەرستن و راستەوخۆ دژایەتی ئیسلام دەکەن. کوردە سوننیەکان کە موسڵمانن و بە پێچەوانەی تورکەکانەوە سەر بە ڕێبازی سوننین، واتە کوردەکان شافیعین و تورکەکان حەنەفین، جگە لەمانە هەندێك لە پەیڕەوانی تەریقەی دەروێشی تر هەن.

سەرکردەی راپەڕینەکەی ئێستا شێخ سەعید سەربە تەریقەتی بەربڵاو و بە هێزی نەقشبەندییە. لە بارەی ئەم تەریقەتەوە، ڤ. مینورسکی دەنووسێت: ئەم تەریقەتە زۆر پیرۆزە لای کورد و خەڵك بەڕێزەوە ناوی باو باپیران و بنەماڵەکەیان دەبەن و لە پێش چاوی خەڵکدا زۆر پیرۆزن.

لە ڕاپۆرتی وەزارەتی ناوخۆی تورکیا لە بەرواری *1925/11/26* مەجلیسی تورکیا رایگەیاند، کە شێخ سەعید خۆی بە میراتگر و جێ نشینی پێغەمبەر عەلی و مەهدی ڕاگەیاندووە، ئەم لایەنگری کردنە لە پێغەمبەری شیعەکان، واتە عەلی، جگە لە هەوڵ و خەباتی جیا خوازانەی نەتەوایەتی کوردەکان بۆ ئەوەیە کە تورکەکان زۆر پێیان ناخۆشە. بوونی ئەم گروپە ئایینیانە لە ناو ڕاپەڕیوەکاندا کە دژ بە ئورتودەکسالی ئیسلامن لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ کە دەیانگوت گوایا کوردەکان دەیانەوێ دەسەڵاتی شەریعەت و خەلیفە بگەڕێننەوە.

سەبارەت بە باری ئابووری لە ویلایەتە ڕاپەڕیوەکاندا، پێویستە بگوترێت کە تیپی جۆراو جۆری بەرهەم هێنان و خاوەن موڵکیەتی هەیە لە پیشەسازییەوە بگرە /لە ناوچە ئارگان (کانی مس)، لە ئیلجە کانی خوێ،/ تا شوانداری و ئاژەڵداری. لە ناوەندی ناوچەی ڕاپەڕیندا، وەك ویلایەتەکانی گەنج، ئیلجە، پالوو، کیگی، وارتا، سیلڤان،

ئاژەڵداری و کشتوکاڵ ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە، لە باشوور و ڕۆژئاوای ناوچەکەدا وەك ویلایەتەکانی دیاربەکر و ئارگان پیشەسازیی سەرەتایی لێیە، لە کانەکانی ئارگان چەند هەزار کرێکار کاردەکەن لە دیاربەکریش چەند فابریکەی قوماش و چەند کارگەی فەرش دروستکردن و پێست و ئاسنگەریی لێیە. لەم ناوچانەدا باخداری و شەراب دروستکردن پێشکەوتووە. لە چەند شوێنی ناوچەی ئیلجەدا دانیشتوان خەریکی دەرهێنانی خوێن کە بە زۆری هەیە لەوێدا. دانیشتوانی شارەکان جگە لە مووچە خۆری دەوڵەتی خەریکی پیشەسازی دەستین لە ماڵاندا، لەسەر کاسبکاری ئەم ناوچەیە ئەوەندە بەسە چاوێك بخشێنین بەسەرچاوە دەوڵەتییەکانی تورکیادا، لەو سەرچاوانەدا هاتووە کە شاری (مەئمورییە ئەلعەزیز) واتە خارپووت کە دانیشتوانی دە هەزار کەسە بریتین لە (*1625*) خێزان و (*1100*) دووکان. دانیشتوانی شار لە چاو گوند نشینەکاندا کەمن و دەکرێ بڵێین کە وشەی شارنشین شتێکی زارەکییە، لە ناوەندی راپەڕین لەویلایەتی گەنج کە دانیشتوانی (*3500*) نەفەرە، شارۆچکەی (گەرپیك) بە پەنجا ماڵەوە (*250*) نەفەرە لەگەڵ دە دووکان.

پیشەی سەرەکی و گرنگ لە ناوچەی راپەڕیندا، ئاژەڵدارییە، ناردنی ئاژەڵ بۆ وڵاتانی تر کە لە ڕێگای دەریای سپییەوە دەگاتە بیروت، کەنداوی فارسی، ئەسکەندریە، بە پێی سەر ژمێری ڕەسمی دەوڵەتی تورکیا، لە ساڵی *1923*دا بەم چەشنەیە:

| ویلایەتەکان | مەڕ | بزن | شاخدار | هێستر | کەر | ئەسپ | حوشتر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مأموريه العزيز | *193341* | - | *152680* | *7000* | *6000* | *53000* | *56000* |
| ئەر زینداك | *40896* | *105* | *13523* | *242* | *2014* | *688* | - |
| دیاربەکر | *806060* | *170* | *38442* | *883* | *3618* | *1066* | - |
| ئەرگان | *93324* | - | *61145* | *140* | - | *516* | - |
| مووش | *10944* | *58* | *6198* | *1000* | *1250* | *1003* | *31* |
| گەنج | *89018* | - | *16928* | *26* | *17* | *436* | - |
| بتیلیس | *14295* | - | *5703* | *360* | *105* | *205* | - |
| | *1247878* | *333* | *294619* | *9651* | *14004* | *56914* | *56031* |

بەچاوخشاندنێك بەم خشتەیەدا دەردەكەوێت كە فاكتی گەورەی بەرهەم هێنان لەم ناوچانەدا ئاژەڵدارییە و كوردەكان بە زۆری خەریكی ئەم ئیش و كارەن و كشت و كاڵ بە پلەی دووهەم دێت.

## ئەنجامەكان

*1* -بارودۆخی جوگرافیایی ناوچەی راپەڕین بۆ بەرەنگاری و رووبەڕووبوونەوە زۆر لە بارە. زنجیرە چیاكانی ئانتی – تاڤر بە درێژایی رووباری فورات لە گەنجەوە تا پالوو هێڵێكی سروشتی پتەوەو پارێزگاری كردن لە خۆیان تەنیا لە باكووردایە و لێرە هیچ چەشنە چالاكییەكی سوپای تورك دژی كوردەكان جێبەجێ ناكرێت و سەرناكەوێت، لە لای ڕۆژئاواشەوە سنوورێكی سروشتی وا بۆ ناوچەكە دروست بووە. واتە جگە لە زنجیرە چیاكانی باشووری گولی گەلجێك تا دەگاتە باشوور و لەوێشەوە تا رووباری فورات. لەم لایەوە تەنیا یە ك ڕێگا هەیە، واتە لە باكووری گۆلی گەلجیكەوە كە خارپوت دەبەستێت بە ئەرگانەوە كە لەوانەیە چالاكی سوپایی تیا رووبدات، لە لای ڕۆژ هەڵاتی ناوچەی ڕاپەڕینەكەوە كێوەكانی شارزان داخ كە لە مووشەوە تا میافاركین، سیلواژ، درێژەیان هەیە و پێكەوە بە درێژایی رووباری كەلب سوو، ئەم بەرەیان پاراستووە ناوچە شاخاوییەكان و هەروەها رووبارەكانی ناوجەرگەی ناوچەكە بۆ شەڕی بچووك بچووك و هەروەها بۆ شەڕی بەرەنگاری بۆ شۆرشگێڕەكان زۆر لە بارە.

هەڵبژاردنی ئەو ناوچەیە بۆ دەستپێكردنی ڕاپەڕین ئەوەندە لەبار بووە لە باری جوگر افییەوە، هەروا بە ڕێكەوت نەبوەو وا دەردەكەوێ كە لە لایەن پسپۆرانی كاروباری سەربازییەوە دەستنیشان كرا بێت.

*2* -لە باری ئاوو هەوایشەوە ناوچەكە بۆ چالاكی سەربازی دەوڵەتی زۆر لە بار نییە بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا.

*3*-لە باری ئەتنوگرافییەوە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەكە كوردن.

*4* -تێكەڵاوی دانیشتوان لە باری ئایینییەوە ڕەنگاوڕەنگە، لە ناوچەكەدا ژمارەیەكی زۆر قزلباش، یەزیدی، نەقشبەندی هەیە كە بەرهەڵستی موسوڵمانە

ئورتودەکسالییەکان دەکەن. سیکتی هەرە گەورەی ئاییینی کە زۆر چالاکانە بەشداری ڕاپەڕینەکە دەکەن قزلباش و نەقشبەندییەکانن. هۆز و خێڵە شەڕ کەر و ئازاکانی کورد وەك گەنج، پالوو، چاپوجور، وارتا، کولپ لە ناوەندی گرنگی ناوچەی ڕاپەڕینەکە دەژین.

لە باری خواردەمەنی و کەلوپەلەوە ناوچەکە دەتوانێت بۆ ماوەیەکی زۆر پێویستی ڕاپەڕیوەکان بە دەست پێگرتنەوە دابین بکات.

## هۆکان و ناوەڕۆکی ڕاپەڕینی کوردەکان
## ڕەخنە و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە چەند بۆ چوونێك لەسەر ڕاپەڕینەکە

لەسەر هۆکان و ناوەڕۆکی ئەم ڕاپەڕینە هەم لە چاپەمەنییەکانی تورکیا و هەم هی دەرەوە بۆ چوون و تێڕوانینی یەکجار دژ بە یەکتری هەیە. بێگومان ئەم کێشەیە زۆر ئاڵۆزەو لێرەدا زۆر زەحمەتە بگەیتە ڕاستییەکەی، چونکە ئەم کێشەیە بە گوێرەی گرنگییەکەی لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە، بەڵکو تەنیا بۆ چوونی هەندێ سیاسی نەبێ کە زانستییانە نییە، هەروەها هەندێ لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵات ناس و کورد ناسەکان کە بە پێی بەر ژەوەندی وڵاتەکانیان لە مەسەلەکەیان کۆڵیوەتەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت یەك شت ئاشکرایە ئەویش ئەوەیە کە ڕاپەڕینی کوردەکان لە شەش ویلایەتی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا و بە دانیشتوانێکی یەکجار زۆرەوە کە تا دەهەزار نەفەری ئازا و شەرکەریان چەکدار کردووە و ڕێکیان خستووە مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە کە لە خەباتکردنی نەتەوەیەکدا بۆ بە دەست هێنانی مافەکانی خۆی بەرجەستە دەبێت.

هەوڵدانی چەند ڕۆژنامەیەکی تورکی بۆ بەدناوکردنی ڕاپەڕینەکە و دانانی بە کاری چەند چەتە و ڕێگرێك نەچوە سەر بۆیان و سەری نەگرت. ڕۆژنامەی هەرە گرنگی کوستانتینەپول بە ناوی تەنین کە بە زمانی فەرەنسی دەردەچێت لە بەرواری *1925/11/25* دا نووسیویەتی: ڕاست نییە کە بڵێین ئەمە تەنیا ڕێگرتنی چەتەکانەو

بەس."، ڕۆژنامەکە لە درێژەی نووسینەکەیدا بۆ ئەوەی کە بوونی ناسیونالیزمی کوردی و کورد وەك گەلێك کە بە تەواوی لە تورك جیاوازە ئینکار بکات، بۆ گومڕا کردنی خەڵك، ئەم بۆچوونە نازانستییانە دەخاتە ڕوو و دەڵێ: زۆر زەحمەتە بزووتنەوەیەکی ناسیونالیستی لە دانیشتوانی دواکەوتوو و تاریکی چیاکان کەنیوە کۆچەرین و لە قۆناغی خێڵایەتیدا دەژین و سەر بە شێخی خۆیانن سەر هەڵبدا و لە پێش چاوبگیرێت". پاشان حوسەین جاهید سەر نووسەری ڕۆژنامەکە هەوڵ دەدات ئەوەنیشان بدات کە ئەو ڕاپەڕینە لەبەر دوا کەوتووی و نەزانی فاناتیزمێکی قووڵە بۆ سەردەمی ئێستا ڕاپەڕینەکەو دروشمە پوچەڵە سیاسییەکانی دیارە بە کوێ دەگات.

بۆچوونی دووهەم لەسەر ڕاپەڕینەکە ئەوەیە کە هۆکانی سەرەکی ئەم ڕاپەڕینە لایەنی ئایینی‌یە، دوا کەوتووی جوتیارەکان ئەو هەلەی رەخساندووە بۆ شێخەکان کە رابەرایەتییان بکەن بۆ گەراندنەوەی شەریعەت و سیستمی خەلافەت و دژی دەوڵەتی ئەنکەرە شەڕ بکەن. بۆ پاڵپشتی ئەم قسانەشیان هەندێ فاکت دێننەوەو دەڵێن: ڕاپەڕینەکە لە لایەن شێخەکانەوە ڕێبەرایەتی دەکرێت و دروشمی کۆنە پەرستانەیان هەڵگرتووە، وایش بڵاوە کە بنەماڵەی لە دەسەڵات کەوتووی خەلیفە بەشداری ئەم ڕاپەڕینە دەکەن و...هتد.

ئەم بۆچوونە بە تەواوی ڕاست نییە. لایەنە کۆنەپەرستییەکەی ناو ئەو بزوتنەوەیە، هەندێ هۆی خۆی هەیە، پێش هەر شتێك ئەم بزووتنەوەیە تەنیا لە لایەن شێخەکانەوە ڕێبەرایەتی ناکرێت، بەڵکو چەند کەس و لایەنی تر ڕێبەرایەتی دەکەن وەك کومیتەی کوردی و پالکوڤنیك خالیدبەگ سەرۆکی کومیتەی کوردی ئەرزرۆم، زیا بەگ، ئەندامی ئەنجومەنی تورکیا لە خولی یەکەمدا و کەسانی دیکە. سەبارەت بە بەشداری کردنی بنەماڵەی خەلیفە لە بزووتنەوەکە ئەمە هەر قسەی رووتە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەرنییە. وەزیری ناوخۆی تورکیا لە وتووێژێکدا ڕایگەیاند کە دەوڵەت هیچ بەڵگەیا هەواڵێکی لەسەر بەشداریکردنی کوڕەکانی عەبدولحەمید لەو ڕاپەڕینەدا بە دەستەوە نییە.

له باری دروشمی کۆنەپەرستانەشەوە دەڵێین خەبات بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی شەریعەت و سوڵتان دروشمی سەرەکی نین و لە پلەی دووهەمدان لە چاو دروشمە سەرەکییەکەدا کە خەبات کردنە بۆ سەربەخۆیی کوردستان بۆ دروشمی وەها ئابستراك وەك دەسەڵاتی شەریعەت و خەلافەت زۆر زەحمەتە ڕاپەڕیوەکان بە باوەڕەوە خەبات و شەڕیان کردبا، بە تایبەت کە دوورن لە ئورتوکسانییەوە، چونکە لەو ڕاپەڕینەدا هۆزە کوردەکانی سەر بە ڕێبازی ئایینی قزلباش، زازا، یەزیدی و.. هتد بە زۆری بەشدارییان کردووە، دیارە ئەم ڕێبازە ئایینییانەش لە ئایدۆلۆژی خۆیان زیاتر شتی مەسیحییەتیان تێدایە تا موسوڵمانیەتی و لە دژایەتی ئیسلامییەتیشدان.

مێژووی هەموو بزووتنەوەکانی کورد دەری خستووە کە کوردەکان هەمیشە دژی سوڵتان و کاربەدەستانی خەباتیان کردووە و بە درێژایی سەدەکان دەسەڵاتدارانی سوڵتان بە مەبەستی کوشتنی ڕێبەرانی کورد دوایان کەوتوون و یا دووریان خستوونەتەوەو لە زیندانەکانیان ئاخنیون و تەنانەت لە ناویشیان بردوون، مێژووی کورد و ئیدەئالی نەتەوەیی واتە سەربەخۆیی کوردستان بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەوە کە گوایا کوردەکان بۆ گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەت خەبات دەکەن.

گەڕانەوەی تیئوکراتێکی سوڵتان بە مانای زیندووکردنەوەی دەوڵەتی بیروکراتی و سینترالییە کە تەنیا دانی بە بوونی هەندێ ئەتنیکی دا ناوە لە باری نەتەوەییەوە سەربە ئایینەکانی ترن. بەڵام ئەو کەمایەتییە نەتەوەییانەی کە موسوڵمانن وەك عەرەب و کورد و لاز و ئەڵبانی و هیتر دەسەڵاتدارییەتی سوڵتان هیچ کاتێك باسی نەکردوون و ئەگەر باسیشی کردبن مەبەستی دەوڵەتی سوڵتان ئەوە بووە کە ئایینەکەیان لەگەڵ ناسیونالییەتیان بەیەك شت دابنێت و هەمیشە وای نیشان داوە کە تەواوی گێرەو کێشە و تێکهەڵچوون لە ناوبراکاندا چارەسەر دەکرێت بۆیە کوردەکان زۆر بە باشی دەزانن کە گەڕانەوەی دەسەڵاتدارییەتی سوڵتان لەناوچوونی تەواوی ئەو پلانانەیە کە بۆ رزگاری نەتەوەیی کورد دانراوە.

هەبوونی هەندێ دروشم سەبارەت بە خەلیفە لە ناو دروشمەکانی بزووتنەوەدا لە باری تاکتیکییەوە بۆ کوردەکان زۆر گرنگە و لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجە

نەتەوایەتییەکان، یاخود بزووتنەوەی نەتەوایەتی خۆیان ناوی خەلیفە تێهەڵکێش دەکەن، مەبەستی کوردەکان لەم بارەوە ئەوەیە دانیشتوانی تورکیاش بەلای خۆیاندا رابکێشن و بیانهێننە گۆڕەپانی خەباتەکەیانەوە داپۆشینی ئایدۆلۆژی ناسیونالیستی بە بەرزکردنەوەی دروشمی خەلافەت لە لایەن کوردەکانەوە دەبێتە هۆی راکێشانی هەست و سۆزی هیندی دەرەبەگ و توێژی جوتیارانی ئەو ولاتە بەرەو لای ئەو راپەڕینە، دروشمی کۆنەپەرستی فیئودالانە لە ناو بزووتنەوەی کوردی تەنیا تاکتیکیکە و مانۆڕێکی سیاسییە و کاتی و هێنراوەیە و ئامانج نییە. دارو دەستەی کۆنەپەرستی بلوکی پارتی کۆماری – پێشکەوتن (جمهوری - تەرەقی) وەك (کازم قەرە بەکر پاشا)ی سەرکردەیان لە مێژە لە لایەن راپەڕیوەکانەوە سەر شۆڕ کراوەو قاودراون.

جگە لەوە پێویستە ئەوەش بزانرێت کە لە ولاتانی دوا کەوتوودا کە هێشتا ریزبەندی چینایەتی بە تەواوی دەرنەکەوتووە تەواوی بزووتنەوە نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتییەکان جلی ئایینییانەو تەسەوفیان لەبەر کراوەو دەکرێ کە بە کۆنەپەرستی ناویان ببرێ کە شتێکی فەرزی یا مەرجییە. بەڵام شۆرشگێڕایەتی ئەو بزووتنەوانە هیچ قسەی لەسەر نییە.

سەرکردەی جوتیارانی ئەڵمان (فوماميونتسر) کە راپەڕینی جوتیارانی دژی فیئودال و کنیازەکان رێك خست خۆی بە "خوای شەڕ بە شمشێری گیودوئون دەزانی". رێبەرانی نەتەوەیی هیندییەکان زیاتر لە شەڕە پووشە پێغەمبەرەکان دەچن و جێ کرنووشی ئازار دراوەکانن و زیاتر بۆ بیرو باوەڕی نەتەوایەتییەتا شەڕکەری. ماتسینی و گاریبالدی کە چەك بە دەست خەباتیان بۆ یەکگرتنی ئیتالیا کردبوو. لە موسوڵمانیەتی ئایدەلۆژی (مەهدیزم) کە ناوەڕۆکەکەی بەم چەشنەیە لە ناو موسوڵماناندا باوەڕیان بەوە هەیە کە دەبێ ئیمام مەهدی جارێکی دی بێتە دونیاوە، واتە ئەو کەسەی کە لە هەژاری و کوێرەوەری رزگاریان دەکات و دەیان گەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی بەختەوەری موحەمەد و چوار ئیمامی یەکەم. ئەم ئایدیولۆژییە بۆ یەکەمجار نییە کە دەبێتە دروشمی بزووتنەوەی گەلانی موسوڵمان. لە مێژووی موسوڵماناندا زۆر جار رێکەوتووە کە رابەری وایان هەبوە کە خۆی بە ئیمامی مەهدی

دانـاوه. بۆیـه ڕێکـەوت نییـه کـه سـەرکردەی ڕاپـەڕینی ئـەمڕۆی کـوردان شـێخ سـەعید ڕێبەری سیکتی ئایینی واته نازناوی (ئەمیر المجاهدین)ی وەرگرتووه یا پێی دراوه.

بـەم چەشـنه ئـەم چەمکـه کۆنەپەرسـت و ئایینییانـه دەبـێ وەك نمـای ڕۆڵێکـی سـەرەکی و چـارەنووس سـازی بزووتنەوەکـه سـەیر بکرێـن. هـەر چۆنێـك بێـت هـەر کوردەکـان خـەبات دەکـەن نـەك تورکـەکان، ئەگـەر ئـەم بزوتنەوەیـه بـەس لایـەنی کۆنەپەرستانەو چینایەتی هەبوایا (به تورکیاشەوە) تەنیا خەباتی نەتەوەی کوردی نـه دەگرتەوە.

ئـەم هـەموو فاکتـه ئـەوە دەگەیـەنن کـه ئایدۆلۆژیـای ئـایینی - خەلیفـەیی ڕاپەڕیوەکان تەنیا تاکتیکێکه بۆ مەبەستی سیاسی و نەتەوایـەتی خۆیـان. ئـەو فاکتـەی کـه ژمارەیـەك گروپـی کۆنەپەرست دەسـتیان بـه پڕوپاگـانده دژی دەوڵـەتی ئەنکـەره کـردووه و چالاکی دەنوێنـن نابێتـه بەڵگه لەسـەر ئـەوە کـه بگوترێـت ئـەم ڕاپەڕینـه ناوەرۆکەکـەی کۆنەپەرسـتانەیە. لەبـەر ئـەوە بـەکارهێنانی شـتی وا هەمیشـه لـه لایـەن هـێزه بەرهەڵسـتکارەکانەوە لـه خـەباتیاندا، بـۆ تەنگـەتاوکردنی هەمەلایەنـەی دەوڵـەت کەڵکی لـێ وەردەگیرێ و بـه پێچەوانـەوە دەوڵـەتیش ئـەو تاکتیکـه بـەکاردێنێ. دەوڵـەت بەهەڵبەسـتنی درۆو دەلەسـه و ئـاوەژو کردنـی ڕاسـتییەکان دەیـەوێت بـەم چەشـنه بەرهەڵستکاران له ناو بەرێت.

هــەراو هۆریــای چاپەمەنییــەکانی تورکیــاش ســەبارەت بــه کۆنەپەرســتی ڕاپەڕینەکه کە کـەمتر قەناعـەت بەخشـن و جێـی بـاوەڕ نـین لـه هـەموو لایەکـەوە، بـه هەموو شێوەیەك بۆ لەبەرچاو خستنی بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکه بـەکاریان دێنـن و ئەمـه شتێکی سروشتییه لەبەر ئەوە تورکەکان له کێشەی کورد نه گەیشتوون، هیـچ شـتێکیان بۆ نەماوەتەوە جگه له بوختان هەڵبەستن بۆ بزووتنەوە کە لە پێش چاوی خەڵکەکـه بەدناوی بکەن و چەند ناو و ناتۆرەی لـێ بنێن وەك ڕێگریی، کۆنەپەرسـتی و سـیخوڕی بێگانەو ... هتد.

بۆچوونی سێهەم ئەوەیـه کـه ڕاپەڕینەکـه بـه فیتـی ئینگلیزەکانـه و بـه هـاندان و پشـتگیری ئـەوان بـووە. لەوانەیـه ئـەم بۆچوونـه سـەرنج ڕاکێـش بێـت، بـەڵام تـا ئێسـتا

بەڵگەیەکی ڕوون نییە لەسەر ڕاستی ئەم بۆچوونە، دەست بەسەراگرتنی چەك یا دراوی بێگانە، نیشانەی ئەوە نییە کە بێگانەکان بێ چەنوچوون بەشدارن لە ڕاپەڕینەکەدا، چونکە کوردستان کەوتووەتە سەر سنووری چوار دەوڵەت و پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ بەندەرەکانی دەریای مەدیترانەو کەنداوی فارس هەیە و هەمیشە چەك و پارەی وڵاتانی تری پێگەیشتووە، تا ئێستا ئەم بۆ چوونە هەر تەنیا پشتی بەستووە بە وشەگەلی گوایا، دەڵێن، پێیان وایە و شتی تری لەم جۆرانە.

سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکە هاوکات لەگەڵ هاتنی کومیسیونی موسڵ دەکرێ بە ڕێکەوت بوو بێت. چاپەمەنییەکانی تورکیا لە سەر بەشداریکردنی بێگانەکان زۆر ئاگادارانە و نەرم دەیاننوسی، هەروەها چەند نوێنەری مەجلیسیش، ئەم بۆچوونەیان بە درۆ خستووەتەوە، روشدی پاشا نوێنەری ئەرز ڕۆم لە مەجلیسی تورکیا، ڕۆژی *2/25* لە وتووێژێکدا ڕایگەیاند: ئەو بۆ چوونەی کە دەڵێ بێگانەکان دەستیان هەیە لە ڕاپەڕینەکەداو بە فیتی ئەوان بووە، پێم وا نییە بە تەواوی ڕاست بێت، چونکە موش و گەنج زۆر لە سنوورەوە دوورن، ئەگەر ڕاپەڕین بە یارمەتی دەرەوە بوایە، لە ناوچەکانی سەر سنوورەوە دەستیان پێدەکرد و لەوێوە دەیانتوانی لەگەڵ خێڵ و هۆزەکان یەك بگرن کە لەوێ دەسەڵاتی دەوڵەتی تورکیاشیان لێ نییە. (ئەستەنبول *3/26*).

بێگومان ئەگەر ئەم ڕاپەڕینە بە تەواوی ئیش و کاری ئینگلیزەکان بوایە زۆر باشتر و پێویست تر بوو کە ڕاپەڕینەکەیان لەو ناوچانەوە دەست پێ بکردایە کە شەڕکەری ئازای لێیە و نزیکە لە سنوورەوە نەك لە گەنجەوە کە دوورە لە پێگەکانی ئینگلیس لە عێراقدا. دیارە ڕاستییەك هەیە کە دەکرێ یەك یا چەند سەرکردەی کورد بکڕدرێت، بەڵام ناتوانرێ نیو ملیون خەڵکی دانیشتووی شەش ویلایەتی ڕاپەڕیو بکڕدرێت. هەوڵدان بۆ نیشاندانی ئەوەی کە ڕاپەڕینەکە هەمووی بە دەستی ئینگلیزەکان بووە شتێکی سەرکەوتوو نییە، ئەگەر هەندێ جار پیاوەکانی ئینگلیس کوردەکان دەکڕن، دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە بۆچی کوردەکان خۆیان دەفرۆشن، وا دیارە ئەم ڕاپەڕینە "ئاو ئەڕژێنێتە" ئاشی ئیمپریالیزمی ئینگلیزەوە.

گومان لەوە دانییە کە ئیمپریالیستەکانی ئینگلیز راستەوخۆ یا لاوەکی پشتیوانی مەعنەوی (لەوانەشە مادیشیان بکەن). بەلاّم ئەمە مانای ئەوە نییە کە بتوانین بە تەواوی بلێین راپەڕینەکە لەسەرەتاوە تا کۆتایی بە دەستی ئینگلیسەکان رێکخراوە.

بە داخەوە ناوەندمان (واتە موسکو/ وەرگێر)، بە پێی ئەو هەوالانەی کە بە تەواوی هەموویان راست نین و بە پێی ئەو جۆرە بۆچوونانە دەروانێتە کێشەکە و راپەڕینەکە بە کۆنەپەرستانە و بەرهەمی دەست و ئاژاوەی ئینگلیزەکانە بروانە وتاری پراڤدا ڕۆژی *1925/3/4*.

پڕ و پاگەندەی ئەم بۆ چوونە لە چاپەمەنییە ڕەسمییەکانی ئێمەدا، باسی یەك لایەنە ڕوانینیشی ناکرێت، لەوانەیە ئێمە بەشێوەیەکی تەواو لە ناو کوردەکاندا لەبەرچاو بخات کە بەشێکیان لە خەباتدان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی خۆیان و هیوایەکی زۆریان بە یەکیەتی سۆڤێت هەیە.

راپەرینی کوردەکان ڕەنگدانەوەی خەباتی نەتەوەییانە بۆ سەربەخۆیی ولاتەکەیان و ئەنجامی چەوسانەوەی ئابووری و سیاسی و بەرێوەبەرایەتییە لە لایەن دەسەلاتدارانی تورکەوە.

## هۆ ئابوورییەکان

ئاژەڵداری هۆی گوزەران و پیشەی سەرەکی کوردەکانە لە ناوچەی راپەڕینەکەدا ئاژەڵ شتی سەرەکییە بۆ ئاڵوگۆڕ کردن لەگەڵ پێداویستییەکانی تردا، ئاژەڵ وەك لە لاپەرەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد بەرهەمی سەرەکییانە و لەبەر زۆری لەناو بازارەکانی تورکیادا نایەتە فرۆشتن، سەرنجی تایبەتی خۆم کە بازارەکانی ئانکارام بینیوە، دەزانم کە لە مانگی کانوونی دووهەمدا گۆشتی مەڕ بە دە لیرە بوو، کەرێك بە چل لیرەو ئەسپ بە هەشتا لیرە و مانگا سیو پێنج لیرە بوو. ئەگەر ئەوە بزانین کە لیرەی کاغەزی ئەمرۆی تورکیا کە نزیکەی نیو دۆلارە بۆمان دەرئەکەوێت کە تەنانەت لەناوچەیەکی وەك ئانکارا کە بەستراوە بە هێڵی شەمەندەفەرەوە نرخی ئاژەڵ زۆر لە خوارەوەیە.

ئـەوەی کـە پـەیوەندی بـە ناوچـەکانی ڕاپـەڕینــەوە هەیــە، ئەوەیــە کــە زنجـیرەی کێوەکـان هـەم دوور و هـەم جیایـان کردووەتــەوە لەبــەر نــەبوونی نــەك تــەنیا هێڵــی شەمەنەفەر بەڵکو ڕێگای خاکی ئاسـایی و ئوتومبیلیشـی لـێ نییـە کـە بـە ناوەندەکـانی ئیکسپورتەوە بەسترابێتەوە، بێگومان لەو ناوچانەدا کەساسی و کوێرەوەری باڵی کێشاوە بەسەر خەڵکەکەدا و ئاژەڵدارانی کورد لە خنکاندن دان. تەواوی لێکۆڵەرەوە جوگرافی و ئابوورییەکان یەك دەنگ رائەگەیەنن کـە ویلایەتـە کوردییـەکان لـە بـاری ئابوورییـەوە هەمیشـە بـە بـەندەرەکانی کــەنداوی فارسـیـیەوە بەسـتراونەتەوە ئـەویش لـە ڕێگـای دیجلە و فورات و دەریای مەدیترانەوە بە ڕێگای ئەلکساندرە پول و ئالپوو وە، ئێسـتا بـە هـۆی ئـەو هەڵچوونــە یــەك لــە دوای یەکانــەو لەبــەر ئــەوەی هــەندێ جــار شــەڕ لەســەر ســنوورەکانی عـێراق -میزوپوتامیـا و سـوریا ڕوو دەدەن ئـەم بەندەرانــە بــە تــەواوی داخــراون بــە ڕوی کوردەکـاندا بــۆ فرۆشــتنی بەرهــەم و شــتومەکەکانیان. هــەر لەبــەر ئــەو هۆیانـــە ویلایەتــەکانی ڕۆژهــەڵاتیش وەك ئــەرز ڕۆم و فــارس و ئـەردەگان و ئـەوانی تریــش کــە پەیوەندییــەکی زۆر نزیکـی ئابووریـیـان بەقــەوقاز و بازاڕەکـانی تـری ڕوسـیاوە هـەبوە تووشـی نەهامـەتی بــوون و بەرهەمــەکانیان بۆهیــچ کــوێ نـــاڕوات و ناوچەکانیشـــیان گەشـــەیان پـــێ نـــاکرێت و لەویلایەتــــەکانی ڕۆژهــەڵات ســەرهەڵدانی جــۆراو جــۆری وەك پــان ئیسـلامیزم و پــان تورکــیزم و ڕاپەڕینــەکانی تــری سیپارانیسـتی پــێ دەگــرن و دژی ئــەوەن ســنووره دەســـکردەکان کـە ئـابووری و بازرگـانی ئـەم ویلایەتانـەیان گوشـیوە تێکبـدەن تـا بگەنــە گۆڕەپــانێکی بـــەرین بـــۆ ئـــــەوەی بتوانـــن بەرهەمـــە زیادەکانیـــان بفرۆشـــن، ئـــایدۆلۆژی دروستکردنی کوردستانێکی سـەربەخۆیش هـەر لەسـەر ئـەم زەمینـە ئابوورییـە پـەرەی ســەندووەو دەســـەنێت. دروســـتکردنی کوردســـتانی مـــەزن و ســـەربەخۆ لەگـــەڵ داخوازی ئابووری کوردستان یەك دەگرێتــەوە، لەبـەر ئـەوە بەدروسـتبوونی کوردسـتانی مـــەزن کوردەکــان ئــەو ســـنوورانە تێکدەشـــکێنن کــە لـــە نـــاوەندە گـــەورەکانی بازرگانیناوچەکە و جیهان دووری خستوونەتەوەو کوردیـان بـە برسـیەتی و نـەداری و ژیانی کولەمەرگی هێشتووەتەوە.

پڕو پاگەندەی ئینگلیزەکان لەناو کوردەکاندا بە ئاسانی بەڕێوە دەچێت. لە بەر ئەوە هەوڵ ئەدەن کوردستان بەرەو یەکگرتن لەگەڵ عێراق راکێشن و دەیانەوێت لەباری سیاسییەوە پاشکۆی کوردستانی باشووری ژێر دەستی خۆیان بێت و لە باری ئابووریشەوە، ئابووری کوردەکانی تورکیا لەگەڵ بەندەرەکانی باشوور ببەسترێتەوە دەبێ ئەوەش بزانرێت کە شێخ سەعیدی رابەری راپەڕین و بزووتنەوەی ئەمڕۆ خاوەنی دوو هەزار پەز و مەڕە.

فاکتەری دووهەمی ئابووری کە بووەتە هۆی بزووتنەوە جیاخوازییەکەی ئەمڕۆ فاقە (مەنگەنە)ی مالیات و باج و بەرتیلی هەمەجۆرە کە دانیشتوانی تورکیا زیاتر لە وڵاتانی تری جیهان بە دەستیەوە دەناڵێنن، چەند مانگ لەمەوبەر مەجلیسی تورکیا یاسای سەدەکانی ناوەڕاستی مالیاتی (عوشر - دەیەك)ی گۆڕیوە بەڵام لە بەرامبەردا بەرتیل وەرگرتنی کاربەدەستانی تورکیا زیاتر بووە کە زۆر لە دەیەکەکەی جاران زیاترە، بەم چەشنە ئەو کەم کردنەی بودجەی ساڵانەی دەوڵەت کە (*35*) ملیۆنە بە وەرگرتنی باج و سەرانەی تر لە خەڵك پڕ دەکرێتەوە. لە جیاتی یاسای (عوشر - دەیەك)ی جاران، یاسایەکی تریان داناوە لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵ کە لە (*10٪*)ی نرخی ئەو شتومەك و بەرهەمەیە کاتێك لە بازاڕدا دەفرۆشرێت، جوتیارەکان لەم سیستمەشدا لە کاتی فرۆشتنی بەرهەمەکانیاندا دەکەونە بەر گوشار و رووتکردنەوەو کڵاو لەسەرنان و چەوسانەوە لە لایەن مووچە خۆرانی بەد رەفتار و چەپەڵ و بەرتیل خۆری دەوڵەتەوە.

هەندێ بیروڕای وایش هەیە لای هەندێ کەس کە گوایا گۆڕینی (عوشر) بووەتە سیگناڵی راپەڕینی دەرەبەگ و شێخەکان کە گوایا بەرژەوەندییان لە پاراستن و هێشتنەوەی دەیەکەکەی پێشوودایە، ئەم بۆ چوونە زۆر راست نییە، هەروەها ئەو بۆچوونەش کە گویا بەگ و ئاغاکانی کورد هاووڵاتییانی خۆیان بەبێ سنوور و بێ چەند و چوون ئەچەوسێننەوە راست نییە. نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە بەگە کوردەکان رێکخەر و پارێزەری کۆمەڵگای خۆیانن و زۆر پەیوەندی خزمایەتییان پێکەوە هەیە و بەیەکەوە بەستراون. ڕۆڵی

ڕێکخستنی بەگی کورد کە هاوکات گەورەی خێڵ و هۆزەکەی خۆیەتی تا ئێستا باوەو دەوری خۆی لە دەست نەداوە زۆر لە لێکۆڵەرەکانی کۆمەڵگای ئەمرۆی کوردستان لایان وایە کە پەیوەندی نێوان شێخ و بەگی کورد و هاوڵاتییانیان پەیوەندییەکی (پاتریارك)یيە کە لەسەر پرەنسیپی هاوکاری بەرامبەر بە یەك پێکهاتووە، واتە ئەرکی بەرهەم هێنان لەسەر هەردوو لایە، زۆر جار شێخی کورد یا ئاغا شوان یا ئاژەڵداری گەورەیە و لە لایەن هۆز و خێڵەکەی خۆیەوە ڕێزی زۆریان لێدەگیرێت، چونکە لە باری بەرهەم هێنانەوە ئەزموونی زۆری هەیە، واتە یاساکانی کۆچەری، ڕێگاکان، کات و شوێنی هەوارگەکان و رەشماڵ و خێوەت هەڵدان، لەمانە هەموویاندا شارەزایی تەواوی هەیە و هەر لەبەر ئەوە ڕێزێکی زۆری لێدەگیرێت.

بەم چەشنە، هەڵبەستن یا دروستکردنی تیوری گرژبوونی خەباتی چینایەتی لە ناو کوردەکاندا و شیکردنەوەی ڕاپەڕینی ئێستای کوردەکان لەسەر ئەم بنەمایە، ئەنجامی تێنەگەیشتن یا نەزانینی پەیوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردستانەو هۆیەك لە ئارادا نییە بۆ چەوساندنەوەی ئاژەڵداری کورد لە لایەن دەرەبەگەکانەوە، لەسەر فیئودالیزمی کورد دەکرێ بڵێین ناولێنانی وا زیاتر رەمزی و مەرجیيە و بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ فیودالیزمی ئەوروپای سەدەکانی *16* و *17* بەراورد ناکرێ.

ئەوانەی کە باجی (عوشر - دەیەك) یان وەردەگرت زۆربەیان یۆنانی و ئەرمەنی بوون و لافاوی ڤین و بێزاری خەڵك هات بەسەریاندا و بە شوفینیزمی کەمالیزم گەرم بوونەوە. دەستەیەکی تریش لەوانە کۆلاکی تورك بوون واتە ئاغاکانی ویلایەتەکانی ناوەندی ئاناتولی و بە تایبەتی ئەوانەی ئانکارا کە بە راستی دژی لابردنی سیستمی (عوشر) بوون چونکە سەرچاوەی دەوڵەمەند بوونیان بوو.

نیگەرانی و بێزاری کوردەکان لەبەر ئەوە نەبوو کە مەجلیسی تورکیا ئەو سیستمی عوشرەی گۆڕیوە، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە ئەو باجەی لە باتی عوشر دانرابوو گرانتر و سەخت تر و زیاترە. لە کاتی کارپێکردنی سیستمی عوشردا زۆر لە خێڵ و هۆزە کۆچەرییەکانی کورد، دەسەڵاتداریەتی تورکیان نەدەناسی و دانیان پێدانەدەناو لە

کاتی کۆچکردنیان بۆ ناوچیا و کێوە سەختەکان هیچ عوشرێکیان نەدەدا و هیچ خزمەتێکیشیان نەدەکرد.

ئەو خێڵ و هۆزە کوردانەی کە هەندێك لە ئەندامەکانیان لە ڕیزی سوپای سوارە دا بوون بۆ هەر مەڕێك کە بەرخێکی بوو بێت پێنج (عانە)یان دەدا.

بە گوێرەی ئاگاداری شارەزای بەناوبانگ و کوردناسی گەورە (ڤ. ت. مایڤسکی) کوردەکان لە کاتی خەملاندن و دانانی ژمارەی ئاژەڵەکاندا ڕاستییان نەدەدا بە دەستەوە و ژمارەیەکی زۆر لە بەرهەمی ئاژەڵەکانیان کەم دەکردەوە و کارمەندانی دەوڵەتیش چاوپۆشییان لێدەکردن بەهۆی بەرتیل خواردنەوە، لەم بارەوە ئەم پسپۆرە خاوەن ئەزموونە دەڵێ: ئەو ژمارەیەی کە کوردەکان دەیاندا لەسەر ئاژەڵەکانیان ئەوەندە کەم بوو دەتوانین بڵێین هیچ کاتێك ڕاست نەبوە"

بەپێی زانیاری هەندێ کەس دەکرێ بگوترێت کە لە لایەن هۆز و خێڵە کوردەکانەوە ماوەی چەند ساڵێك عانەیەك نەهاتووەتە ناو خەزێنەی دەوڵەتەوە". ئێستاش لەبەر یاسای نوێ هەر ئەو کەسانە بەڵام ئەمجارە لەناو بازاڕەکاندا، ناتوانن بە هیچ شێوەیەك خۆیان دەرباز بکەن لە دانی (عوشر).

بەم چەشنە ئەگەر (عوشر - دەیەك) پێشتر کاریگەری هەبووبێ لەسەر خەباتی چینایەتی کوردان، ئێستا لە هەموو بارێکدا لەو ئاستەدا نییە، ئەگەر نا دەهاتە گۆڕێ و باس دەکرا.

بۆ ئەوەی شارەزاییەکمان هەبێ لەسەر سیستەمی باج و باڵیات لەو سەردەمەدا ئەوەندە بەسە چاوێك بخشێنین بەم خشتەیەدا و ئاگاداربین لە وەرگرتنی باج لەو کەرەستە و کەلوپەلە سەرەتاییانە کە پێداویستی ڕۆژانەی خەڵکن.

| كەرەستە | نرخ بە پیاستر | نرخ بە ئوکو | تێبینی |
|---|---|---|---|
| نەوتی سپی | *6* | *1* | *1*-ئوکو. پێوانەیەکی |
| شەکر | *15* | - | تورکیایە بۆ کێشانی |
| چای | *40* | - | قورسایی کە بەرامبەر |
| قاوە | *20* | - | نزیکەی سێ فرنتی |
| مۆم | *10* | - | ئێمەیە. |
| سابوون | *5* | - | *2*-پیاستر. |
| رۆن | *80* | - | بەرامبەرە بە یەك |
| برنج | *10* | - | کوبیك ی زێڕی رووسی. |

جگە لەم باجانە، لە کۆبوونەوەی مەجلیسی تورکیا رۆژی *1925/11/28* دا بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان داهات و خەرجیدا باجی تریان دانا بەم چەشنەی خوارەوە:

*1* -کاغەزی مارکداری مالیات پێنج کەرەت زیاد کرا.

*2* -خوێ لەسەر هەر کیلۆیەك دوو پیاستەر زیاد کرا و نرخی بوو بە *6* پیاستەر.

*3*-بۆ قوماشی لۆکە کە هەموو جوتیارانی تورکیا لەبەری دەکەن، بۆ کڕینیشی مالیاتیان داناوە.

جگە لە مانە باجێکی زۆریشیان خستووەتە سەر گەنم و بۆ بردنە دەرەوەی *36* لیرە بۆ هەر تەنێك دانراوە کە تەواوی (کەستانتینە پول) و ناوچە و بازاڕەکانی سەر ڕۆخ پێی دەژین، هەروەها بە پێی ڕاپۆرتی رەسمی کە ئاڕاستەی مەجلیسی تورکیا کراوە بۆ هەر یەك لە دانیشتووانی ئەم وڵاتە زەریبە و باجی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە هەشت تا چل پیاستەر یا *45* لیرەی تورکی بۆ هەر خێزانێك دیاری کراوە، کە داهاتی ناوەندی ساڵانەی هەندێکیان لە *120* تا *150* لیرە تێناپەڕێت. بەم چەشنە هەر مالیاتدەرێکی تورکی دەبێ *3/1*ی هەق دەست و داهاتی خۆی بەناوی مالیات و زەریبەوە بداتە دەوڵەت.

سیستەمی زەریبە وماڵیاتی تورکیا لە مێژە لەلایەن دەسەڵاتداریەتی سوڵتانەوە دانراوە، لەم خشتەیەی خوارەوە ڕێژەی داهات و خەرجی بۆ هەر نەفەرێك لە دانیشتوانی ناوچەی ڕاپەڕین بۆ ساڵی *1911-1912* خراوەتە روو کە لەلایەن دەوڵەتی سوڵتانەوە دیاری کراوە.

| داهات | خەرجی | داهات بۆ هەر نەفەرێك | خەرجی بۆ هەر نەفەرێك | ناوی ویلایەت |
|---|---|---|---|---|
| *242.100* | *200.900* | *٪59* | *٪49* | بیدلیس |
| *281.300* | *226.700* | *٪51* | *٪41* | دیاربەکر |
| *588.300* | *730.800* | *٪78* | *٪96* | ئەرز رۆم |
| *251.700* | *212.600* | *٪49* | *٪42* | خارپۆت |
| *138.900* | *302.100* | *٪45* | *٪98* | وان |

ئەم بەراوردکردنەی مالیات روونکردنەوە و شیکردنەوەی پێویست نییە ئەم ژمارانە بە ڕوونی بۆ خۆیان قسە دەکەن. هەروەها رەنگدانەوەی باری کۆمەڵایەتی و سیاسی ناوچەکەیە کە تا ئەمرۆ دانیشتوانی تورکیا بە دەستیەوە دەناڵێنن، هەر ئەمانەش نین کە بوونەتە هۆی ئابووری بۆ راپەڕینەکانی کوردەکان بە گشتی و راپەڕینەکەی ئەمڕۆیان بە تایبەتی.

## چەوساندنەوەی دانیشتووان لە لایەن بەڕێوەبەرانی بیروکراتی تورکەوە

نـاڕەزایی و بـێزاری بەرامبـەر بـە هەڵسـوکەوتی کاربەدەسـتانی بـیروکراتی و لێنەهاتوو و دزی رژێمی تورکیا کە لە تاوانکردیشدا دەسـتێکی باڵایـان هەیـە لـە ناوچـە کـورد نشـینەکاندا، ئـاخر هـۆی ڕاپـەڕین نـین، چونکـە بـە پێـی دان پیانـانی تورکـەکان خۆیان هەمیشە مووچە خۆر و کارمەندی بـەد رەوشـت دەنـێرن بـۆ شـوێنە دوورەکـانی کوردستان، ئەوانەی کە ناتوانن لە ناوەندی دەسـەڵاتدا ئیـش وکـار بەڕێوەبـەرن، یـاخود بەرامبەر بە دەوڵەت تاوانی زۆریان کـردووە هـەروەها ئـەو کارمـەندە بیروکراتییانـەیان دەنارد کە سەر بە خۆیان کار دەکـەن و لـە پلـە و پایـەی خۆیـان سـوودیان وەرگرتـووەو بوونەتـە هـۆی بـێزاری خـەڵك – ڕۆژنامـەی (ئەکشـەم) کـە لەگـەڵ دەوڵـەت هـاودەردی دەنوێنێت لـە ڕۆژی *1925/11/25* دا لـەم بـارەوە دەنووسـێت: "پێویسـتی بـە ڕێکخسـتنی ئەم ڕاپەڕینە نە دەکرد بۆ ئەوەی نیشان بدرێت کە (والی - قایمقـام)ی ئـەوێ لـە ئاسـتی ئەرکەکەی خۆیدا نییە. ئەم کوێرەوەرییە لە هەموو شوێنێکدا بـەرچاو دەکـەوێت، ئـەو کاربەدەستانە هیچ کار و کردەوەیەکی باشیان نییە".

هەروەها ڕۆژنامەی (ستانبول) کە سەر بە فەرەنسایە لە *1925/11/25* نووسیبووی: "ئێمە باشترین کارمەندمان ناردووە بۆ ویلایەتـە باشـەکان بـەڵام لـە هـەڵبژاردنی ئـەو کارمەندانەی کە دەبێ نوێنەری دەوڵەت بن لـەو ناوچانـەدا کـە بۆمـان دانـراوەو، زیـاتر وەك دەسەڵاتدار خۆیـان بنوێنـن، بـە هەڵـەداچووین، ڕاگـەیاندنی وا کـە هـێرش دەکاتـە سـەر دەزگاکـانی بەڕێوەبەرایـەتی تورکیـا لـە کوردسـتان یـەکجار زۆرن، هـەموو کـەس ڕووداوەکـەی مـانگی سـیپتامبەری *1924*ی لـە بیرمـاوە کـاتێك کـە والی – قایمقـامی نوێـی تورکیـا لـە هـەکاری لـە لایـەن کـورد و ئاسـوورییەکانەوە بـە دیـل گـیرا لەگـەڵ هـاوڕێ و پاسەوانەکانی".

## دابەشبوونی کارگێڕی تورکیا

ریفۆڕمی نوێی تورکیا لە باری دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتییەوە نەیتوانی کاریگەری خۆی لەسەر تینوویەتی ئازادیخوازی کوردان کە تێدەکۆشن بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ بەجێ نەهێڵێت. کە مالیستەکان کە دەیانەوێ دەسەلاتی تەواویان بەسەر دانیشتواندا هەبێت، بۆ کۆکردنەوەی باج و خەراج و مەبەستی سیاسی، سنجاقەکانیان گۆڕی بە ویلایەت. گۆڕانکاری لەم چەشنە لە دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی وڵات زیاتر دەبێتە هۆی بەڕێوەبردنی وڵات لە لایەن مەرکەز و ناوەندەوە (سینترالیزەکردن) و دەزگا بیروکراتەکان زیاتر گوشار دەخەنە سەر خەڵك. ناوچەی گەنج هەر چۆن بێت لە پێشاندا سنجاق - ناحیە بوو و لە لایەن مودیرناحیەوە بەڕێوە دەچوو کە زۆر جار لە دانیشتوانی ناوچەکە خۆی بوو، خەڵکەکە کەمتر رق و قینیان بەرامبەر بە دەوڵەت لە دڵ ئەگرت. بە پێچەوانەی دەسەلاتداریەتی ئەمڕۆ کە کراوە بە قەزا و قایمقام دەسەلاتی زیاتری بەڕێوەبردن و سیاسی پێدراوە. ئەم هەنگاوەی دەوڵەت بووەتە هۆی پەرەسەندنی خەباتی کوردەکان دژی دەسەلاتداریەتی دەوڵەت کە دەیەوێ خۆی بەسەر ناوچە و خێڵ و هۆزە نیمچە سەربەخۆ و مل کەچ نەبووی کورددا بسەپێنێت.

سەبارەت بە پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ دەسەلاتدارانی تورك ئاماژە بە هەندێ نووسینی ڤ. گ. مایڤسکی دەکەین کە چەندەها ساڵ لە کوردستان ژیاوە و وەك کونسوڵی روسیای تزاری کاری کردووە. "ساڵانی سەرگەردانی من لە ویلایەتەکانی ئاسیای تورکیا دەرفەتی ئەوەم پێدەدەن کە بڵێم، لای کەم هەڵوێستی نیوەی دانیشتوانی کورد بەرامبەر بە کار بە دەستان و دەزگای بەڕێوەبردنی تورکیا دوژمنانە دیارە، بۆیە پێم وایە کوردەکان زیاتر قینیان لە تورکەکانە تا سەرەك عەشیرەتەکانی خۆیان.".

ناكرێ وتەیەكی تری هەمان نووسەر هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە باس نەكرێت كە دەڵێ: "پاشان سەرم سوڕمابوو لەوەی كە هەندێ دانیشتوانی قەزاكانی شیروان و سگرت و زوك لەویلایەتی دیاربەكر پەیوەندی دوژمنانەیان هەبوو لەگەڵ دەزگا بەڕێوەبەرییەكانی تورك". لێرە زۆر جار من رووداوی وام بە چاوی خۆم بینیوە، دەچمە لای هەر كوردێك و نزیكی دەكەومەوە، ئەو شتەی كە بۆ خۆی دەری ئەبڕێت. گوند نشینەكان كە كەسێكی تر لە دوورەوە دەبینن ئافرەت و منداڵ دەسبەجێ ون دەبن و خۆیان دەشارنەوە. كاتێك دەچێتە ناو گوندێك چۆڵ و هۆڵ دەبێت و گەلە سەگ هێرشت بۆ دێنن یەك مرۆڤ لەسەر ڕێگا و شەقام نابینیت، ئەو خەڵكە چی لێهات؟ ئەگەر شەو بمێنیتەوە دەبێ ماوەیەكی زۆر بە دوای كوێخادا یا جێگرەكەی بگەڕێیت، رووداوی وا شاهیدی ئەوەیە كە كوردەكان لەبەر ئەوەی كەوتوونەتە بەر پەلاماری كارمەندانی بێ غیرەت و دز و بەرتیل خۆری تورك وەك دوژمنی خۆیان سەیری كارمەند و ژاندارمی تورك دەكەن. بێزاری لە ڕادەبەدەری خەڵك گەیشتووەتە پلەی ڕاپەڕین و بەرەنگار بوونەوەی تاقمی ژاندارم لەگەڵ كوردەكان بە مەبەستی گرتنی ئەو كەسانەی كە لە بزووتنەوەی كوردەكاندا بەشدارن بەردەوامە.

## بیرو باوەڕی نەتەوایەتی وەك فاكتەری سەرەكی ڕا پەڕینی كوردەكان

هۆی سەرەكی كە دەیان هەزار چەكداری لە كۆمــەڵانی خـەڵكی كـوردی خسـتووەتە ڕێ دژی ڕژێمــی تــف لێكــراوی توركیــا بــیرو بــاوەڕی نەتەوایەتییــە، لای خــواروی داخوازی ناسیونالیستە كوردەكـان ئۆتۆنۆمـی كوردسـتانە و داخـوازی هـەرە گەورەشـیان دروسـت كردنـی كوردسـتانێكی مـەزن و سـەربەخۆیە لـە سـنووری تـەواوی ئـەتنوگرافی خۆیدا.

سـەبارەت بـەو فاكتەرانـەی كـە بوونەتـە پـاڵ پێوەنـەری بزووتنــەوەی نەتــەوەیی كورد، پێویستە ئاسایی و نائاساییەكانیان (دەستكرد) جیابكرێنەوە فاكتــەرە ئاسـایی یـا سروشـتییەكان: زمـان، ئـایین، چارەنووسـی گشـتی مێژوویـی، چەوسـانەوەی ئــابووری و سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی لە لایەن توركەكانەوەیـە، دواكـەوتووی ئـابووری لـە ئـەنجامی بوارنـەدان بـە كوردەكـان كـە كەرەســە و بەرهــەمی خۆیــان لــە بــەندەرەكانی باشــوور بفرۆشن و هەروەها ڕێگرتـن لـە گەشـەكردنی هـێزە بەرهـەم هێنـەرەكانی وڵات، ئیلـهام بەخشی بیروبــاوەڕی ناســیونالیزم و ســەرهەڵدانی توێژێكــی ڕۆشــنبیر كــە پێشــڕەوی ڕاپەڕینن.

جوتیارانی كورد لەبەر چەوساندنەوەیان كە لەلایەن دەزگاكانی بەڕێوەبەری و باج و بەرتیل وەرگرتنی تورك چـاوی بینینـی ئـەوانیان نییـە. سـەرهەڵدان و پـەیدا بوونـی بورژوازی بازرگانی بە تایبـەتی لـە شـارەكانی كوردسـتاندا توانـای بینینـی توركـەكانیان نەبوو، چونكە كوردستانیان لە بەندەرەكانی باشوور دابڕیبوو، هـەروەها ڕژێمـی توركیـا بوو بووە كۆسپ لە ڕێگای پێشكەوتنی كاپیتالیسـتی كوردەكـاندا ئەمـە جگـە لـەوەی كـە روناكبیرەكان لە هەموو شتێك بێبەش كرابوون و توركەكان تەواوی پۆست و كارەكانیان بۆ خۆیان قۆرخ كردبـوو، چونكـە باوەڕیـان بـە كوردەكـان نـەبوو. توێـژی ڕووناكبـیرانی

کورد کە لە نێویـاندا ژمارەیـەکی زۆر هـەبوو خوێندنیـان لـە ئـەوروپا تـەواو کردبـوو و پسپۆریان تێدایە زیاتر لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگا کەوتووە بـەر چەوسـانەوەی نـەك تـەنیا مـەرالی (مەعنـەوی) بـەڵکو ماتریـالیش (مـاددی) و لەسـەر ئیـش و کارەکانیـان لادەبرێـن، روناکبـیرانی کـورد بـەم چەشـنە ناسـیونالیزم بوونـی خۆیـان بـاس دەکـەن: تورکـەکان بـە پاڵپشـتی کوردەکـان لـە کـاتی خـەباتی نەتەوایـەتی خۆیـاندا گەیشـتنە سەربەخۆیی خۆیان کە لە هەموو شتێك بە بەرزتری دەزانن، بەڵام دان نانێن بە مـافی گـەلی کـورددا وەك گـەلێکی جیـاواز و سـەربەخۆ و تەنانـەت نایانـەوێت ئۆتۆنۆمـی بـۆ کوردستان بەڕەوا بزانن. کوردەکان بە پێی ڕێژەی دانیشتوان دەبێ لە مەجلیسی تورکیـا تا شەست نوێنەریان هەبێت بەڵام لە راستیدا تـەنیا دوو نوێنـەریان هەیـە و ئەمانـەش هەر چەند پارەی مانگانە چوار سەد لیرە وەردەگرن، بـەڵام لـە کۆبوونـەوەی مەجلیسـدا ڕێگایان پێ نادەن بەشداری بکەن لـە گفتوگـۆدا. سـەبارەت بـە نوێنـەرانی ناوچـە کـورد نشـینەکان هـەموویان تورکـن و لەلایـەن کـەمال ەوە، (مورتـەدەکان) دانـراون، واتـە ئـەو کوردانەی حاشا لە کوردایەتی خۆیان دەکەن و نایانەوێ هیچ شتێکی هاوبەشیان لەگـەڵ کوردان هەبێت.

دەیـان سـاڵە لـە ناوچـە کوردییـەکاندا بـۆ سـەربەخۆیی ئـەرمینیا و عـــەرەب پــڕو پاگەندە دەکرێـت ئەمـەش بێگومـان کاریگـەریی هـەبوە لەسـەر کوردەکـان لـەم سـاڵانەی دواییـدا ئـایدەلۆژی ناسـیونال سـیپاراتیانەی کـوردان لــە لایــەن ئەگینتــەکانی روســیای قەیســەری و ئینگلیزییــەوە پــەرەپێدراوە، ئەگینتــەکانی ئینگلیــس بــە زمــانی کــوردی ڕۆژنامەیان چاپ دەکرد، کە جگە لـە دروشمـی نەتەوایـەتی و بیوگرافـی نـاوی رابـەرانی نەتەوەیی کورد کە خەباتیان کردووە بۆ سەربەخۆیی کوردستان و بە دەسـتی دەوڵـەتی تورك لە ناوبراون بڵاو دەکرانەوە لەو ڕۆژنامانەدا.

باریس شاخۆڤسکی لە یەکێك لە راپۆرتەکانیدا دەنووسێت:

لە سەرەتای ڕاپەڕینەکەی بەتلیسدا، شـەش بانگـەواز بـڵاو کرایـەوە تیایـاندا داوای لە کوردەکان دەکرد راپــەڕن و خـەبات بکـەن دژی تـورك بـۆ گەیشـتن بـە سـەربەخۆیی. فریــودان و کڕینــی هــەندێ لەســەرکردەی خێــڵ و هۆزەکــانی کــورد کــە خــەڵکیان

بـۆ خـەباتکردن هـان دەدا لـە ژێـر دروشمـی سـەربەخۆیی نەتەوایـەتیدا کاریگەرییـــەکی وای نییە.

رادەی هوشیاری نەتەوایەتی کوردەکـان حەقیقەتێکـە نـاتوانرێ گوێـی پێنـەدرێ و هەر ئەوەشە پاڵی ناوە پێیانەوە بۆ ڕاپـەڕین، هەرچـەندە فریودانـی هـەندێ لەوانـە لـە ئەنجامدا بەرەو هەڵدێریان دەبات، بەڵام ئەوانە ڕۆڵی خۆیان هەیە بۆ ڕاکێشانی خـەڵك بەلای شۆڕشدا و لە لایەکی دیکەوە بیرو بۆچوونی ئینترناسیۆلیستانەی ئەوروپییـــەکانی نـاو تورکیـا لەگـەڵ هـەندێ لـە قەحبـە سیاسـیەکانی سـەرکردەکانی کـورد دەبێتـە هـۆی ڕابوونـی کوردەکـان لـێرەش یاسـاکانی دیالـەکتیك سـەبارەت بـە مـردن و لـەناوچوونی ئیمپریالیزم بەرچاو دەکەوێت. ئیمپریالیزمی ئینگلیز کە لە رقە بەرایەتی و ململانێی دەوڵەتانی تـر دەترسـێت لـە پێنـاو بەدیـهێنانی ئامانجـەکانی خۆیـدا پـەنا بـۆ هـاندان و ڕابوونی کوردەکان دەبات، بەڵام هەڵوێستی ئەم ناسیۆنالیزمانە زوو یـا درەنـگ لـە کـاتی تونـد و تیژیـدا دژی ئیمپریـالیزمی ئینگلـیز وەرئەگەڕێتـەوە، دیـارە ئیمپریـالیزمی ئینگلیز کە لە ناو کوردەکاندا پڕو پاگەندەی ناسیونالیستانە دەکەن ئەو لقـە دەبڕنـەوە کە خۆیان لە سەری دانیشتوون.

هـــەبوونی ئـــەم فاکتـــەرە سروشـــتی و دەســـتکردانە لـــە ڕابوونـــی هەســـتی ناسیونالیستانەی کوردەکان، زەمینەیەکی لە باری بۆ دروستکردووە. پێویستە بگوترێت کە لە ڕۆژهەڵات سەرهەڵدانی هەستی سەربەخۆیانەی نەتەوەیی بـەو گەلاڵـە سـەرەتایە ناچێتە پێش وەك ئـەوەی لـە ئـەوروپا بیـنراوە. نەتـەوە تـەنیا لـە سـەردەمی کاپیتـاڵی بازرگانیدا کاتێ کە خەبات دەکرێت بۆ بازاری نیشتمانی، خۆی دەناسێت، لـە ڕۆژهـەڵات لە سایەی کاریگە ری فاکتەرە دەسکردەکانی ناوبراوی سـەرەوە هەسـتی نەتەوایـەتی ئـەو گەلانەی کە لە لایـەن نەتـەوەی بێگانـەوە دەچەوسـێنرێنەوە سـەرهەڵدەدات و زۆر جـار پێش فاکتەری ئابووری دەکەون و گلاڵەی سەرمایەداری بازرگانی خۆماڵی دادەمەزرێت.

لەگەڵ کاریگەری ئەم هەموو فاکتەرانە و ئەمانەی دواییش لەم دە ساڵەی دواییدا، هەستی نەتەوایەتی کورد فۆرمێکی دیاریکراوی بە خۆیەوە بینیـوە: لـە بـاتی راپـەڕینی هـەندێ شـێخ و سـەرکردە و بـەگ کـە زۆر جـار بـە قسـەی بێگانـەکان دەجولێنـەوە،

کونگرە و کومیتە پەیدا بووە و لەسەر پرۆگرام و میتودەکانی خەبات بۆ سەربەخۆیی کوردستان کار دەکەن. بەڵام هەندێ لەسەر هەڵداو وسەرۆکەکانی کورد وەك سمکۆی قارەمان بێ پرەنسیپی خۆیان بە گوێرەی بارودۆخ دەگۆڕن و کێ زیاتریان بداتێ لەگەڵ ئەون. لەسەرکردایەتی ئەم راپەڕینەدا هەر سەرکردە ئاساییە کۆنەکان ڕانەوەستاون، بەڵکو کومیتەی کوردی ئەرز ڕۆم بەسەرۆکایەتی خالیدبەگ هەیە. بە پێی ئەو زانیارییەی کە خۆم هەمە دەوڵەت لەم ڕۆژانەدا لیستی پێنج نەفەری بلاوکردۆتەوە کە سەرکردایەتی راپەڕینەکە دەکەن و لەناویاندا شێخ سەعید و خالیدبەگ سەرۆکی کومیتەی ئەرز ڕۆم دەبینرێت. ئەم ڕاپەڕینەی ئەمڕۆ ماوەیەکی زۆری پێچوو تا ئامادەکرا، بە پێی ئەو زانیاریانەی کەلای سیخوڕە ئەوروپایی و رۆژنامەکانە ئامادەکردنی ئەم ڕاپەڕینە بەم چەشنەی خوارەوە بووە. هەر لە سەرەتاییساڵی (*1919* )ەوە کۆنگرەی کوردان لە گوندی شیرو/ شیروس/ کە کەوتووەتە لای ڕاستی ڕۆخی دیجلە لە بیست فەرسەخی خوارەوەی (مەلاتیە) لە ماڵی بەگێکی کورد بە ناوی حاجی بەدر ئاغا، لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەسەر خەباتی کوردان بۆ سەربەخۆیی کراوە، ئەم کۆنگرەیە لەژێر چاودێری ئینگلیزدا بەڕێوەچووە. راپەڕینەکەی ئەمڕۆش لە سیپتامبەری *1924* لە گوندی خاتمی سەر بە قەزای سوسنی (باشووری موش)، بە بیانووی زەماوەندەوە چەند نەفەر لە شێخ و بەگە کوردەکان بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر ڕاپەڕینەکە کۆبوونەوە، پاشان بەشداربووانی"زەماوەند"ەکە دەچن بۆ (ئالپۆ)و لە کۆتایی ساڵی *1924* دا کۆنگرەی کوردەکان، دەبەسترێت کە کوری شێخ سەعید عەلی بەگ، حەمدی پاشا لە سیڤەرێك، نەجیب ئەفەندی لە بەتلیس و...هتد لەوانە بوون بەشدارییان کردبوو تێیدا، لەم کۆنگرەدا بڕیار دەدرێت لە سیپتامبەری *1925* دا ڕاپەڕین دەست پێ بکات و سەربەخۆیی کوردستان ڕابگەیەنرێت، هەندێکیش دەڵێن کە سەرەتای مانگی فیورالی *1925* دیاری کرابوو بۆ دەسپێکردنی راپەڕینەکەو ئەمەش لە راستییەوە نزیکترە، هەر لەو کۆنگرەیەدا دەستور دەدرێت بە هەندێ لە بەشداربووانی کونگرەکە پارەوچەك کۆبکەنەوە بۆ راپەڕینەکە، هەروەها بڕیار درابوو شێخ سەعید سەرکردایەتی راپەڕینەکە بکات.

گەرچی شێخ سەعید وەك رابەر ناو ئەبرێ بەلام بێگومان سەرکردە گەورەکان پیاوە بەناوبانگ و دەسەلاتدارەکانی تری کوردن، وەك جەمیل پاشا زادە، حەمدی پاشا، نەوربەگ، خالید بەگ و زۆر ئەفسەری تری کورد کە لەناو سوپای تورکدا خزمەتیان کردووە. ئەم بۆ چوونەش لە راستییەوە نزیکترە، چونکە نیشانەی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە راپەرینەکە لەلایەن کۆمیتەی ئەرز رۆمەوە سەرکردایەتی دەکرێت.

بۆ خستنە رووی ئەو راستییەش کە راپەرینەکە ناوەرۆکێکی نەتەوایەتی هەیە، پێویستە ئاماژە بە چەند رووداوێکی پێش راپەرینەکە بکەین پایزی سالی رابوردوو بەتالیۆنێکی کو رد بۆ سەرکوتکردنی راپەرینی نەستوری و کورد نێردران بۆ هەکاری و لەناو خاکی عێراق. لەم بەتالیۆنەدا ئەفسەری وەك ئیسحاق بەگ، عەلی رەزا بەگ کە برای ناوداری کورد و نوێنەری بەتلیس لە مەجلیسی تورکیا زیابەگ بوون.

لە مانگی یەکی *1925* دا یوسف زیابەگ بە تاوانی گومان لێکراوی لە بەشداربوونی پیلانێکی دژی دەولەتدا گیرا، هەربەم تاوانەش سەرۆکی کومیتەی ئەرز رۆم پالکوڤنیك زیابەگ و هەروەها خالید بەگی حاجی موسا. (ئەمە ئەو خالید بەگە نیە کە لە سەرەوە ناومان هێنا) کە بەدەسبەسەری نێردرا بۆ زیندانی بەتلیس، بەلام لە رێگا د ەستەیەك کورد بەسەرکردایەتی نوح بەگ ناوێك هێرش دەکاتە سەر ئەو ژاندارمانەی کە گیراوەکان دەبەن بۆ زیندان و سەرکردەی نەتەوەیی کورد رزگار دەکا و تا ئێستاش خۆی شاردووەتەوە. پاش ئەم رووداوە دەولەت بریار دەدات نوح بەگ بگرێت بەلام لەگەل پالکوڤنیك خالید بەگ، حاجی موسا و کوڕەکانی عیزەت و سەرتیپ و سولیمان، چوون بۆ چیاو لەوێ ئالای راپەرینیان بەرز کردەوە. هێندەی پێنەچوو کاتێك کە دەولەتی تورکیا لەم کارە کەوتە گومانەوە بریاری گرتنیانی داو لە (*13*)ەی مانگی فیورالی بە ژاندارم هێرشی کردە سەر پیران و هێلی تەلگرافی پچڕاند.

وەك دەبینین راپەرینەکە لەلایەن چەند کەسێکی نادیارەوە سەرکردایەتی نەکراوە، بەلکو لەلایەن ناودارانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی گەلی کوردەوە رێبەرایەتی کراوە. ئەوەتا باریس شاخۆ ڤشکی لەسەر حاجی موسا بەگ بەم چەشنە دەنووسێت: "حاجی موسا بەگ رێزێکی گەورەی هەیە لە ناوچەی

مـوش و دەوروبـەریدا، پیـاوێکی ژیـرو بــە هـێزە، لـە تــەواوی راپەڕینــەکانی کـورد دا بەشداری کردووە.

بـاوکی شـێخ سـەعید بـە فـەرمانی (ئــەنوەر پاشـا) لـەدار دراو لــە راپەڕینەکـەی بــەتلیس *1924* بەشـــداری کـــردووە، پـــالکوفنیك خـــالید بـــەگ ســـەرۆکی کومیتـــەی پێشـتر لایـەنگری سـەر سـەختی یـەکێتی سـۆڤیت بـوو. خێڵـی حـەیدەرانلی مـــوش هاتنە ڕیزی راپەڕینەکەوە کە سەرکردەکەیان پـاش راپەڕینەکـەی بـەتلیس لـە سـێدارە درا بوو.

بـەم چەشـنە دەبینـین کـە سـەرکردایەتی بزوتنـەوەی ئــەمڕۆ ڕێبــەرانی گــەورەو بەناوبانگی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردن کە لە ناو دانیشـتوانی کوردسـتاندا بـەناوبانگ و جێی ڕێزن. تەنانەت تورکـەکان لەگـەڵ ئـەو هـەراو هوریایـەدا کـە دەیکـەن دەربـارەی کۆنەپەرستی و سیخوڕی بێگانەی کوردەوە هەندێ جار ناچار دەبن دان بەوەدا بنێن کە مەبەسـتی سـەرەکی راپـەڕین پێکهێنانی کوردسـتانی سـەربەخۆیە:"لـە ژێـر پـەردەی دروشمی کۆنــە پەرسـتانە وە مەبەسـتی راپـەڕین راگـەیاندنی سـەربەخۆیی کوردسـتانە. رۆژنامـەی ئەخشام/*925/3/15* هـەروەها وەزیـری نـاوخۆی تورکیـا لــە وتووێــژی رۆژی پانزەی مارت دا رایگـەیاند:"رووداوەکـان نیشـانیاندا کـە راپـەڕیوەکان مەبەسـتیان ئـەوە بوو پاش داگیرکردنی دیاربەکر دەوڵەتی کوردی رابگەیەنن. ئەستەنبۆڵ *925/3/11*.

## ئە نجامەکان

*1*-لایـەنی کۆنـە پەرسـتانە لـە نـاو بزوتنەوەکـەدا دەوری زۆر کەمـەو بـە زۆری لــە فابریقـەی چاپەمەنییـەکانی تورکیـاوە سـەرچاوە دەگـرن و هاواریــان لەســەر دەکــەن و ئەیانـەوێ ئـەم بزوتنـەوە بـەد نـاو بکـەن و دەیانـەوێ هــەندێ کەســی کۆنــە پەرسـت- بەرهەڵستکار کە لە پشتەوەی بەرەکەدان واتە لـە مەجلیسـی کوسـتانتینە پـول، سمـیرن، ئادەنــە، ســەرکوت بکــەن. هــەندێ دروشمــی گەڕاندنـــەوەی خەلافــەت کــە لــە نـــاو بزوتنەوەکەدا دەردەکەوێت تاکتیکی راپەریوەکانە و بۆ ئەوەیە کـە هەسـتی دانیشـتوانی تورکیا بەلای خۆیاندا رابکێشن.

2 -ئاشكرایه كه ئینگلیزەكان بۆ بەرژەوەندی كەڵك وەردەگرن لـەم راپەڕینـە، بـەڵام هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە لەسەر بەشداریكردنیان لە بزوتنەوەكـەدا، راسـتە كـە ئێستا بواری ئەوە زیاترە ئەگینا پڕوپاگەندە چییە ئەوروپاییەكانی ناو توركیا پەرە بـە چالاكی خۆیان بـدەن، بـەڵام هـەر چۆن بێـت، ئـاوەژوو نیشـاندان یـا بـەدناوكردنی ئـەم بزوتنەوەیـە هیـچ بەرهـەمێكی نـابێت سـەبارەت بـە دەوری ئینگلـیز و بێگومـان گـەورە كراوە. دووریش نییە كە بارودۆخی دواتر كوردەكان بخاتە باوەشی ئینگلیزەوە.

3 - لە پەیوەندی لەگەڵ بارودۆخی گشتی كاتی ئـەوە هـاتووە كـە ئێمـەش چالاكانـە تر بجوڵێینەوە لە كوردستاندا، لەبەر ئەوە بە پێچەوانەی كۆمیتەی ئەرز ڕۆم كە پێشتر سەروساختی لەگەڵ ئێمەدا بوو لەوانەیــە رووبكاتـە ئینگلیسـەكان و لەگـەڵیان بكەویتـە سەودا كە دیارە ئەمە بەرژەوەندی ئێمەی تێدا نییە

# بیرۆی چاپەمەنی و راگەیاندنی سەر بە نوێنەرایەتی دەسەڵاتداری یەکیەتی سوڤێت لە تورکیا

لە بارەی راپەڕینی شێخ سەعید. ئانکارا 27/مارتی925

یەکەم راپۆرتی کورت. ژمارە 18

1-ناوچەکانی راپەڕین.

2-هۆکانی راپەڕین

3-دەوری کەسانی ناو بزوتنەوەکە (رێبەرانی راپەڕین).

4-دەوری کۆمیتەکان و کارتێکردنی دەرەوە لە بزوتنەوەکە.

5-سەرهەڵدانی راپەڕینەکە، دروشمەکان، پەیوەندی دانیشتوان.

6-پەیوەندی دەوڵەتی فەتحی. قەیران، هەنگاوەکانی عیسمەت، چالاکیەکان.

## ناوچەی راپەڕین

سەرەڕای هەوڵی زۆری رابەرانی بزوتنەوە کە دەیانەوێ تەواوی ناوچە کوردیەکان راپەڕێنن. ناوچەی راپەڕینەکەی ئەمڕۆ بە گوێرەی پان و بەرینی کوردستان ناوچەیەکی بچووکە و لەم شارو شوێنانە پێکهاتووە:

خنیس، گیگی، نازمی، خوزات چمیش/ گەزیك/ لە باکوور. خارپوت، چورمیك، سیڤەریك،/ لە رۆژئاوا. دیاربەکر، سەیرد،/ لە باشوور. موش، خنیس/ لە رۆژهەڵات. ناوەند یا گۆڕەپانی راپەڕینەکە ئێستا ئەم شارو گوندانەش هەن کە لە دەستی راپەڕیوەکاندان و بووەنەتە ناوەندی خزمەتی شۆڕشییەکان: گەنج، کەلب، لیجە-ئیلجە،

خانی، چیرمیك، ئارگانا، پالوو، چار - سنجاق، پیران، چاپاکچورو وارتا. ناوەندی سەرەکی ڕاپەڕینەکە ویلایەتی گەنجەیە-پێشان میوتوئارفلیك بووە. ویلایەتەکانی ئەرز ڕۆم، ئەرزنجان، دەرسیم، مەئموریەلعەزیز، خارپوت، مەلاتیا، دیاربەکر، ماردین، سەیرد، بەتلیس، مووش، وان کە بەشێکی کەوتووەتە بەر ڕاپەڕینەکە. جگە لە گەنجە ئەرگانیش/ ئەرگەنی/ بەتەواوی گرتووەتەوە.

ویلایەتی گەنجە لە سێقەزا- گەنج، چیباکچور، کالب- و پێنج ناحیەو *420* گوند پێکهاتووە. ژمارەی گشتی دانیشتوانی لە *50* هەزار زیاتر نییە، ئەم ناوچە شاخاوییە کە زنجیرە چیاکانی بەن گەلی. سامسون- داغ ئەگرێتە بەر لیرەبە کە چەند زنجیرە چیای تری لێ ئەبێتەوە، زۆربەی کێوەکان بە دارستانی سوسەن داپۆشراون لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵات ڕووباری (موراد سو) کە گەورەترین لقی فوراتە تێدەپەڕێت ئاووهەوای زۆر ساردە، لە ساڵدا ماوەی شەش مانگ کێوەکان بە بەفرێکی زۆر دائەپۆشرێن و هاتو چۆیان پیا ناکرێت، ناوچەکە پڕە لە میوەو سەوزەی باش. ئەم ناوچەیە ناوبانگی دەرکردووە بە بەرهەم هێنانی ترێ و زەیتون و توو و لە دانەوێڵەکانیش گەنم، چاودار، برنج، نۆك زۆر دەچێنن. زەیتون، پیلەی هەورێشم، ترێ، هەڵوو، گوێز، فندق، بەڕوو، هەنگوین دەنێرن بۆ دەرەوە. لەبەر نەبوونی ڕێگا دار لە ڕووباری مورادچای بەسەر ئاوەکەوەیە و تەنیا بۆ پێویستی ناوچەکە بەکار دەبرێت، هەروەها ناوچەکە کانی قورقوشم و زیوی تێدایە بەڵام تا ئێستا کەڵکیان لێ وەرنەگیراوە. ئیش و کاری دانیشتووان بە زۆری ئاژەڵدارییە بەتایبەتی مەڕوبزن کە پێشتر دەنێردران بۆ ئالپو، دیمەشق و هەندێ جار بۆ ئۆرفە و دیاربەکر. هەروەها ڕۆنی زەیتون، شەراب، ڕۆنی ڕەشەوڵاخ، دروستکردنی قاڵی و فەرش، چول -پەڵاس- بەرهەم دێنن. کێوەکانی گەنجە لەبەر سەرمای زۆر ماوەی شەش مانگ تەنانەت بۆ ئاژەڵیش دەست نادەن.

ناوەندی ویلایەتەکە دراچنی/ دیراك گوندێکە پێشتر سەر بە ویلایەتی بەتلیس بوو، دووسەد و پەنجا ماڵی تێدایە، خانووبەرەی دەوڵەتی، خان و مزگەوت و دە دووکانی لێیە. هەڵکەوتووی و بارودۆخی ویلایەتەکانی ئارگانا، خارپوت وەك ناوچەی باسکراو بگرە زیاتریش کوێستانییە، بۆ وێنە لە ناوەندی خارپوت لەبەر کویستانی

بوونی ناوچەکە سەربازەکان لەسەربانی هەندێ مالّ دەیانخوێند. پالو، کە کەوتووەتە سەر رووبارێك، *250* مالّەو لە لایەن خێلّ و هۆزە کێوییەکانەوە گەمارۆ دراوە. پیران نزیکەی *300* مالّی لێیە، لیجە و خانی گوندی بچووکترن. لە باشووری پالووە رووبارو زنجیرەی کێوەکان بە ریزی‌یەکدا راکێشراون و دۆلّی مورادچای لە دیجلە جیادەکەنەوە. ئەو کێوانەی کە دیجلە ئاویان لێوەردەگرێت، لەسێ لاوە بە رووباری فورات گەمارۆ دراون. لە نێوان مەلاتیا و ئەگین، فورات یەکێك لە زیگزاگە گەورەکانی خۆی دروست دەکات کە دەبێتە هۆی مەن بوونی رۆشتنەکەی بەرەو رۆژئاوا. بلّند ترین کێوی کوردستانی ناوەندی (خارسان داغ) ە کە کێوێکی زۆر سەختە و دەکرێ بلّێین دەست پێی ناگات و لە گرتن نایە و کاتی خۆی لە یەکێك لە راپەرینەکاندا بۆ گەمارۆدان و گرتنی ئ ەم چیایە دەبوا بە رێگای دارخستنە ناو دەستیان پێ گەیشتبان.

سیڤەرێك شوێنی تێپەرینی کاروانەکانە کە لە دیاربەکر، گەنجە، مووش و مەلاتیاوە دەرۆن بۆ ئەسکەندەرونە، چیرمیك، وەك گەنجە بە رانە مەرە گەورەکانیەوە بەناوبانگەو بازاری بزن و مەری لە کوردستان دەنگی داوەتەوە. ویلایەتی مەلاتیا، یەکێك لە ناوچە هەرە سەوزەکانی ئەناتولی‌یە، کە دانیشتووانی بە کشت و کالّ و باخداریی و توتن چاندن و ئاژەلّدارییەوە خەریکن، ئاژەلّی شاخداری کەمە، بەلاّم بزن و پەزی زۆر بە خێو دەکەن و وەك هەموو شوێنێکی کوردستانی ناوەندی، گۆشتی بەران تاقە خواردەمەنیانە و بەرهەمی سەرەکێیان گەنم و ماکە، هەم بۆ تریاك و هەم بۆ رۆنەکەی، توتن و ترێیان بەناوبانگە، دانەوێلّە و سەوزی، کەلەرمێکی گەورە و سەیری لێیە، سێو، هەرمێ، قۆخ کە بەشێکی زۆری هەم بە تەری و هەم بە وشکی دەنێردرێتە دەرەوە. توو، رۆن، پەنیر، قالّی، پارچەی دەستکرد شتی چنراویان زۆرە.

مەلاتیا لە ئاوی یەکێك لە جۆگەکانی رووباری فوراتەوە ئاودێری دەکرێت، گوندی زۆری لێیە بەلاّم هەریەکە لە *8-10* مالّ پێکهاتوون و خانووەکانیان بە کەرەسەی سەرەتایی و ساکار دروست کراون

ناوەندی تێپەربوونی کاروانەکان کە خزمەتی تەواوی کوردستان دەکات شاری دیاربەکرە. جگە لە شارەکە کە تورکیان تێدا دەژیت، تەواوی ناوچەکە کوردنشینە و

بەسەر خێڵ و هۆزەکاندا دابەش بوون. ڕێبازی جیاجیای ئـایینی و زاراوەی جۆراوجـۆر تیـایدا دەژیـن و بـەردەوام دوژمنایـەتی یـەکتر دەکـەن وەك نەقشـبەندی، قزلبـاش، مەولەوی و...هتد. دانیشتووانی ئەم شـارە یـەکجار بـەد ڕەوشـتن. تـەنیا لـە ژمارەیـەکی کەمی شارو گوندەکاندا قوتابخانە هەیە، زۆربەی شێخ و مەلاکانیان نەخوێندەوارن و لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکاندا نوێژ دەکەن ئـەویش بـە لەبـەرکردنێکی زۆر سەخت.

## هۆکانی ڕا پەڕین

هـۆی سـەرەکی ڕاپەڕینەکـە، پێکـدادان و تێکهـەڵچوونی نێـوان پرەنسـیپەکانی دەوڵەتی کۆماری و سایکۆلۆژی دەرەبەگایەتییە. تائەم دواییانە کوردەکان وەك کۆن یا با بڵێین وەك شێوەی ئۆتۆنۆمـی فیدراڵی عەشـیرەتی دەژیـان، هـەر عەشـیرەتێك بـۆ خـۆی سـەرکردەیەکی هـەبوو، شـێخ وەك هەمیشـە دەوری ڕابـەریی ئـایینی خـۆی لـەناو عەشیرەتەکاندا تا ئێستاش چالاکانـە دەبینێـت و جـۆرە پاشـایەکە و مـافی سـەربەخۆیی تـەواوی بەسـەر ئـەو عەشـیرەتانەوە هەیـە. شـێخەکان وەك ڕابـوردوو گـێرەو کێشـەی ناوخـەڵك و عەشـیرەتەکەی خۆیـان چارەسـەر دەکـەن و یارمـەتی یـەکتر دەدەن، کـە یارمـەتی مـادیش دەگرێتـەوە بـۆ ژێـر دەسـتەکانیان. هـەروەها شـەڕ دژی عەشـیرەتە دراوسێکانیان ڕادەگەیەنن و پشتیوانی دەکەن لە عەشیرەتەکانی خۆیان لە کاتێکدا شـەڕ دژی دەسـەڵاتدارانی دەوڵـەت دەکـەن، بـاج و سـەرانە کۆدەکەنـەوە و دەیدەنـە دەوڵـەت، سزای ئەندامانی عەشیرەت دەدەن کـە بەرامبـەریان ڕادەوەسـتن و تەنانـەت دەگاتـە ئـەو ڕادەیەی دەست دەگرن بەسەر سامانی ئەوانەدا کە گوێیان بۆ ڕاناگرن. نازناوی شێخ بـە میرات دەمێنێتەوە بۆ نـەوەکانی، بـەڵام تـەنیا ئەمـە بـەس نییـە بـۆ دەسـەڵاتداریەتی و سـەروکایەتی عەشـیرەتەکە و دراوسـێکانیدا، بـەڵکو پێویسـتە ئـەو کەسـە ڕێگـای بـاو باپیرانی بگرێتە بەرو ئایینداریکی تەواو بێت، ئیتر بەرە بـەرە بـە گوزەشـتی زەمـان لـە

ولاتەکەیدا دەبێتە ئەفسانە و پێویستە لە تەکیــەو خانــەقاکاندا خزمــەت بکــەن. تەکیــە شوێنی بە جێهێنانی ڕێ و ڕەسمــی ئایینیـیــە بــۆ عەشــیرەتەکە و بگــرە دراوســێکانیش و شێخ دەبێ بۆ خۆی شتی سەیرو عەجایب دروست بکات. شــێخێك کــە ئــەم مەرجانــەی تێدا بــێ دەبێتــە دەســەلاتدارێکی ســەربەخۆ و تــەواو. لــە نێــوان هــەندێ لــەو شــێخانەدا لەســەر دەســەلاتداریەتی بەســەر عەشــیرەتەکاندا، هەمیشــە گــێرەو کێشــەو بەیــەکدادانی هەندێ جار خوێناوی هەیە. ماڵی شێخ پەناگایە و هەر کەس دەتوانێت لەوێ بخــوات و بخــەوێت. کــوردی وا هــەن کـــە هەمیشـــە لـــە تەکیـــە یـــا مـــاڵی شـــێخدا دەحەوێنـــەوە و دەمێننەوە. شێخ لەناو کەسانی هەژارو بــێ دەســەلات و دەمارگــیردا مرۆڤێکــی پــیرۆزە و بــە هــەندێ لــە دەروێــش و موریدەکــانی خــۆی نــان و جــل و بــەرگ دەدا و بــەم چەشــنە ناوبانگی زۆر تر دەبێــت و ئــەوانیش شــێخی خۆیــان بــەرز دەکەنــەوە و لــەناو خــەڵکانی تردا باسی شتە سەیرو سەر ســوڕهێنەرەکان و پــاکی و پــیرۆزی ژیــانی دەکــەن. خــەرجی بــەڕێوەبردنی تەکیــە و خانــەقا زۆرە و ئەمــەش دەبێتــە هــۆی زیــاتر بوونــی ناوبــانگ و دەسەلات و دەوڵەمەندی و دەبێت شێخ زەوی و زاری هەبێت، ئــاژەڵ، نــان، شــیرو پــەنیر. هەرچــەندە شــێخ ناوبــانگی بــەرز بێــت بەرامبــەر بــە دەوڵــەت زیـــاتر خـــۆی ســـەربەخۆ ڕائــەگرێت و داهــاتی زۆرتــر لــە ڕێگــای عەشــیرەتەکەیەوە دەچێتــە خەزێنەکەیــەوە. لـــە کوردستان شێخی وا هەیە کە داهاتی لە ساڵدا دەگاتە چەند ســەد هــەزار لــیرە. زۆر جــار ئەم هەموو داهاتــە بــۆ خواردنــی ئەوانــەی لــە تەکیــەدا دەژیــن خــەرج نــاکرێت. هــەموو شــێخێك پارەیــەکی زۆر بــۆ قۆرخانــەی شــەڕو چــەکدار کردنــی پیــاوانی عەشــیرەتەکەی خــۆی خــەرج دەکــات دەســتەی چــەکداری چەشــنی قــەزاقی تورکییــان هەیــە. دەوڵــەتی ســوڵتان هــەر لــە کۆنــەوە لەگــەڵ شــێخەکانی کوردســتان پــەیوەندی خـــۆی پاراســـتووە و نەیوێراوە چەکیان بکات یا دەسەلاتیان لێ بسێنێتەوە، بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفە عەبدولحەمید کە پشتیوانی شێخەکان بوو و پەنای ئــەدان، ئەمــەش بــووە هــۆی ئــەوەی کە لە کوردستاندا زیاتر ناوبانگی دەرکرد و هێندە خۆشەویســتی ســوڵتان لــە کوردســتان زۆر بوو بە ئەندازەی ئەو بێزاریەی کــە کۆمــەڵانی خــەڵك لــە شــوێنەکانی تــری تورکیــا هــەیانبوو بەرامبــەری. لەســـــەردەمی شـــەڕی جیهانییەکـــەمدا شـــێخ یـــا ســـەرۆکی

عەشـــیرەتەکان چـــەکدارەکانی خۆیـــان کۆدەکـــردەوە و ســـەر پەرشـــتییان دەکـــردن دەسەلاتدارانی تورك تەنیا فەرماندە و ئەفسەر و راوێژکارەکانیان دیاری دەکرد و ئەرك و بەرپرسـیارییەکانی تریـان دەدا بــە شـێخەکان. لەسـایەی ئـەم یاسـا عەشـایەرییەدا کوردەکان باج و سەرانەیان چەند قات کەمتر دەدا بـە خەزینـەی سـوڵتان. بـەم چەشـنە زیانیـان بـە دانیشـتوانی تـری تورکیـا دەگـەیاند، بـە گشـتی کوردەکـان لـە زۆر شـتدا لــە پێشەوە بوون یا باری ژیانیان قورسایی کەمتری دەکەوتە سەر.

سـوڵتان عەبدولحـەمید کـە دژی فیوداڵــە تورکـەکان دەجووڵایــەوە و بێرەحمانــە هەموو چەشنە ئازارێکی دەدان، لە کوردستاندا چاکەیان بەسـەر شـێخەکاندا دەبـاراند و زەوی و زار، میدالیا و شاباش و نیشانەیان پێ دەدان و لە زۆربەی کـارە گرنگـەکاندا کـە پەیوەندییان بە کاروباری لەشکری یاخود دیپلۆماسـییەوە هـەبوو، هـەروەها لـە تـەواوی پۆستەکانی بەڕێوبەرایەتی مەدەنی تورکیا کوردەکانیان ئازاد دەکـرد. لـە ئـەنجامی ئـەم هەڵوێســتەدا لای شـێخەکان ســایکۆلۆژییەکی تایبــەتی و خۆبــە گــەورە زانینێــك وەك پاشایەکی بە دەسەڵات دروست دەبوو. ئەگەر شێخ شانازی پەیوەندی گرتنی کوردان بـە خۆ بدات دەبێ بە جۆرێك بێت کە کەسایەتی شێخ زیانی پێ نەگەیەت. شـێخ هەمیشـە لە ژووری تایبەتی دەژیت و زۆر کەم قسە دەکات، لەکاتی چاوپێکەوتنی شـێخ و چوونـە خزمەتی دەبێ بە نیـاز پاکییـەوە سـووچێکی عەباکـەی مـاچ بکـەن، هـەروەها شـێخی وا هەیـە وەك (تۆئـارگ) مکـانی ئـەفریقا تـا ئێسـتا دەموچـاوی خۆیـان لــە زیارەتکـەرەکان دادەپۆشـن. شـێخەکان لـە کـاتی گەشـتەکانیاندا ئەسـپ سـوارێکی زۆر لەگـەڵ خۆیـاندا دەبەن. شێخ عادەتـەن سـواری ئەسـپی عـەرەبی ڕەسـەن دەبێـت، لـە کـاتی سـەفەردا بـێ دەنگــە و قســەناکات و زۆر کـــەم لەگـــەڵ جوتیـــاران دەدوێـــت و هـــەر وەك نیوچـــە پێغەمبەرێك سەیری دەکەن.

سیاسەتی دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیای ئێسـتا، زەربەیـەکی گـەورەی لـەو شـێخانە و پلـەو پایـەیانی داوە، سـەرەتا لـە سـالانی یەکـەمی بزوتنەوەکـەدا، ئانکـارا دەسـتی لــە سیستەمی فیئودالی لە کوردستان نەدا، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە ئینگلیزەکـان بـەهۆی هەڵوەشـانەوە و تێکچوونـی سـوپای سـوڵتان مووسـڵیان داگـیرکردبوو و دەسـتیان لــە

ئاژاوەنانـەوە سـەبارەت بـە دروسـتکردنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ و جیاکردنـەوەی لـە تورکیادا هەبوو. دروستکردنی کومیتەی کوستانتینە پـول، ئـاوانتوری خـەلیل رامـی لـە مـەلاتیا، کوردەکـان وەك رابـوردوو لـە بـاجی زۆر ماڵیـان ئـازاد کرابـوون، شـێخەکانیش مافێکی ئەوتۆیان هەبوو و نزیك بە زۆربەی سەرکردە گەورەکانی عەشایر، وەك نوێنەر هێنرانە مەجلیس و... .هتد. هەرچەندە لەژێر کارتێکردنی ئینگلیزەکاندا، لە کوردستان جووڵانـەوە هـەبوو و هـەندێ جـار شـێوەی سـەرهەڵدانی چەکدارانـەی بـە خـۆوە دەگرت(*1922-921* )، بۆیە تورکیا خزمەت و ئاگاداری خۆی بەرامبەر بە کوردەکان زیـاتر کردو بایەخێکی تایبەتی دەدا بە نوێنەرانی کـورد لـە مەجلیسـی تورکیـاو پلـە و پایـەی تایبـەتی پـێدان. ئـەم هـەنگاوە بـە تایبـەتی لـەو هەلومەرجـەدا کـە ئینگلیزەکـان ئـەو هـەموو پیـلان و فـرت و فێڵەی لـە ڕێگـای هـەندێ کـوردی سـەرگەرم و بـە جـۆش و ئاوانتوری کوردستان دژی تورکیا هان دەدا سـەری نـەگرت، بۆیـە زۆربـەی کوردەکـان لـە هـەرە دژوارتریـن بـارودۆخی تورکیـادا بـە دەوڵـەتی ئانکـارا وەفادارمانـەوە، بـەڵام دواکەوتووی ناوچـە کوردییـەکان نـەیتوانی ڕێگـە لـە بزوتنـەوەی نەتـەوەیی تورکیـا بـۆ گەیشتن بە شۆڕش بگرن. سەرەڕای بەرەنگاری زۆربـەی نوێنـەرانی کـورد لـە مەجلیسـی تورکیـا، کـەمال بڕیـاری لـەناوبردنی سیسـتمی سـەڵتەنەت و خەلافـەتی دەرکـرد، ئـەو سـوڵتانەی کـە بەتایبـەتی لـەناو شـێخەکاندا لایـەنگرێکی زۆری هـەبوو و پێیانـەوە بەسترابوو و شێخەکان هەر دەبوا بـەرەنگارییان کردبـا، جگـە لـەوە بڕیـاری لـەناوبردنی سـەڵتەنەت زەربەیـەك بـوو لـە پرەنسـیپی خـودی تاقـە دەسـەڵاتی، واتـە دەسـەڵاتی شێخەکان کە هەر لەسەرەتاوە سەربەخۆ بوون لەم کاتانەدا بوو کـە زۆربـەی نوینـەرانی کوردی مەجلیسی تورکیا دەستیان کرد بە دوورکەوتنەوە لە کەمال. کەمال بـە خۆڕایـی هـەنگاوی وا ئاشـکرای هـەلگرت وەك ناسـاندنی ژنەکـەی خـۆی، لـە یەکـەم هـاتنیدا بـۆ مـەجلیس گـەورەی نوێنـەرانی کوردەکانیشـی – دیـاب ئاغـا- ناسـاند. نوێنـەرانی کـورد و شـێخەکان کـە لـە بڕیـاری شۆڕشـگێڕانەی یەکـەم ترسـابوون هەڵوێسـتێکی توندتریـان گرتەبەر و ئـەنجا هـەر کـە گرووپـی دووهـەمیان ڕێکخسـت هـەموویان بـە سـەرۆکایەتی یوسف زیاء بە ئاشکرا هاتنە ریزیەوە. لەم کاتەوە نوێنەرانی کورد هەمیشە لـە هێرشـی

بەرهەڵستکارانە دژی کەمال پشتیوانییان کردووە، تەنیا یەکجار نەبێت کاتێك کە (کەرزون) لە شاری لۆزان رایگەیاند کەنوێنەرانی کورد لە مەجلیسی تورکیا دانراون، تەواوی نوێنەرانی کورد بە توندی دژی وتەکەی (کەرزون) هەڵوێستیان وەرگرت و بە درۆیان خستەوە.

هەڵبژاردنی مەجلیسی دووهەم کە لە هەلومەرجێکی باشتردا بەڕێوەچوو و لەگەل هەڵبژاردنی یەکەم بەراورد ناکرێت، لەبەر وتووێژی ئاشتییانەی لۆزان فاکتەرێکی دەرەکییان بۆ کەمال فەراهەم کرد کە چیتر لەگەل شێخە ئۆپۆزسیونەکان شەرم و مامەڵە نەکات و بە دەوریاندا نەیەت. جگە لەوە بە هۆی ئەو ریفۆرمانەی ناوەوە کە بە دەستەوە بوون جێبەجێ بکرێن، وەك لەناوبردنی دەیەك - زەکات و سیستمی خەلافەت، دادگاکانی شەرع، مەدرەسەی ئایینی، لە لایەن نوێنەرانی کوردەوە، هەر دەبوا دوژمنانە تر پێشوازییان لێ کرابا. پاش شکانی یۆنانییەکان، دەرکەوت لە ئەنجامی ئەمانەدا کەسایەتی کەمال لە سەرانسەری وڵاتدا گەیشتووەتە لووتکە و کەمال خۆیشی تێگەیشت کە هیچ کەس ناتوانێت بەرامبەری راوەستێت. لە ئەنجامدا جگە لە دوو یا سێ نوێنەری "رادیکال" تەواوی گروپ و نوێنەرانی کورد لە مەجلیسی یەکەمدا کە چالاکانە کاریان دەکرد بۆ بە دەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەرکران.

لە ناوچە کوردییەکان، ئەندامانی مەجلیسی دووهەم زوربەیان مووچە خۆر، پارێزەر، مەلای تورك یا کوردی وا کە پەیوەندی بازرگانییان لەگەل شارە تورك نشینەکاندا هەبوو هێنران بۆ مەجلیس و وەك نوێنەر دانران.

لە ئەنجامدا بەرهەڵستکارانیناوداری کورد و شێخە کوردەکان بەد ناوو سوك کران و ئەمانیش ڕقیان لە کەمال هەڵگرت و ئەم ڕق و قینە لە داهاتوودا پەرەی سەند. جگە لەوە کەمال بەردەوام بوو لە بەرەو پێشخستنی تورکیا دا.

لە مانگی ئۆکتۆبەردا، دووهەم زەربەی کاریگەر کە لە ژێر ناوی جێگیرکردنی سیستمی جومهوری دابوو لە پاشماوەی دەسەڵاتی شێخەکان دراو دەسەڵاتیان بە تەواوی کەوتە لەرزین، زەربەکەش لە ناوبردن وهەڵوەشاندنەوەی سیستمی خەلافەت بوو کە بۆ شێخەکان لە ناوچوونی دەسەڵاتی ئایینییان بوو. لە ناوبردنی دادگاکانی شەرع چەکێکی

تری بەهێز بووکە لە دەستی شێخەکان دەرهێنرا، شێخەکان تەنیا بەم دادگا شەرعی‌یانە دەیانتوانی کوردە هاو وڵاتییەکانی خۆیان دادگایی بکەن.

جگە لەوەش زیادکردنی زەرببە و باج لەسەر ئاژەڵ زیانێکی گەورەی دارایی لە خاوەن ئاژەڵ و جوتیارانی کورددا. جوتیارانی تورك دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات کە لەکاتی شەڕدا بەجێیان هێشتبوو و ڕایانکردبوو و بەشێکی زۆر لە زەوی و زاریان لە لایەن کوردەکانەوە داگیرکرابوو، پەیوەندی نێوان کوردەکان و ئەو تورکانەی کە دەگەڕانەوە ئاڵۆز بوو بوو بەهۆی ناکۆکییان لە سەر دابەشکردنی زەوی ئەرمەن و ئاسوورییەکان کە دەستیان بەسەردا گیرابوو ئەو زەوییانەش تەنیا کوردەکان داگیریان کردبوون، مووچە خۆران و کاربەدەستانی دەوڵەت کە زۆربەیان تورکن هەمیشە لایەنی تورکەکانیان گرتووە.

شێخە کوردەکان کە ئاگاداری ئەوە بوون دەوڵەتی تورکیا گەلاڵەی چەند یاسایەکی بە دەستەوەیە بۆ لە ناوبردنی دەسەڵاتی فیئوداڵی کورد وەك یاسای دابەش کردنی زەوی و زار بەسەر جوتیاراندا، ڕێگەگرتن لە ژیانی کوچەریەتی، جێبەجێکردنی تەواوی یاساکان لە ناو دانیشتوانی کورددا‌و، لەبەر ئەوەی کە دەسەڵاتی بەهێزی فیئوداڵی کورد لە سەردەمی سوڵتاندا پەرەی سەندبوو لە هەموو لایەکەوە دەسبەجێ هێرشیان کردە سەر دامودەزگا و هێزەکانی ڕژێمی تورکیا. جگە لەوە کوردەکان لە خەبات دژی دەسەڵاتدارانی تورکیا بە درێژایی ساڵانی ڕابوردوو ڕاهاتبوون.

یەکێك لەو فاکتەرانەی کە بووەتە هۆی ئەوەی شەر نەکرێت، پێش هەموو شتێك بەڕێوەبەرایەتی تورکی خۆیەتی لەسەدا نەوەدی دانیشتووانی کورد تورکی نازانن و تەنیا بە زمانی کوردی یا زاراوەی تێکەڵی زازا قسە دەکەن. لە سەردەمی ڕژێمی سوڵتاندا هەر وەك پێشتر باسکرا ئەم شتە دەوری زۆری نەبوو، چونکە شێخەکان بەڕێوەبەرایەتی مەدەنییان نەدیتبوو و نەدە ناسی خۆیان بەڕێوەبەر بوون، خۆیان دادگایان دادەنا و سزای خەڵکیان دەدا و بۆ کاروباری گشتی دەوڵەتی تەنیا پەیوەندییان بە کاربە دەستانی بەرزی سەربازییەوە دەکرد. دەوڵەتی ئانکارا دەبوا لە یەکەم هەنگاویدا ئەم شتانەی لەبەر چاو گرتبا، لانی کەم لە دانانی مووچە خۆر و کار بە

دەستانی نوێ کە هەموویان پان تورکن هەر چۆنێك بوایا دەبوا لە کوردەکان خۆیان هەڵبژێردرابان.

دوای تێکشکانی یۆنانییەکان و لەناوبردنی سیستمی خەلافەت و سەڵتەنەت، دەسەڵاتدارانی تورکیا هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە پشت بەستن یا باوەر کردن بە بەرێوەبەرایەتی "کوردی" و هەوادارانی کۆنی سوڵتان پڕە لە مەترسیی بۆ ئەوان لەبەر ئەوە کەوتنە پاککردنەوەی ناو دەزگاکانی بەرێوەبەرایەتی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات زۆربەی کاربەدەستانی گەورەی ئەو دەزگایانەیان گۆڕی، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کەکارمەند و مووچە خۆری ڕێکوپێك و تێگەیشتوو زانا و لێهاتوو، رازی نە دەبوون بڕۆن بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەلات، تەنیا نەزان و کەسی لاسار و بەرتیل خۆر لە ناوەندەوە دەنێردران بۆ ئەوێ، ئەمانەش هیچ شتێکیان لە بارودۆخی ناوچەکە نەدەزانی و لە توانایاندا نەبوو هیچ کێشەیەك چارەسەر بکەن.

پێداویستییەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە خراوەتە پشت گوێ و لەبەر چاو نەگیراوە و تەنانەت هەندێ مووچە خۆر و کاربەدەستی باش و ڕێکوپێکیش کە دەنێردرێن بۆ ئەو ناوچەیە فێری بەرتیل خواردن و باجی زۆر وەرگرتن و تاڵانکردنی دانیشتووان دەبن.

ریفۆرمی سەرنەکەوتووی ساڵی *1923* کە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات (*74*) کار بە دەست و پارێزگاریان داناو مووچە خۆر و کارمەندێکی زۆریان لە خۆ کۆ کردبووەوە کە ڕاگرتن و مووچە دانیان کارێکی گران بوو، بووە سەربارێکی قورس لەسەر شانی دانیشتوانی ناوچەکە. بە تایبەتی ژمارەی ژاندرام و پۆلیسیان زیادکردبوو و هەر کام لە پارێزگارەکانی ئەو ویلایەتانە دەیانگوت کە بۆ پاراستنی ناوچەکانی خۆیان دەبێ هێزەکان زیاتر بگرێت و ئەرکی ڕاگرتنی ئەو ژاندارم و پۆلیسانەش هەمووی لەسەر شانی خەڵکی ناوچەکە بوو.

مووچە خۆر و کاربەدەستی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، بە تایبەت فەرمانبەرانی دادگاکان لە ڕۆژئاوای ئەناتولی پارەو مووچەی کەمتریان وەردەگرت گوایا لەبەر ئەوەی کە شتومەك و پێداویستییە سەرەتاییەکان لە ڕۆژهەڵات هەرزانترن، ئەم حاڵەتەش بوو

بەهۆی پەیدا بوون و پەرەسەندنی سیستمی بەخشش و رووتکردنەوەی دانیشتوان، مووچە خۆر و پۆلیس و ژاندارمەکان و هەڵسوکەوتی ناڕەوایان لەگەڵ خەڵکەکەدا بووە هۆی بێزاری و رق و کینەی دانیشتوان و لەبەر ئەوەی کە کاربە دەستەکان هەمووی تورکن دەتوانین بڵێین، پڕوپاگەندەی دژی تورك و ڕژێمی کۆماری بەهێز تر و زیاتر پەرەی سەندووە، جگە لەوەش ئەو زەریبە و باج و بەرتیلەی کە لەوێ کۆ دەکرێتەوە هەمووی دەنێردرێت بۆ ناوەند وهیچ شتێك بۆ پێداویستییەکانی ناوچەکە خەرج ناکرێت.

دەوڵەت هیچ ئاگای لە خەڵکەکەی ئەوێ نییە و هەوڵ نادات یاساکانی کۆماری لە ناو دانیشتوانی ناوچەکەدا بڵاو بکاتەوە، قوتابخانە لە تەواوی کوردستان دا زۆر کەمە و لە جاران کەمتر بوونەتەوە. کاربەدەستانی تورك ڕاهاتوون کە لەگەڵ کوردەکان بێ ئەدەبانە رەفتار بکەن، مامۆستای کورد هێنند کەمن کە بە قامك دەژمێردرێن، مامۆستای تورك کە زمانی کوردی نازانن ناتوانن بڕۆنە گوندە کورد نشینەکان و ئەوانەشی کە زمانی کوردی دەزانن ئامادەنین بچنە گوندە کورد نشینەکان لە ترسی هێرشی کوردەکان وخراپی بارودۆخی ژیانی ناوچەکە.

لە ساڵی *1924* دا مەجلیس بڕیاری دا پارەیەکی زۆر تەرخان بکرێ بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەکەدا، بەڵام کاربەدەستانی تورك وەك هەمیشە ئەو پارەیان بۆ شتی تر بەکار هێنا، لە ئەنجامدا دانیشتوانی کورد بۆیان دەرکەوت کە دەوڵەتی ناوەندی هیچیان پێ ڕەوا نابینێت تەنانەت لە باری پەروەردەشدا.

لەگەل ئەو بارودۆخە قورسەی ژیاندا، کاربەدەستانی تورك کە بەشی زۆریان پیاوی نەزان و نا ئاشنای بارودۆخی ناوچەکە بوون، دەسەڵاتی خۆیان سەپاندبوو بەسەر خەڵکەکەدا و ئەو زیانەشیان گەیاند کە دەیانویست ریفۆرمەکانی دەوڵەتی ئانکارا بە زووترین کات و موو بە موو لەوێ جێ بە جێ بکەن و بەبێ ئەوەی هەلومەرج وبارودۆخی ژیانی دانیشتوانی ئەوێ لەبەر چاو بگرن. کوردەکان چەند سکاڵایان لە دەست ئەمانە بەرز ئەکردەوە بۆ کاربەدەستان، بەڵام هەموو بەبێ وەڵام دەمانەوە. نەبوونی ڕێگای هاتووچۆو نەبوونی هێڵی تەلەفۆن جێبەجێکردنی کارەکانی

دوا دەخست لە کاتێکدا کە نەدەبوو لە جێبەجێکردنی ئەو کارانەدا کەمتەرخەمی بکرێت. جگە لە پۆلیس و ژاندارمەری کاربەدەستانی تری دەوڵەتی تورکیا لە ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکاندا نەبوون، ئەوانیش یەکتریان تاوانبار دەکرد بەوەی کە ڕێگر و کۆسپن لە جێبەجێکردنی کارەکاندا.

کولتوری تورکی تەنیا لەو شارە کوردییانەدا پشتگیریی دەکرێت کە زۆربەی دانیشتووانیان تورکن. بە تێپەڕ بوونی کات پەیوەندی نێوان ناوچە کوردییەکان و شارە تورکەکان بە تایبەتی لە باری ئابوورییەوە بە هێز تر دەبێت بازرگانە تورکەکان، ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات و گەنم و شتی تریان لە کوردەکان دەکڕی و دەیانناردە بۆ بازاڕەکانی بەیروت و ئەلیکساندەریە و بە کەمیش بۆ بەغدا و مووسڵ و لە لایەکی ترەوە بۆ ئورفە و دیاربەکر، کوردەکانیش بەنورەی خۆیان، مانیفاکتۆرە و کەلوپەلی دروست کراو لە ئاسن وشتی پیشەسازییان لەوان دەکڕی.

لە کاتی شەڕدا زۆربەی ئەو شارانەی کە لە دەوروبەری کوردستان بوون وێران کران، دانیشتووانی کوردی ئەو شارانە بە کۆمەڵ دەنێردران بۆ ڕۆژئاوا. ساڵی *1923* مەجلیسی تورکیا بڕیاری دا یەك ملیون لیرە تەرخان بکات بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئەم شارانە، بەڵام بە گوێرەی چاپەمەنییە رەسمییەکان ئەم بڕە پارەیە بۆ شتی تر بەکارهێنرا، ژمارەیەکی زۆری ئاوارەی تورك کە لە کاتی شەڕدا هاتبوونە ناوچە کوردییەکان، هەوڵیان دەدا بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی پێشوویان، بەڵام لەوێ هیچیان بۆ نەمابوویەوە، لەبەر ئەوە هەر لە شوێنەکانی خۆیاندا نیشتەجێ بوون. بوومەلەرزەی ماوەیەك لەمەوپێش زەربەی گەورەی لە دانیشتووانی شارەکان دا و لەبەر ئەوەی کە دەوڵەت هیچ یارمەتی نەدان و لای لێ نەکردنەوە گوزەرانی خەڵکەکە بەتەواوی ڕووەوخراپی چوو، جگە لەوە پەیوەندی ئابووری جارانی نێوان شارەکانی تورکیا و گوندەکانی کورد بەهۆی هاتنە خوارەوەی پەیتا پەیتای نرخی لیرەو تێکچوونی ڕێگاکان کە زۆربەیان لە *1914* ەوە چاك نەکراونەتەوە، بەرەو نەمان و روخانەوە چووە. مانیفاکتۆرە و شت وەکی پیشەسازی لە شوێن و شارەکانی تر دەهاتە کوردستان، کە ئەویش نرخیان زۆر گران و باشیش نەبوون، بە دڵی خەڵك نەبوو، لە ئەنجامی

داگیرکردنی سوور یا لە لایەن فەرەنسا و داگیرکردنی مووسڵ لە لایــەن ئینگلـیزەوە بـووە هـۆی مانــەوەو نەفرۆشـرانی مـەڕو مـاڵات و بەرهـەمی کشــتوکاڵی کـوردان. بازاڕەکـانی جاران هەمیشەیی بوون، ئەسکەندرییە، بەیروت، مووسڵ، بەغدا وهـەروەها نـاردنی دار و تەختـە بـۆ بازاڕەکانی موسـڵ و بـەغدا کـە لـە رووبـاری (موراد‌چـای)ەوە دەڕۆیشـت، دەتوانین بڵێین بە تەواوی ڕاوەستاوە. درێژە کێشانی چارەسەرکردنی کێشـەی مووسـڵ و گـێرەو کێشـە لەسـەر جێبـەجێکردنی پـەیمانی ئانکـەرە بـووە هـۆی دانــانی سـنوور لــە تەواوی باشووری مووسڵ – سووریا و هەروەها بوو بە هۆی داخرانی تــەواوی ڕێگاکـان و لــەم ســالانەی دواییــدا بــووە هــۆی کوێرەوەرییــەکی گــەورە بــۆ کــورد. لــەم هــەموو کوێرەوەرییەدا دانیشتووانی پێیان وا بوو هەر تورکیا تاوانبارە.

لەم هەلومەرج و پێشـهاتەدا کوردەکـان وای بـۆ دەچـوون کـە بـەرەو لای مووسـڵ و سـووریا بـڕۆن باشـترە، چونکـە پـەیوەندی بـەردەوامی نێـوان هـۆز و خێڵـەکانی کـوردی تورکیـا و بـەرژەوەندی زۆریـان لەگـەل مووسـڵ و سـووریادا هـەبوە. ئـەو سـنوورەی کــە ئینگلیزەکان دایان نـابوو، کوردەکـانی ناوچـەی باشـووری کوردسـتانیان کردبـوو بـە دوو بەشـەوە، ئەمانــەش بـەبێ یەکتریـنـەیاندەتوانی بژیـن، لـە چـەند شـوێنی ئـەم سـنوورە سـیکتی یـەکگرتووی وا هـەن کـە لـە بـاری پـەیوەندی بنەماڵـە و خـێزان و عەشـائیری و ئاینییەوە بەیەکەوە بەستراون. ئەو خێـڵ و هۆزانـەی باشـووری کوردسـتانی تورکیـا لـە رابوردوویـەکی دوور و درێـژدا شـوێنی بـەخێوکردن و لـە وەرگاکانیـان لـەو کوێسـتان و دۆڵە سەوزانەدا بوو کە ئەمڕۆ خراونەتە سەر عێراق. بۆ وێنە ئـەم کوێسـتان و دۆڵانـە بەیەکەوە بەستراونەتەوە کە ناوچەکانی دهۆك، ئاکرێ، راهی، مەئمورییەت، دەگرێتەوە و دەتوانین بڵێین تەواوی ئەو خاکە تا گۆلی وان، یاخود لە باشوورەوە لە لای سنوورەوە جێگای وای بۆ کشتو کاڵ و لەوەڕگا لـێ نییە، پاشان مووسڵ بە تەواوی کەوتووەتە سـەر چوار ڕێگایەك – لە پێش هەموو شتێکەوە لـە بـاری ئابوورییـەوە – تـەواوی نـاوەند و باشـووری کوردسـتانی تورکیـا لەگـەل سـووریا و ئـێران لـێرە ڕێگاکـان یـەك دەگرنـەوە و پاشان دەیانبەستێتەوە بە شارەکانی سلێمانی، کەرکوك، دیاربەکر، ئورفە، بتلیس، سوریا و ... هتـد. لـە لایـەکی تـرەوە دارو تەختـە بـۆ عـێراق زۆر پێویسـتە و پێشـان لــە

کوردستانی تورکیاوە بۆی دەچوو و نانی عێراق لە دیار بەکر و مەلاتیەوە دابین دەکـرا، تەواوی ڕێگـا بازرگانییـەکانی دیاربـەکر و ناوچـە کوردییـەکانی دەوروبـەر بـە مووسـڵدا دەڕوات. پـاش دامــەزراندنی ڕێگـای ئاسـن لـە مووسـڵدا پەیوەندییــە ئابوورییـــەکانی کوردستان لەگەڵ مووسـڵدا پـەرەی سـەند. ئـەم فاکتانـە ئـەوەندە ڕاسـتن کـە لـە مـانگی ئۆکتۆبــەری *1924*، لـە کـاتی کێشـەی نەسـتوورییەکاندا دەوڵــەتی تورکیــا بــە پێــی سەرچاوەکانی ئینگلیس لە یاداشتی خۆیدا لە جنێف ئاماژەی پێکردن تا ئەو کاتەی کە ئانکارا لە ڕێگای ئاسنەوە دەبەسترێتەوە بە کوردستانەوەو، تا ئەو کاتـەی کـە کوردەکـان لـە بــەرژەوەندی لـە پــەیوەندی ئابووریـیـان لەگــەڵ ئانکـارا تێدەگـەن. بێشـك دەبـێ کوردسـتان بـەلای عـێراق و سـوریادا راکێشـرێت، جگـە لـەوەش ئەگـەر تورکیـا مووسـڵ بگەڕێنێتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی ئەمپێوە بەستراوییە تەنیا بەشێکی لاواز دەکات بەڵام لە ناو ناچێت. ئەم پێوە بەستراوییەی کوردستان لە ساڵی *1924*دا بە تایبەتی دەرکەوت.

لەم ساڵەدا، بە هۆی لە باری ئاوو هەوای کوردستانەوە، بەرهەمی کشتوکاڵ لە مەلاتیە و دیار بەکر و ناوچە پڕ بەرهەمەکانی تر زیاتر بوو لە تێکڕای بەرهەمی ساڵانی پێشوو، بـەڵام لەگـەڵ زۆری بەرهـەمدا زیـانێکی گـەورە بـە دانیشـتوان گەیشـت.دەوڵـەت تـەنیا کۆکردنـەوەی دەیـەکی خـۆی بـەجێ گـەیاند. پـەیوەندی ئـابووری ئـەم ناوچانـە لەگــەڵ تورکیا لە کاتی ئەم شەڕەی دواییدا پچڕاوەو ئەمەش بووەتە هۆی ئـەوەی نـاردنی گـەنم و دانەوێڵەی ناوچە کوردییەکان بـۆ بـازاڕی تورکیـا تێکبچێـت، جگـە لـەوەش بەرهـەمی کشتوکاڵیی لە دەوروبەری ناوچەکانی تورکیـا، سـیواس، قونیـە، کـە سـیار باشـتر بـووە و پێویستی بە گەنمی ناوچە کوردییەکان نەبوە، گەنمی کورد تەنیا بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوا و ئەو بەندەرانەی کوستانتینە پوڵ و سمیرنا دەنێردرانە دەرەوە بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا کە دەوڵەت کرێی گواستنەوەی هێنا بوویە خوارێ و گومرگی (*12*) کەڕەت زیاد کردبـوو هێشتا نرخی ئەو گەنمەی کە لە دەرەوە دەهێنرا هەرزانتر بوو لە نرخی گەنمی کوردی. لە لایەکی ترەوە لەبەر دەست نەگەیشتن بە سنوورەکانی مووسـڵ سـووریا گـەنمی کـورد نەدەگەیشتە ئەو شوێنانە، هۆیەکی تریش ئەوە بوو کە ئینگلیزەکـان دەسـتیان کـرد بـە دروستکردنی پرۆژەی ئاودێری لە عێراقدا و ئەمــەش بـووە هـۆی زیـادبوونی بەرهـەمی

کشتوکاڵی و پێویستیان نەبو بە هێنانی گەنم لــە دەرەوە، سووریاش هێنـانی گـەنمی لـە کیلیلی زیادکردو بەم چەشنە توانی بەبێ گەنمی کوردستان بژیت.

هەندێ بازرگانی کورد و تورك کە هـەوڵی لابردنـی ئـەم کۆسـپەیان داوە گـەنمێکی زۆری هـەرزانیان کـڕی،نـەیانتوانی بیفرۆشـن و زیـانێکی زۆریـان لێکــەوت، لەبــەر ئــەم هۆیانە بەشێکی زۆری بەرهـەمی کشـتوکاڵی ناوچـە کـورد نشـینەکان لـە سـاڵی *1924* لـە ناوچوو.

بەم چەشنە چالاکیبۆ دەربڕینی نـاڕەزایی بەرامبـەر بـە تورکیـا و ئانکـەرە پـەیدا بوو، جگە لـەوە کوردەکـان وەزعـی کوردەکـانی مووسـڵ و سـووریایان لەگـەل کوردەکـانی تورکیادا بەراورد دەکـرد و لـەوە گەیشـتن کـە تورکیـا تـەنیا لێیـان دەسـتێنێ و هیچیـان پێنـادات و هـەروەها دەیـان بینـی کـە ئینگلیزەکـان لـە عــێراقدا پارەیــەکی زۆر خــەرج دەکەن بۆ چـاك کردنـەوەو دروسـت کردنـی ڕێگـای نـوێ و پـڕۆژەی ئـاودێری و ئـاوەدان کردنەوە و ...هتد.

هـەروەها بـەهۆی هێڵـی شـەمەندەفەرەوە کەلوپـەلی پیشەسـازی نـوێ لــە ناوچــەی مووسڵ زۆر لە هی کوردستانی تورکیا هەرزانتر بوو.

کوردەکان دەیانبینی کە ســەرەڕای شکسـتی یۆنانییـەکان، کـەمال هـێزی دەرکردنـی ئینگلیزەکانی لە مووسڵدا نییە، ئەمەش بووە هۆی هاتنە خوارەوەی کەسایەتی کەمال و دەوری بـەرەو تـاریکی و کەمبوونـەوە دەچـوو، لـە ئـەنجامدا ئەرسـتوکراتەکانی کــورد و شێخەکان وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد بیانووی زیاتریان بـۆ بـەگژداچوونی ئانکـارا بـۆ پـەیدا بـوو و هەلومـەرجی لـەبار بـۆ هـاندان و پـاڵ پێوەنـانی خـەڵك و هەلگیرســاندنی راپـەڕین هاتـە ئـاراوە. کـە ئەگـەر ڕێبەرایەتییـەکی ژیـر تــر و لێــهاتوو تــری هەبوایــە دەیـانتوانی راپەڕینەکـە ناوچـەی زیـاتر و بـەر بـڵاو تـری کوردسـتان بگرێتــەوە زیــاتر لەوەی کە ئەمڕۆ هەیە.

نەهێشتنی باجی دەیەك کە کاریگەری زۆری دەبوو لەسەر سایکۆلۆژی جوتیــاران و ئاژەڵدارانی کورد،هەمیشە هەر دوا دەخرا و ڕادەگیرا، تا پاش ڕاپەڕین ئەوسا مەجلیسـی تورکیـا ئـەو بڕیـارەی پەسـەند کـرد، لەلایـەن دەوڵەتـەوە هیـچ هـەنگاوێك نــەدەنرا بــۆ

ناساندن و بڵاو کردنـەوەی ئـەو کـارە چاکسازییانەی کـە دەکـران، شـێخەکانیش لـەلای خۆیانەوە بە تەواوی هەوڵیان دەدا بۆ ئـەوەی خـەڵك لـەم کارانـە ئاگـادار نـەبن، یـا بـە خراپی باسیان دەکردن. هەواڵی ئاڵۆزیش کە لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە دەهات پشت گـوێ دەخـران، ئـەو فاکتـەی وای کـرد لـە زۆربـەی نوێنـەرانی ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵات سەرەڕای نیگەرانییەکی زۆر لە کاتی هەڵبژاردندا بچنە ڕیزی بەرهەڵستکارانەوە.

کاتی سەفەری کەمال بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کوردەکان وەك رابوردوو چەکدار و ڕێکخـراو بـوون، جگـە لـەوە دەوڵـەتیش سـاکارانە پێـی وا بـوو کـە دەتوانـێ لـە ڕێگـای چەند خۆ نواندنێکی خێر خوازانەوە بەرامبەر بە شێخەکان تەواوی کوردستان لـە ژێـر دەسـتی خۆیـدا بهێڵێتـەوە کاربەدەسـتانی دەوڵـەتی لـە ناوچەکـەدا ڕاپۆرتێکـی گەشـبینانەیان نووسـیبوو بـۆ ئانکـارا کـە زۆربـەی ناوەڕۆکەکـەی، بـە هـۆی نـەزانی و تێنەگەیشتن لـە بـارو دۆخەکـە دوور بـوو لـە راسـتییەوە،دیـارە لـە هەلومـەرجێکی وادا ئانکـەرە بـەرەو رووی مەترسـییەکی مـەرگ هێنـەر و لەوانەشـە جێـی سـەرنج بێـت کـە ڕاپەڕینەکە تەنیا ناوچەیەکی بچووکی گرتووەتەوە.

## ڕێبەرایەتی بزووتنەوەکە

شـێخ سـەعید: لـە بنەماڵـەی شـێخە کوردەکانـە کـە بـە کۆڵنـەدەری و ئازایـەتی بەناوبانگن، لە عەشـیرەتی بـەرزانجیلان و لەسـەر ڕێبـازی ئـایینی گـەورەی نـاو کـوردان "نەقشبەندی"یە. لە پیر ان لە دایکبووە، باوکی کە ناوی عەلی حیجـامی یـە لەسـەردەمی ئەنوەر دا لە سەر خەبات و کۆڵنـەدانی لـە سـێدارە درا. باپـیری بـە نـاوی شـەباب الدیـن لەسەر پشتگیری کردنی بۆ ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی تورکیا گیراو لە ناوەڕاستی ساڵی *1924* دا هەڵواسرا. باوکی لە پالو دەژیا. کوشتنی باوك و باپیری لـە لایـەن دەوڵـەتی تورکیـاوە شێخ سەعیدی کردە دوژمنێکی سەر سەختی تورك، بۆیـە دەسـەڵاتدارانی تـورك لەگـەڵ ئەویش بە خراپی دەجوڵانەوە. کاتێك کە لە گونـدی (خنیـس) کـە لـە ویلایـەتی ئـەرز

ڕۆمـە، مامۆسـتای فوتابخانـە بـوو هیوایـەتی ئـەوە بـوو دەوری زۆر بـەرزتر بێـت، بـەڵام دەسەڵاتدارانی تورك لێی کەوتنە گومانەوە و پێشی پەرەسەندنی پلانەکانی سـەعیدیان گرت.

شـێخ سـەعید بـە مەبەسـتی تۆڵـە سـەندنەوەی باپـیری لـە سـاڵی *1913* دا هـەوڵی سـازکردنی ڕاپـەڕینێکی گشـتی بـە نـاوەڕۆکێکی ئاینییـەوە لـە نـاو کوردەکـاندا دا، بـەڵام دەسـەڵاتدارانی خۆجێیـی بـەزوویی ڕاپەڕینەکـەیان کوژانـدەوە و تـەنیا خۆشـاردنەوە و پەنابردنی بۆ کونسول خانەی رووسیای قەیسەری سەعیدی رزگار کرد.

لـەکاتی شـەڕی جیـهانی یەکـەمدا بـە پێـی سـەرچاوە ڕەسمییـەکانی تورکیـا شـێخ یـەکێك بـووە لەوانـەی پـەیوەندی هـەبوە بـە رووسـیای قەیسـەرییەوە، دوای هەڵوەشـانەوەی رژێمـی ئیتیحـادی، سـەعید دێتـە کوسـتانتینیەو لەبـەر نەخۆشـی خـۆ بەگەورە زانـین و خـۆ خـۆش ویسـتن، دەیویسـت لـە دەوڵـەتی (دامـاد فـەرید) دا ڕۆڵێـك ببینێت و بۆ ئەم مەبەستەش زۆر جار هاتوچۆی وەزارەت و دەزگاکانی دەوڵەتی دەکـرد و تەنانەت زمانی تورکیشی بـاش دەزانـی، چونکـە ماوەیـەك لـە شـاری خنیـس ژیـاوە و مامۆستا بـووە ولـە ڕۆژنامـە کۆنەپەرسـتەکاندا بـە نـاوی خـوازراوی (بـەدیع ئـەلزەمان) شتی دەنووسی. ئەم هەوڵانەی سەعید ئەنجامێکی سەرکەوتوویان نـەبوو. جگـە لـەوەش سەعید بە هەڵکەوت لەگەڵ پۆلیسـە داگیرکـەرەکانی ئینگلیـز گـێرە و کێشـەی ناخۆشـی هەبوو، ئەوەش ناچاری کرد وەك دەربڕینی بێزاری و نارەزایی بێتە ئەناتولی.

بزوتنەوەی کەمالی کە لەو کاتـەدا دەسـتی دابوویـە خـۆ ڕێکخسـتن، بـە ڕواڵـەت لـە هەڵوێستەکانی شێخ سەعید دژی تورکیا خۆش بوو بـوو، ئـەویش هـەر بـە ڕواڵـەت وای پیشـان دەدا کـە بـیروڕای بەرامبـەریان باشـە و خـراپ نییـە. بـەڵام بـە پێـی چاپەمەنییەکانی سووریا، ئەو درێژەی بە خەباتی خۆی دەدا دژ بە تورکـەکان. هـەر لـە ساڵی (*921-922*)وە پروپاگەندەی ئوتونۆمی بۆ کوردستان دەستیپێکرد. هاوکـات دەسـتی کرد بە بازرگانی کردن و هێندەی پێ نەچوو، بەهۆی ئەو بەشـە مـەڕو ماڵاتـەی کـە لـە باوکیـەوە بـۆی بـەجێ مـابوو کـە ژمـارەی دەگەیشـتە دوو هـەزار سـەر. سـەعید بـۆ پـەرەپێدانی دەوری خـۆی، دەروێشـێکی زۆری لـەخۆ کـۆ کـردەوە کـە لـە سەرانسـەری

کوردستان شتی سەیریان بڵاو دەکردەوە. باسی ئەوەش دەکرا کە شێخ سەعید بۆ نیشاندانی پیرۆزی خۆی دەستی بە فرۆشتنی جێگا کردبوو لە بەهەشت. لە دەست پێکردنی راپەڕینەکەدا شێخ سەعید پەنجا پیاوی باوەڕ پێکراو و وەفاداری هەبوو و ئەوەندەیش دەروێشی هەبوو کە کەسایەتی و دەوری ئەویان بڵاو دەکردەوە. دەروێشەکان هێندە زۆر بوون کە عەشائیرەکانی دەوروبەری پیاوەکانی خۆیان دەنارد تەنیا بۆ ئەوەی سەعید ببینن، هەروەها پەیوەندی خزمایەتیشی لەگەڵ شێخەکانی دراوسێی هەبوو، خوشکی شێخ عەبدوڵڵای (گەنجە)ی هێنا کە ئەویش دەوری زۆری هەبوو، بەم چەشنە عەشایری گەنجەیشی ڕاکێشا بەلای خۆیدا.

دوای کوژرانی باوکی لە ساڵی *1924* دا شێخ سەعید کەوتە بیری ئەوەی تۆڵەی باوکی بسێنێتەوە و لەبەر ریفۆرمە رادیکاڵەکانی رژێمی نوێی تورکیا چاوی بینینی ئانکەرەی نابێت و پروپاگەندەیەکی زۆری بۆ راپەڕین کرد لە کوردستان و بۆ ئەم مەبەستەش گەشتێکی کرد بۆ ناوچەکانی خنیس، گەنجە، پالو، پیران و هاوکاتیش برووسکە دەنێرێت بۆ دەوڵەتی تورك و تێیدا ڕادەگەنێت کە ئەو هیچ پەیوەندی نییە بە ئۆتۆنۆمی کوردستانەوە و لایەنگیری رژێمی کۆماری تورکیایە. بۆ ماوەیەکی کەم بە مەبەستی راکێشانی خەڵکی زیاتر بەلای خۆیدا، خۆی بەنەوەی خەلیفە عەلی/ مەهدی/ راگەیاند و لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا بە (ئەمیرولموجاهدین) ناوی دەرکرد. وا دەکەوتە بەر گوێ لە کاتی راپەڕینەکەدا سەعید زیاتر لە دوو سەد هەزار لیرەی ئاڵتونی هەبوەو تا ئێستا نەزانراوە سەرچاوەی ئەو لێرەیە لە کوێوەیە:

## ناوی هەندێ لە بەشداربووانی ڕا پەڕین

-نوح کوڕی سەعیدە، پێش راپەڕین بۆ دامەزراندنی پەیوەندی دەچێتە کوستانتینییە.

-یوسف ضیاء . نوێنەری بیتلیس بوو لە مجلیسی تورکیا، بەشداری چالاکانەی بووە لە سازدانی ڕاپەڕینەکەدا، بەڵام لە مانگی ئۆکتۆبەری *924* دا گیرا.

-مەستانلی و خالید کەریم هاوکاری یوسف زیابوون، لە ئۆکتۆبەری *924* دا لەسەر ئیش و کاری یوسف زیاگیران بەڵام لە ڕێگادا لە دەست پۆلیسەکان ڕایان کرد.

-فەخری، مامۆستای ڤوتابخانە هاوکارێکی نزیکی شێخ سەعیدی پیرانە، دەڵێن لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا کوتوپڕ کوژراوە.

-سەرتیپ سلێمان و سەعید و ڕەزا کە شێخی ڕۆژئاوای دەرسیمن لە بەشدارانی ڕاپەڕینەکەن، بەڵام لە پلەی دووهەمدان.

-عەبدوڵڵا شێخی گەنجەیە، خەزور و پیاوی دەستە ڕاستی شێخ سەعیدە

-پالکوڤنیك خالید، سەرۆکی عەشیرەتی چیرانە و لە بولانێك دەژیت، پێشان فەرماندەی چولکی کوردی لە هێزی حەمیدییە بوو. خزمی شێخ عەبدوڵڵای خەزوری شێخ سەعید و باوکی یوسف زیایە کە نوێنەری پێشوی بیتلیس بوو لە مەجلیسی تورکیا، لە کۆمیتەی ئەرز ڕۆم بوو، لە ئۆکتۆبەری *1924* گیراو ناردیانە بیتلیس بەڵام لە ڕێگا ئازاد کرا.

-حاجیم تەلعەت. هاوکاری نزیکی شێخ سەعیدە لە ڕێکخستنی ڕاپەڕیندا، بە دەستو ری ئەو گەنجە ئازاد دەکرێت.

-بابا ئاغا، شێخە، یەکێکە لە هاوکارانی شێخ سەعید و لە ناوچەی قەرە بازار چالاکی دەکات.

-بوزان ئاغا، نوێنەری ناسراوی ناوچەی ئوزوگلویە/ لە پلەی دووهەمدایە.

-نوح- ئەمە کوڕەکەی شێخ سەعید نییە- لە بنەماڵەیەکی ناودارە کە خالیدی ئازاد کرد. خالیدێکی ترو حاجی مومن کاتێك کە لەگەڵ پۆلیسدا بۆ بیتلیس ڕەوانە دەکران. ئەم نوحە یەکەم کەس بوو کەراپەری، نەك سەعید-تەماشای خوارەوە بکەن-

-حاجی موسی، شێخە، سەرۆکی یەکێك لە عەشایەرەکانی ناوچەی مووشە لە کۆمیتەی ئەرز ڕۆم ئیش دەکات، لە ئەرز ڕ ۆم گیراو ناردیان بۆ بیتلیس، بەڵام لە ڕێگادا ڕای کرد.

-لەبەشدار بووانی تری ڕاپەڕینەکە، دەکرێ ناوی ئەمانە بهێنین حاجی جەبرەئیل، محەمەد-بابا، شەریف کە لە ناو خەڵکدا زۆر ناسراوە و ڕێزی هەیە،

سەرۆکی چەند عەشیرەتێکە، جـەلال، محەمـەد ئـەم سێ شـێخە دوایـی بەشـداربوون لـە هـێرش بردنـدا بـۆ سـەر خـەرپوت. ئەحمـەد، ئـەمیش شـێخە، لـە لایـەن دەوڵەتـەوە لـە خەرپووت گیراو پاش رزگار کردنی شارەکە لە لایەن کوردەکانەوە ئازاد دەکرێت، بیرکی، موکەڕرەم، ئۆمەر- خەڵکی خانی- سوروس، محەمەد، حەسـەن، /لـە *26*ی مـانگی فیـورالی هێرشـی کـردە سـەر (گیگــە)، بــەڵام سـەرنەکەوت/ تاهـیر، مــەهدی، حــەلیم، ئومێـد، موحەمـەد، ئەشـرەف، پـالوی بـە دەسـتەوەیە/ فـەرهاد /نوێنــەری پێشـووی مجلیـس/ حەسـەن خـەیری، /کوڕی فـەرهاد/ دانیشـتووانی ناوچـەی دەرسـیم لـە پشـتیەوەن و ئێستایش خۆی لەوێیە. خزمەکانی جەمال- زادیـر پاشـا، حەسـەن پاشـا، سـەعید هاشـم و.....هتد.

لـەناو بردنـی تـەواوی بەشـداربووان و رابـەرانی بزوتنەوەکـە زۆر زەحمەتـە و جێبەجێش نابێت، چونکە عەشائیرەکانیان زۆر زۆرن، ئەوانەی لەسەرەوە ناویان هاتووە تـەنیا ناسـراوەکانیانن، جگـە لـەوە لـەم بزوتنەوەیـەدا ئەفسـەرانی کـورد کـە پێشـتر لـە سوپای تورکیادا بوون بەشداری دەکەن، وەك ئیحسـان و تـەوفیق و خورشـید و رۆسـتەم کە لە سیپتامبەری *1924* دا، رایان کردبوە مووسڵ ئیستا لە بزوتنەوەکەدا بەشدارن.

## . دەوری کۆمیتەکان و کارتێکردنی دەرەوە لە بزوتنەوەکەدا.

حەڵەب – بەیرووت: پاش لەناو بردنی سیستمی خەلافەت چەند کەس لەناودارانی بنەماڵەی خەلیفە، لەلایەن فەرەنساوە رێگایان پێدرا کە لە سووریا جێگیر ببن و ئەوانە ئـالپو و بـەیروتیان بـۆ نیشـتە جێبوونـی خۆیـان هـەڵبژارد، هێنـدەی پێنـەچوو کـە شێخولئیسلام حاجی سەبری و سەرۆکی بەناوبانگی دادگای سەحرایی لەسەردەمی داماد فـەرید، نـەمرود موسـتەفا پاشـا، گەیشـتنە لایـان لـە شـازادەکانی بنەماڵـەی خەلیفـە، سـەلیم و عـەبدوڵڵا رەحیـم، شـازادە عومـەر فـەروخ، کـوڕی عەبدولـەجید و بـرازای

بەهائـەدین، بورهانـەدین کـوری عەبدولحـەمید. هـەموو ئـەم کەسـانە کـە لـە کۆمیتـەی خەلیفە دەمێننەوە، بڕیاریان دا پاڵپشتێك لە کوردسـتان بدۆزنـەوە بـۆ خۆیـان، چونکـە کوردەکان بە گشتی سیستمی خەلافەت و سەڵتەنەتیان بەلاوە پەسەند بوو. لەبەر ئـەوە کومیتـەی (ئـالپو) هـەندێ کـوردی ئـاوارەی بـەلای خۆیـدا راکێشاو لـە دیسامبری سـاڵی (*1924*) لـە ئـالپو "کونگـرەی کـوردی" پێکـهێنا، لـە کۆنگرەکـەدا بڕیـار درا دەوڵـەتی کوردستانی سەربەخۆ پێکبێنن. شازادە سەلیم کە لە بەیرووت بوو، بانگ کرا بۆ ئـالپو- حەلەب و رازی بوونی خۆی دەربڕی کە ببێتە ئەمیری کورد، سەلیم دەبوا کومپانیاکەی خۆی لە تورکیا بفرۆشێت و پارەکەی بدات بە کۆمیتەی ئالپو بـۆ رێکخسـتنی ڕاپـەڕین، بـەڵام پاشـان لـە نێـوان سـەلیم و نـەمروود موسـتەفا پاشـا دووبـەرەکی پـەیدا دەبێـت. نەمروود موستەفا پاشا رایگەیاند کـە سـەلیم نـاتوانێت ببێـت بـە ئـەمیر چونکـە کـورد نییە، دواتر نەورەسی بەناوبانگ دەچێتە ریـزی سـەلیم ەوە. لەسـەر چـالاکی کۆمیتـەی ئالپو لە چاپەمەنییەکاندا چیتر نەنووسرابوو و دەگوترا کـە ڕاپەڕینەکـە بـە بەشـداری کۆمیتەی ئالپو رێکخراوە، بـۆ نموونـە ئـەو کۆمیتەیـە لـە هـەموو شـوێنێکەوە مـەلایانی بـانگ دەکـرد/ ئەمانـەش بـە کۆنـە پەرسـتی بـەناوبانگن- و دەیاننـاردن بـۆ تورکیـا و ناوچەکانی ڕاپەڕین تا یارمەتی شێخ سـەعید بـدەن. بەشـداری کۆمیتـەی ئـالپو دەکـرێ بڵێین ڕاستە چونکە ئەوانەی کە سەعید کاندیدی کردبوون بۆ پاشایەتی کوردسـتان لـە ناو ئەو شازادانەدا بوون کە لەوێ دەژیان وەك سەلیم و بورهانـەدین. لەلایـەکی تـرەوە، فەرەنساش بەرژەوەندی لەوەدا بوو کە گێرەو کێشە بۆ ئانکارا دروست بکات و خۆی بـە دۆسـتی کوردەکـان دابنـێ و لـە دوا رۆژدا بتوانێـت شـتێکی زیـاتری دەسـت بکـەوێت. ئاشـکرایە کـە فەرەنسـا لەگـەڵ ئـەوەدا کـە لـە تـەواوی رۆژنامـەکاندا -جگـە لـە کۆنەپەرستەکان، وەك (گوئینا) دۆسـتایەتی خـۆی دەردەبـڕی لەگـەڵ تورکیـادا و رێگـای دەدا بـە سـوپای تورکیـا کـە لـە خـاکی سـوریاوە هـاتوچۆ بکـات، لـە هـەمان کـاتدا چاپەمەنییـەکانی سـووریا، لەگـەڵ دەسـپێکردنی راپەڕینەکـە دەسـتیان کـرد بـە بـڵاو کردنـەوەی ئامـار و سـەر ژمـێری دانیشـتوانی ئەنتاکیـە و ئەسـکەندەروونە و ئـەوەیان نیشان دەدا کە تورکەکان لە *38 ٪* ی دانیشتوان کەمترن و لەبەر ئەوە ئوتونۆمی دان بـەم

ناوچانە، یا ڕاگەیاندنی زمانی تورکی وەك زمانی ڕەسمی دژی بەرژەوەندی دانیشتوانی ناوچەکەیە. هەروەها گەشتێکی دوورو درێژیان کرد بۆ ناوچەکانی ئەنتاکیە و ئالپو ئەسکەندەرونە و ڕایانگەیاند کە ئەم ناوچانە دەبێ سەر بە سووریا بن.

.-کۆمیتەی ئەرز ڕۆم ماوەیەك لەمەو بەر دامەزراوە و لە نێوان سالآنی *923-924* دا بە ڕێبەرایەتی یوسف ضیاء دامەزراوە کە بیر و باوەڕی چەپی ناسیۆنالیستی هەیە، بەلآم فریای پەرە پێدانی چالاکی نەکەوت. چونکە لە مانگی ئۆکتۆبەری سالّی *1924* دا لەلایەن ئەنکەرەوە تارومار کرا. زانیاری لەسەر ئەو کەسانەی کە لەم کۆمیتەدا دەور ئەبینن لە بەشی (ڕۆلی کەسەکان) باس دەکرێت. کۆمیتەکە بێگومان دەیویست بزوتنەوەی گشتی کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی بە ئازاد کردنی کوردستانی باکوور ڕێك بخات، بەلآم لەبەر گیرانی ئەندامەکانی تەگەرە کەوتە کارەکەیانەوە.

.-کۆمیتەی کوستانتیپۆل، دەسنێژی ئینگلیزەکانە و هەر لە کاتی داگیر کردنی شارەکەدا بە شێوەیەکی ئاشکرا دەستیان بەکار کرد لە ژێر چاودێری و ڕێنومایی ئینگلیزەکاندا. ئەم کۆمیتەیە لەلایەن بە ناوبانگ ترین و کۆنترین بنەمالّەی کوردەکانەوە، وەك بەدر خانییەکان و بابانەکان دامەزراو ناویان نا کۆمەلّەی پێشخست نی کوردان. ئەم کۆمەلّەیە دروشمی وایان بەرز نەکردەوە کە ببێتە هۆی تووڕە بوونی تورکەکان. هەندێ دەرەبەگی تورکی بەناوبانگی ناوچە کوردیەکان، وەك نوێنەری ئێستای مەجلیس فەیزی زولفی، راسیەم، بەمەبەستی خراپ کردن و پارچە پارچەکردنی ئەم ڕێکخراوە هاتنە ڕیزی کۆمەلّەکەوە و هەندێکیان توانییان لە مەبەستەکەیاندا سەربکەون، بۆ نموونە موستەفا زیهنی پاشاو عەلی کە هەردوو لە بنەمالّەی بەدرخان بوون، وازیان لە دروشمی سەربەخۆیی کوردستان هێنا، لە ئەنجامدا لایەنگرانی تورکیا کۆمەلّەیان بەجێ هێشت و ڕێکخراوێکی تریان پێکهێناو ئەویش هێندەی پێ نەچوو هەلّوەشایەوە.

.-کۆمیتەی جودایی خوازەکان، سەرپەرشتیارە بەناوبانگەکانیان ئەمانە بوون. قەنبور عیزەت، براکەی سلێمان، سەعید عەبدولقادر، -ڕۆلّی گەورەی بینی- ئەمین، -برا گەورەیە لە بنەمالّەی بەدرخان- حەمدی پاشا کە پێشتر وەزیری جەنگ بوو،

دوکتۆر شوکری محەمەد، دوکتۆر عەبدوڵلا جەودەت، خالید رامی بەناوبانگ بوو. باڵیۆزخانەی ئینگلیز لە دامەزراندنی ئەم کۆمیتەیە دا ڕۆڵێکی چاك و ئاشکرای بینیوەو وتوویێژەکانی کۆمیتە زۆربەیان لە ڕێگای سلێمانەوە بوو، ئینگلیزەکان پێیان گوتبوو، کە قەنبوور عیزەتی برای -ئەو کاتە کاربەدەستی گەورە نەبوو- دەتوانێت ببێتە وەزیری ناوخۆ ئەگەر پڕوپاگەندە بۆ سەربەخۆیی کوردستان بکات و ببێتە پشتیوانی ئینگلیزەکان. قەنبور عیزەتیش بەڵێنیان دەداتێ و ئامادەیی خۆی نیشان دەدات. جگە لەوە ئینگلیزەکان توانییان تۆفیق پاشا کە ئەو دەمە وەزیرێکی گەورە بوو ناچار بکەن قەنبور عیزەت بکاتە وەزیری ناوخۆ و هاوکات پێشنیاری پۆستی وەزیری دادپەروەری دەکەن بۆ ئەمینی براگەورەی بەدرخانەکان. بەڵام ئەمین کە خەیاڵی سەرۆك کوماری کوردستانی لەسەردابوو بە باشتری دەزانی کە ئەم پۆستە پەسەند نەکات.

کۆمەڵە لەلایەن ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگ و زانای کوردی مەولانا زادە رەفعەت کە لەو سەردەمەدا لە کونسانتینە پول ڕۆژنامەی (سەربەستی) دەردەکرد پشتیوانی لێکرا. کۆمەڵە لە ڕێگای لایەنگرانی خۆیەوە لەناو ڕۆشنبیرانی کورددا پڕوپاگەندەی خۆی دەکرد و لە کاتی پەیمانی سیڤەردا، دەستەیەکی نوێنەرایەتی تایبەتی نارد بۆ ئەوەی داخوازییە ئۆتۆنۆمییەکانی پێشکەش بکاو نەخشەی "کوردستانی سەربەخۆ"ی ئاراستەی کۆنفرانسەکە کرد. شایانی باسە کەبیروباوەڕی کۆمەڵە لەلایەن چەند ناودارێکی تورکەوە لەوانە وەزیری گەورە تەوفیق پاشا، پشتیوانی لێ دەکرا، بەوتەی تۆفیق پاشا پشتیوانی کردنەکەی لەبەر ئەوەیە کە پەیمانی سیڤەر جێبەجێ دەکرێت و ئەو ئەرزەی کە دەبوایە بخرێتە سەر ئەرمینیای گەورە بۆ موسوڵمانان واتە کوردەکان دەمێنێتەوە.

ئەندامانی کۆمەڵە هەنگاوی چالاکانەیان دەنا. ئاشکرا بوو کە یەکسەر دوای ئاشتی ئینگلیزەکان نامەیان دەنارد بۆ ئەندامانی کۆمەڵە لە ناوچە کوردییەکاندا و بە ناردنی یەکێك لە پالکۆڤنیکەکانی خۆیان لەگەڵ جەلادەت و کامەران کە کوردن و لە بنەماڵەی بەدرخانییەکانن کەوتنە گفتوگۆ بۆ سازکردنی پڕوپاگەندە دژی تورکیا. لە ماوەی

پانزە ڕۆژدا ئەم ئاژاوە گێڕانە چوونە ناوچە کورد نشینەکان و هاتبوونە مەلاتیە. لە کاتی هاتنەکەیاندا بۆ مەلاتیە موتەسەرریفی کورد خەلیل رامی لەوێ بوو کە ئەویش لە بنەماڵەی بەدرخانە. ئەم بنەماڵەی بەدرخانییە، کاتی خۆی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوای تەواوی کوردستان بوون. لە کۆنگرەی شیرو -لەناوچەی مووسڵ- هەندێ لە ئۆتۆنۆمیستەکانی کورد بەڵێنی ئەوەیان پێ دابوو بیکەنە ئەمیری کوردستان. لە کاتی هاتنی ئەو دەستە نوێنەرایەتییە کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا، خەلیل رامی بانگەوازی راپەڕینی کرد و بە مانیفیستێك لەم بارەوە داوای لە دانیشتوان کرد کە راپەڕن. خەلیل رامی کەل و پەل و چەك و گوللە و پێداویستی شەڕی زۆری لەبەر دەستدا بوو بەڵام لەبەر ناوەخت دەسپێکردنی راپەڕینەکە، لەناو کوردەکاندا پێشوازییەکی ئەوتۆی لێ نەکرا، چونکە کوردەکان لە شەڕی دژی ئەرمەنەکاندا بوون و هەستی ئایینی- موسوڵمانیەتی یان بەهێز تر بوو لە هەستی بەرچاو تەنگی ناسیونالستی، لە ئەنجامدا خەلیل رامی رایکرد بۆ مووسڵی ژێردەستی ئینگلیس. پالکۆڤنێکی ئینگلیزی و دوو نەفەری ناوبراوی کورد، کە دێنە مەلاتیە دەستبەجێ تورکەکان پێیان دەزانن و زۆر بە زەحمەت دەتوانن ڕابکەن وخۆیان رزگار بکەن.

ئەمە دیمەنی گشتی راپەڕینەکە بوو کە خەلیل رامی بە پشتیوانی کۆمەڵەی کوستانتینە پول پێی هەستابوو. پاشتر خەلیل ڕامی هەوڵیدا بگەڕێتەوە بۆ تورکیا، بەڵام لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکیاوە گیرا و بەهۆی پەیوەندییان بە ئینگلیزەکانەوە، دەوڵەتی تورکیا ناوی خستە ناو لیستی ڕەشەوە و لەگەڵ (*150*)کەسی تردا دوور خرانەوە بۆ دەرەوەی تورکیا لە *1924* دا.

ئەندامانی کۆمەڵە لەکاتی کۆنگرەی لۆزاندا بڵاوەیان لێکرد، ئەمیر بەدر خان ئاوارەی میسر بوو، مەولانا رەفعەت زادە چوو بۆ لەندەن و لەوێوە بۆ عێراق و ئەوانی تر هەمو و بۆ مووسڵ و عێراق. کۆمەڵە هەڵوەشایەوە، بەڵام لەسەر داوای ئینگلیزەکان، ئەندامانی کۆمەڵە درێژەیان دەدا بە چالاکی لە دەرەوەی تورکیا.

.-کۆمیتەی بەغدا و مووسڵ. هەروەك چاوەڕوان دەکرا کوردە ناسیۆنالیستەکان لە مووسڵی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا کۆبوو بوونەوە، ئینگلیزەکان لە پێناوی بە

دیهێنانی مەبەستەکانیاندا، لەسەر سنووری تورکیا،ئوتونۆمی کوردستانی باشووریان دروستکرد بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود کە لە ناو کوردەکاندا زۆر بەناو بانگە، شێخ مەحموود کە ئەم دەسەڵاتەی ڕاگەیاند بە ئینگلیزەکانی وت کوردستان هی کوردانە، بۆیە ڕێگا بە ئینگلیزەکان نادات بێتە وڵاتەکەیەوە. ئەوانیش سوپایان نارده سەری، هەرچەندە شێخ مەحموود لە نەبەردی دەربەندبازیان /باشوری سلێمانی/ بە دیل گیراو لەسەرەتادا بردیان بۆ هیند و پاشان بۆ ئینگلتەرا، بەڵام ناوبانگی شێخ مەحموود لە ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی و ئامێدی ئەوەندە زۆر بوو، خەڵکی ناوچەکان نەیاندەویست لەگەڵ دورخستنەوەی شێخ مەحموود ئاشتی بکەن و بە ڕاپەڕینی تونـد و تیژی خۆیان وەڵامیان دایەوە، سەرەڕای بەکار هێنانی هەموو شێوەکانی تەنگ پێ هەڵچنین، لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، دانیشتوان لە خەباتی پتەوی خۆیاندا هەر بەردەوام بوون و باروودۆخێکی زۆر سەختیان بۆ ئینگلیزەکان دروست کرد بەتایبەتی لە مووسڵدا. ئینگلیزەکان بە مەبەستی هێور کردنەوەی کوردەکان شێخ مەحموودیان گەڕاندەوە بۆ مووسڵ و تەنانەت ڕێگاشیان پێدا کە لە سلێمانیدا بژی. شێخ مەحموود جارێکی تر کوردەکانی ڕاپەڕاند و ئینگلیزی لە سلێمانی دەرکرد. هەر لەم کاتەدا پەیمانی لۆزان مۆر کراو شێخ مەحموود بەخواست و ئارەزووی خۆی بڕیاری دا خەبات ڕاگرێت و چاوەڕێی ئەوە بوو بەڵکو کێشەی ویلایەتی مووسڵ چارەسەر بکرێت.

ئینگلیزەکان، کە ئیتر باوەڕیان بە شێخ مەحموود نەما، سەیید تەهایان بۆ جێگری ئەو خستە پێش کە لە شێخ مەحمود کەمتر بەناوبانگ نەبوو. ئەم سەیید تەهایە نەوەی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمدینانە کە لە سەرانسەری کوردستاندا هەم لە تورکیا و هەم لە مووسڵ ڕێزی هەیە، دەستووری پێدرابوو کە کوردەکان ئارام بکاتەوە و لە هەمان کاتیشدا لە کوردستانی تورکیا ئاژاوە بنێتەوە و هەوڵی جیاخوازی بدات. ئەو بزوتنەوەیەی کە لە مانگەکانی ئەیلول -ئوگست- سیپتەمبەری ساڵی *1924* دا ڕوویدا و بە ڕاپەڕینی نەستوورییەکان ناوبانگی دەرکردبوو، خراوەتە ئەستۆی سەیید تاهاوە. لەگەڵ دروستکردنی کوردستانی ئۆتۆنۆمی لە ناوچە سنوورییەکانی تورکیا،

ئینگلیزەکان زۆر چالاکانە لە بەغدا و مووسڵ دەستیان کرد بە دروستکردنی کۆمیتەی جۆراوجۆر. لە بەغدا کۆمەڵەیەکیان دامەزراند بەناوی "کۆمەڵەی ئەفسەرانی کورد" ەوە کە سەرۆکەکانی پێکهاتبوون لە لیفتانت -پالکوڤنیك سالح زەکی، پالکوڤنێکی خانەنشینی ستادی تورکیا ئەمین زەکی، ئەفسەر و مەندوبی سامی و چەند کەسێکی تر. هەر پاش دامەزراندنی کومەڵەکە، داوای دروست کردنی کوردستانێکی یەکگرتوو و سەربەخۆیان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد هێندەی پێ نەچوو ئینگلیزەکان لە مووسڵ "کۆمیتەی سەربەخۆیی" یان دروستکرد بە سەرۆکایەتی قاسم زادە ئاغا ئاسەف و دادوەری دادگای شەرع ئەحمەد. باوکی ناوبراو (عەبدوڵڵا) یش لە جودایی خوازەکانەو لە بەغدا مووچە خۆرە. باپیری ئاسەف قاسم ئاغا بەگی بەناوبانگی زەردییە. ئاسەف لەبەسرە لای سەعید تالیب خوێندوویەتی. ساڵی *1909* ئاسەف قایمقامی زاخۆی سەر بە ویلایەتی مووسڵ بوو کە لەلایەن موستەفا یومنییەوە برای عیزەت هەڵۆ پاشای بەناوبانگ و پایە بەرزی کورد کە لەو کاتەدا والی مووسڵ بوو پشتیوانی لێ دەکرا. هەر لەو ساڵەدا ئاسەف بە تاوانی بەرتیل وەرگرتن لە کاتی کۆکردنەوەی سەرانەی مەڕوماڵاتدا لەسەر کار لابرا. ئیتر هەڵوێستی توندی دژی ئاسەف گەیشتە ڕادەیەك ناوی لە ریزی ناوی ئەو کوردە ناودارانەدا بوو کە ساڵی *1918-1919* داوایان کردبوو ویلایەتی مووسڵ بگرن. بەگشتی، دەستێوەردانی ئینگلیز لە کێشەی کوردەکان، لەم ڕاپەڕینەی دواییدا، شاراوە و زۆر بە نهێنی بوو. شایانی باسە کە لەم دواییەدا لە سوریا بەرپرسێکی ئینگلیز رایگەیاند کە کوردەکان بەشدار نەبوون لە کوشتن و تاڵانکردنی ئەرمەنەکاندا، کاتی شەڕی جیهانی، لای هەموانیش ئاشکرایە کە ئەمە راست نییە. دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە عێراق و مووسڵ ئەوەی کە لە توانایاندا بوو کردیان بۆ ئەوەی کوردەکان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە تەنانەت فەیسەڵ پارەیەکی زۆری تەرخان کردبوو بۆ شێخەکان بەناوی دیارییەوە.

لە رۆژنامەکاندا وا دەردەکەوێت کە نەورەسی و نەمرود موستەفا پاشا لە ڕاپەڕینەکەدا بەشداری دەکەن. نەورەسی - پالکۆڤنیکی خانەنشینی ستادی بەرزی سوپای تورکیایە و لەم دواییانەدا لە حیجاز لە ستادی بەرزی حوسین کاری کردووە،

بەشـداریکردنێکی چالاکانــە تریشــی لێ چـاوەڕێ دەکرێـت، چونکـە نـاوبراو ئـەندامی کۆمیتەی (ئالپو) بوو ه، نەمرود موستەفا پاشا سەرۆکی دادگای مەیدانیی سوپای تورکیـا بوو لەسەردەمی داماد فەریددا -پـاش کۆنگـرەی لـۆزان ئینگلیزەکـان هێنایانـە عـێراق و خزمەتێکی زۆری کردن لەســەر کێشـەی مووسـڵ. بەشـداریکردنی راسـتەوخۆی نـەمرود موستەفا لە ڕاپەڕینەکەدا زۆر زەحمەتە، لە کۆمیتەی ئالپو، هەروا لـە عـێراقیش تـەنیا یارمەتی (ماددی) بە راپەڕینەکە کردووە.

ئەگەر بڵێین ڕاپەڕینەکە تەنیا لە لایـەن کۆمیتـەی ئـالپو، یـاخود تـەنیا لـە لایـەن کۆمیتەی عێراقەوە ڕێکخراوە ڕاست نییە، "بێگومان دەسـتی بێگانـەکان"ی تێدایـە، بـە جـل و بــەرگی بێگانــە، چــەکی بێگانــە و پــارەو زێــڕ و شــتی تــردا دەردەکــەوێ کــە سەرچاوەکانی تورکیا بەر پەرچیان نادەنـەوە، لـە لایـەکی تـرەوە ئاشـکرایە کـە سـەعید پێـش ڕاپەڕینەکـە، یـەکێك لـە کوڕەکـانی خـۆی دەنـێرێت بـۆ ئــالپو، کــە بێگومــان بــۆ وەرگرتنــی ڕێنومـایی و پـارە بـووە، دەوری بێگانــەکان لـە هەڵگیرســاندنی راپەڕینەکــەو یارمــەتیدان و هاوسـۆزییان بەرامبـەری دیـارە و راپەڕینەکـە تـا زیـاتر درێـژە بکێشـێت، ئەنجامەکـەی بـۆ هـێزە ئیمپریالیسـتەکانی دراوسـێ گرنگـتر و زیـاترە، بـە تایبـەتی ئـەو ڕاپەڕینەی ئەمرۆ کە زیاتر خزمەتی ئینگلیزەکان دەکـات. لەبـەر ئـەوە کـاتێك کـە ئـەو راپەڕینـەی ئـەمرۆ پـەرەی سـەندووە کـاری کۆمیسـیونێکی "کۆمەڵـەی گـەلان" لـەوێ دەستی پێکردووە، تێکڕا لایەنگری تورکەکانن و هەمیشە دیپلوماتە تورکـەکان ئەمـەیان دووبارە دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاپەڕینەکە ئەو ئەنجامـەی نـەبوو کـە ئینگلیزەکـان بە تەمای بوون و مەبەستیان بوو لە ڕێکخستنی ڕاپەڕینەکەدا.

لـە مووسـڵ هـەندێ کەسـی نـاودار و گـەورە کـورد هـەن کـە پێنـــج هــەزار کەســی ئاسوورییان لە ژێر دەستدایە، ئەو ئاسوورییانەی کە لە ویلایـەتی هـەکاری دەرکـراون و هەوڵی گەڕانەوە دەدەن، ئینگلیزەکان بێگومـان دەیـانتوانی زۆرتـر بایـەخیان پـێ بـدەن، کاتێك هێرشیان کردە سەر زیرد، ماردین، بیتلیس و... هتد، لە لایەکی ترەوە دەیانتوانی عەشایرە کوردەکانی سەر سنوور کـە دەسـتەی نوێنەرایـەتییان بـە گوێـرەی ڕاگـەیاندنی ڕۆژنامـەکان چووبوونـە لای فەیسـەڵ و داوای یارمـەتی و چارەسـەرکردنی کێشــەی بــرا

ڕاپەڕیوەکانی تورکیایان لێکردووە، بەڵام لە راستیدا شتی وا نەبوە. بە داخوازی عەشایرەکانی سەر بە ئینگلیز لە مووسڵ وەڵامی داخوازییەکانیان رەتکرایەوە.

ڕێبەرایەتی ئاسوورییەکان سەرکردەکەیان قەشە مەنسوور و کریکورە، بە خۆڕایی پڕو پاگەندەی ئەوە دەکەن کە ئاسوورییە چەکدارەکان دەنێرنە یارمەتی کوردەکان و ئینگلیزەکان پێیان وایە کە دەرفەتی ئەم هەنگاو هەڵگرتنە یان نییە. بەڵام ئەمە یارمەتیدانی ئینگلیزەکان بۆ ڕاپەڕیوەکان لاواز ناکات. لە هەندێ لە چاپەمەنییەکانیدا، ئەوە بەرچاو دەکەوێ کە ڕۆڵی سەرەکی لەم بوارەدا، وەزیری ئەوقافی دەوڵەتی عێراق حەیدەری زادە ئیبراهیم دەیبینێت کە زۆر جار هاتوچۆی گومانلێکراوی دەکرد بۆ مووسڵ و ناوچە سنوورییەکانی تورکیا. پاشتر وەك لە کۆبوونەوەکانی مەجلیسی عێراقدا دەرکەوت، ئینگلیزەکان لە ساڵی *1919*دا، لە ناوچەی جولەمێرگ کە ئێستا ڕاپەڕینەکە ئەویشی گر تووەتەوە چەکێکی زۆریان بەجێ هێشت، ئەمە جگە لەوەی کە چاپەمەنییەکانی ئینگلیز زۆر بە ئاشکرا پشتیوانی ڕاپەڕیوەکانی دەکرد و تەنانەت چاوەڕێی کەوتنی "ڕژێمی کەمالیستەکان" بوون بە هۆی ئەم ڕاپەڕینەوە.

سەبارەت بە نارەزایی دەربڕینی ئینگلیسەکان لەسەر گواستنەوەی سوپای تورك لە ڕێگای سوریاوە وەك لە چاپەمەنییەکانی فەرەنسادا دەرئەکەوت، هەرچەند ئینگلیزەکان خۆیان بە درۆیان دەخستەوە، ئەوە لەسەر ئەوە بوو کە ئینگلیزەکان لایان وا بوو کە ئەم کارەی تورکەکان بە مەبەستی ئەوەیە سوپاکەیان بگەیەننە سەر سنووی مووسڵ و دانیشتوا نی ئەو ناوچەیەی پێ سەرکوت بکەن.

شایانی باسە ئینگلیزەکان هەوڵی ئەوەیان دا وای دەربخەن کە ئەوان ئەو ڕاپەڕینەیان ڕێکخستووە، بۆ ئەم مەبەستەش لە هەندێك لە ڕۆژنامەکانی ئینگلیز و ئەو ڕۆژنامە ئەمریکییانەی کە لایەنگریان بوون، وتار و بابەتیان بڵاو دەکردەوە کە ئەم ڕاپەڕینە لە لایەن بەلشەویکەکانەوە ڕێکخراوە، بۆ ئەوەی بەر لە پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی بگرن لە ڕۆژهەڵات"، بەڵام ئەم جۆرە راگەیاندن و نووسینانە هیچ دەنگدانەوەیەکیان نەبوو، چونکە بێ ناوەرۆك و بێ بنچینەبوون ولە لایەن دارو دەستەکانی تورکیا وە بە توندی بەرپەرچ دەدرانەوەو "وتاری حاکمیەتی میللی" ئەو

وتارانــەی کــە دۆســتایەتییان پیشــان دەدا بەرامبــەر بــە تورکیــا لــە چاپەمەنییــەکانی سۆڤێتدا بایەخێکی یەکجار زۆریان هەبوو. لە ناو ئەو دەوڵەتانەی کـە لەگـەڵ تورکیـا و دژی ڕاپەڕینەکـە بــوون ڕۆژنامــە ڕەسمییــەکانی: بولغاریــا، ئــەڵمانیا، ئیتالیــا ڕۆڵێکــی تایبەتیان هەبوو، ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکانی یۆنانیش دژی تورکیا بوون.

لە دوایین ژمارەی چاپەمەنییەکانی سوریادا ئەوە بـڵاو کراوەتـەوە کـە پـەترپارکی ئاسوورییەکانی ناوچەی سنجار هەر خۆی سەرکردایەتی دەستە چەکدارە ئاسوورییەکان دەکات و بە مەبەستی وەرگرتنەوەی ناوچـەی ئاسـوورییەکان لـە ویلایـەتی هـەکاری لـە دەستی تورکەکان ناردوونیەتە سەر سنووری تورکیا، بە پێـی ئـەو هەواڵانـە ئاسـوورییە ڕاپەڕیوەکان سوێندیان خواردووە لەسەر دۆسـتایەتی لەگـەڵ کوردەکـان و ئامـادەن شـەڕ دژی تورکەکان بکەن بە هاوکاری لەگەڵ کوردەکاندا، ژمـارەی چەکدارەکانیشـیان دەگاتـە پێنـج هەزار کەس.

## سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکە
## دروشمەکان
## پەیوەندی دانیشتووان بەڕاپەڕینەکەوە

ئاشکرایە کە لە ئاوگوست -سیپتامبەری ساڵی *1924* لە ویلایەتی هەکاری کە دراوسێی مووسڵە، ڕاپەڕینێکی زۆر ڕوویدا بوو و دەسەڵاتدارانی تورکیا زۆر هەوڵیان دەدا کە ڕاپەڕینەکە بە ناوەڕۆکێکی ئاسوورییانەوە بخاتە ڕوو، فەرمانی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە بە جەواد پاشا سپێردرا بوو، هەرچەندە تورکیا وای ڕادەگەیاند کە بزووتنەوەکە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە ڕێکخراوەو پشتیوانی لێدەکرێت، بەڵام ڕووداوەکانی پاشتر دەریان خست کە هەرچەندە ئاسوورییەکان بە ڕاستی زۆربەی هێزی ڕاپەڕینەکەیان پێکهێنابوو بەڵام کوردێکی زۆریش لەو ڕاپەڕینەدا بەشدار بوون و دەیانویست کۆمیتەی ئەرزڕوم سەرکردایەتی بکات.

ئاشکرا بوو کە ڕێبەرایەتی سەرەکیی ڕاپەڕینەکە لە دەستی براکەی سەیید تەهای بەناوبانگدا بوو. پاشتریش دەرکەوت کە کۆمیتەی ئەرزڕۆم بەسەرۆکایەتی یوسف زیاء هەوڵی دەدا کە زۆربەی کۆمەڵانی کورد بەشداری ڕاپەڕینەکە بکەن، کۆمیتەکە ماوەیەك لەمەوبەر دروست بوو بوو نەیتوانی بە گوێرەی پێویست ڕێکی بخات، لە لایەکی ترەوە پەلەکردنی هەندێ لە ئەندامانی کۆمیتەکە بوو بە هۆی تێکچوونی پێش وەختی کارەکە. چەند ئەفسەرێکی کورد کە لە ناو سوپاکەی جەواد پاشادا بوون، چاوەڕێی ڕێك خستن و ڕاپەڕینی گشتی ناکەن و سوپای تورکیا بەجێ دێڵن و چەند دەستەی بچووکیش لە گەڵ خۆیان دەبەن ئەمانە هەوڵیان دا بوو لەگەڵ ئاسوورییەکان یەك بگرن، سەربازەکان کە زۆربەیان تورك بوون ئەم کارە بە خیانەت دادەنێن و ئەفسەرەکان بەجێ دێڵن و دەچنەوە لای جەواد پاشا. ئەفسەرە یاخیبووەکان هیچیان

بـۆ نامێنێتــەوە جگـە لـەوەی بڕۆنــە لای ئینگلیزەکـان و هەرواشـیان کـرد. کاپیتـان ئیحسان و عەلی ڕەزا برای یوسف زیاء لەناو ئەو ئەفسەرانەدا بوون، ئەم ڕووداوە بوو بە بیانوو بۆ دەوڵەتی تورکیا کـە تـۆڕی ڕێکخراوەکـە بدۆزنـەوەو ئاشـکرای بکـەن و دەست بکەن بە گرتنی هەندێ کەس. یوسـف زیـا و بـاوکی پـالکوڤنێك خـالید و پـالکوفنێکێکی تـری خـالید نـاو و کابرایـەکی تـری خـالید موسی نـاو و هـەندێکی تریـان گـرت. پـاش ماوەیـەك لـە مـانگی یـەکی *1925*دا کەسـانێکی زۆر لــە شـاری (مـوش) گـیران، لـە نـاو گیراوەکاندا خزمی شێخ سەعیدیشیان تیابوو.

دەنگوبــاس وا بڵاوکرایــەوە کــە دەوڵــەت دەیــەوێ هــەرچی شــێخ و ســەرکردەی گومانلێکراو هەیە بیانگرێت و سزایەکی گەورەش چاوەڕێی گیراوەکان دەکات، لە مـانگی کـانوونی دوهـەمدا، دادگـای سـەربازی، تــەواوی گیراوەکـان بـانگ دەکـات بـۆ دادگـایی کردنیان، لە کاتی گواستنەوەیاندا لە ڕێگا، نوح ناوێك و بـرای یـەکێك لـە گیراوەکـان بـە چەکدارەکانیانەوە هێرش دەبەنە سەر ئەو قافڵە سـەربازییەو زۆربـەی گیراوەکـان ئـازاد دەکەن کە هەردوو خالیدی پالکوڤنیك و حاجی موسـایان تیـا دەبـن. پـاش ئـەم ڕووداوە نوح لەگەڵ چەکدارەکانی خۆی وگیراوە ئازادکراوەکان دەچنە شـاخ و لـەوێ ڕادەگەیـەنێ کە ئیتر دەوڵەتی ئەنکارا ناناسیت و بە چەك وەڵامی دەسـتوور و فەرمانـەکانی دەوڵـەت دەداتەوە.

شێخ سەعید لەم کاتەدا لە شارەکانی خنیس، پـالوو، پـیران، خـەریکی پڕوپاگـەندە بوو دژی ئانکەرە و لە هەموو شوێنێکدا شانەی چەکداری ڕێك خستبوو، بۆ ڕاگـەیاندنی ڕاپـەڕینێکی سەرتاسـەری لــە *31*ی مـارت ی سـاڵڕۆژی ڕاپەڕینــە کۆنــە پەرسـتانەکەی *1909*دا. دەسەڵاتدارانی ناوچەکە فـەرمانیان پێـدرا بـوو کـە بـە هـەرچۆنێك بێـت شـێخ سەعید بگـرن، ئـەو کەسـە چالاکـەی کـە لـە مێـژ بـوو گومـانی لـێ نـەدەکرا و بیـانووی گرتنەکەشـی ئـەوە بـوو کـە لـە نـاو گیراوەکـاندا خزمـی ئـەویان تێدایـە و پێویسـتە بــۆ شایەتی ئامادە بێت.

لـە بتلیسـەوە شـێخ سـەعید بـانگ دەکـرێ بـۆ لێپرسـینەوە، نـوح لـە کـاتی خۆیـدا سەعید ئاگادار دەکاتەوەو پێی دەڵێت کە لە بتلیس گرتن چاوەڕێی دەکات، بەم هۆیـەوە

شێخ لـه چوون بـۆ بتلیس وازدێنـێ وهاوکـات بـه مەبەسـتی شـوێن بزرکـردن بروسـکه دەنێرێت بۆ ئانکارا و ئەرزڕوم و تیایاندا وەفاداری خـۆی بەرامبـەر بـه کۆمـاری تورکیـا دەردەبڕێت. له ڕۆژی سیانزەی مانگی دووی *1925*، شێخ سەعید که لەگەڵ پەنجا نەفـەر له یاوەرە چەکدارەکانی له پیران دەبێت، پۆستی ژاندارمـری ئـەوێ بـه بیـانووی ئـەوەی کـه گوایـا دوو کـەس لـه ڕاکردووەکـان کـه لـه مێـژه بـه دوایـاندا دەگـەڕێن لــه بارەگـای سەعیددان و هەوڵی گرتنەوەیان دەدەن.

لەگـەڵ ئـەوەی کـه هێشـتا خـۆ ئامـادەکردن بـۆ ڕاپـەڕین کۆتـایی نــەهاتبوو شـێخ سەعید ئەمەی به هەل زانی و بۆ ڕاگـەیاندنی خـەبات و ڕاپـەڕین سـوودی لـەم ڕووداوه وەرگرت و پـاش تێکهـەڵچوونێکی کـورت لەگـەڵ ژاندرمـەکان هـەموویان دەگـرن و شـێخ سـەعید دەسـت بەسـەر گونـدی پـیران دا دەگرێـت و ڕاپـەڕینی دژی دەوڵــەت ڕاگــەیاند. لەوناوچانەدا که شێخ سەعید زەمینەی ئامادەکرد بوو ڕاپەڕین یەکسەر وەڵام درایـەوە، هەر لەو ڕۆژەدا، هاوڕێی شێخ سەعید حاجی تەلعەت لـه هێرشـێکی کوتوپـڕدا گەنجـەی داگیرکردو پـاش چـەند ڕۆژ ڕاپـەڕین ناوچـەی پـالوو، لیجـه و خـانی گرتـەوە، لەسـەر ویلایەتـەکانی دەوروبـەر و دراوسـێ، مەترسـی پەرەسـەندنی شـۆڕش پـەیدا بـوو. لـه سەرەتادا دەوڵەت پێی وا بوو که لەگەڵ هێرشێکی ساکار ڕووبەڕوو بووەتەوەو تەنیا بـه هـێزی ژاندارمـی ناوچەکـه وهـەندێ هـێزی تـر لـه ناوچـەکانی دەوروپشـت، دەتوانێـت ڕاپەڕینەکـه دامرکێنێتـەوە، بـەڵام ئـەو هـەواڵ و دەنگوباسـانەی کـه لـه ناوچـەکانی ڕاپەڕینەوە دەگەیشتن زۆر جێی پەرۆشی ومەترسی بـوون بـۆ دەوڵـەت، لـه زۆر گونـددا کـه لـه نـاوەندی ڕاپەڕینـەوە دوور بـوون، دانیشـتووان سـەربەخۆ چـەکیان هـەڵگرت و پێدەچـوو ڕاپەڕینەکـه تـەواوی ناوچـه کوردییـەکانی گرتبێتـەوە، قۆنـاغی خـۆش بینـی تەواو بوو، دەوڵەت دەسـبەجێ لـه سـیانزه ویلایـەتدا بـارودۆخی نـا ئاسـایی ڕاگـەیاند و هاوکات دەستی کرد به سـەرباز گرتـن لـه هـەندێ ناوچـەدا. لـه ڕۆژنامـه ڕەسمییـەکاندا دەسـت کـرا بـه بڵاوکردنـەوەی نووسـین و بابـەتی زۆر سـەبارەت بـه مەترسـی ڕاپـەڕین لەسـەر کۆمـاری تورکیـا و پێویسـتی ئامـادەبوونی تـەواوی هێزەکـان بـۆ خـەبات دژی ڕاپەڕینەکـه، بـەڵام سـەرەڕای لـه بـاربوونی هـەل و مـەرج، سـەرەڕای نـاڕەزایی گشـتی

لەویلایەتــەکانی ڕۆژهــەلاّت، هەلّچوونــە گشـــتییەکە، وەك دەســـت پێکردنەکـــەی زوو دامرکایــەوە و دەرکــەوت کــە ڕاپەڕینەکــە ناوچەیــەکی زۆری نــەگرتبوەوەو هێنــدەی پــێ نەچوو ئاشکرا بوو کە هیوای شێخ سـەعید بـۆ بلاّوبوونەوەیـەکی زۆرتـری ڕاپەڕینەکـە نەهاتە دی و بزووتنەوەکە لە شوێنی خۆیدا چەقی بەسـت ئـەویش تـا گەیشـتنی هـێزە گەورەکەی دەولّەت.

یەکێك لە هۆ سەرەکییەکانی سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینەکە، ناوەڕۆکی ئـەو دروشمانـە بوو، کە لە لایەن شـێخ سـەعیدەوە دانرابـوون. لـە لایەکـەوە خـەبات بـۆ "سـەربەخۆیی کوردسـتان" و لـە لایـەکی تـرەوە "دامـەزراندنی دەســەلاّتی ئـایین" بـوو روون بوونـی دروشمـە جیاخوازییـە کوردێزمــەکانیان بــە ڕووداوەکـانی دواتــرەوە کــە هــەمووی لــە دەولّەتی تورکیا نارازین، وای لە خەلّکە تورکەکان کرد کە شان بە شانی کورد بەشـداری نەکـەن لـە ڕاپەڕینەکـەدا.کۆنەپەرسـتەکان دەیانویست ناوچـەی کوردوسـتان لـە تورکیـا جیابکەنـەوەو بیخەنـە سـەر عـێراقی ژێـر دەسـەلاّتی ئینگلیزەکـان، ئەمـەش بـووە هـۆی ئەوەی دانیشتوانی تورك پشتیوانی نەکەن لە بزووتنەوەکە، ئەم دروشمە کۆنەپەرستانە تەنیا دەیانتوانی سەرۆکەکانی کـورد یـەك بخـات، ئەگـەر ڕکـە بەرایـەتی هەمیشـەیی لـە ناویاندا نەبوایە و ڕێبازە ئایینییەکانی کورد جیاوازن و تەنانـەت بـەردەوام دژی یـەکتر دەوەستنەوە.

لە لایەکی ترەوە، هەولّدان بۆ ڕاپەڕین لە شوێنی وەك ئەرزرۆم و بتلیس کە بەشە بـەهێزەکانی سـوپای سـێهەمی تورکیــا جێگـیرن تیـایدا و لــە بـارودۆخی ئــارامی وەك ئەمڕۆدا کە تورکیا هیــچ ئـەرکێکی سـەربازییانەی دەرەوەی لەسـەر نییـە، چاوەڕوانی و پێش بینـی ئـەوەی لێدەکـرا کـە توشــی شکسـت ببێـت و ئامـانج و ئـاواتی شـێخەکان نەیەتەدی. جگە لەمە ڕاپەڕینەکە کوتوپڕ دەستی پێکرد پێش کاتی دیاریکراو، چونکـە هێشتا وتوویـژی شـێخ سـەعید لەگـەلّ سـەرکردە گـەورەکانی کـورد کۆتـایی نـەهاتبوو و ژمارەیـەکی زۆر لـە شـێخە کوردەکـان تـەنیا بــە دەربڕینـی هەسـتی خۆیـان لـە بـاری مەعنەوییــەوە پشـتیوانییان دەکـرد لـە شـێخ سـەعید و بڕیاریـان وا بـوو تـا هـــەتا هەلومەرجێکی باش نەرەخسێ، چالاکانە بەشداری نەکەن لە ڕاپەڕینەکەدا.

لەوانەیـە راپەڕینەکـە زۆرتـر پـەرەی سـەندبا ئەگـەر شـێخ سـەعید سـەرکەوتنی زۆرتر ی بە دەست هێنابا، شێخ سەعید لە گرنگی ئەم سەرکەوتنانە تێگەیەشتبوو بۆیـە زۆر مەبەستی بوو کە لە شـارە گەورەکانـەوە دەسـت پـێ بکـات، لـە سـەرەتادا وەك بلێـی بەختـەوەری بـە دەمیـەوە پێکـەنی، چـەکدارەکانی لـەناکاودا خـەرپوت یـان گـرت. هـەر لـێرەوە کەموکوڕییـەکانی ڕاپەڕینەکـە دەرکـەوت، بـێ سـەروبەری بـێ دیسـپلینی لـەناو ڕیـزی راپـەڕیوەکاندا بـە ئاشـکرا دیـار بـوو، لـە کـاتی داگـیرکردنی هـەر شـوێنێکدا، بـە پەیڕەوی لە پیشەی هەمیشەیی کوردەکان پێش هەموو شتێك دەستیان بە تالان کردنـی دانیشتوان دەکرد، وەك چۆن لـە کـاتی گرتنـی خـەرپوت دا، تەنانـەت هێرشـیان کردبـوە سـەر پـەناگای هـەتیوەکان ئیـتر باسـی دوکـان و فرۆشـگاکان هـەر نـاکرێت. لـە ئـەنجامدا دانیشتوانی شار کە لە سەرەتادا بە باشی دەیانڕوانییە راپـەڕیوەکان، پـاش دوو سـێ ڕۆژ لەبـەر تـالانکردن هەلوەشـانەوەو خـەرپوت لـە لایـەن هێزەکـانی دەولەتـەوە گیرایـەوەو راپەڕیو ەکان تێکشکان، دانیشتووانی شار کە تـالان کرابـوون ڕۆلێکـی گـەورەیان بێنـی لـە دەرکردن و ڕاونانی راپەڕیوەکاندا.

هەولدانی هەندێ شێخ و کەسی زانا و تێگەیشتوو بۆ ڕێگرتـن لـە تـالان کـردن بـێ کەلك بوو، هەروەها دەستوورە تایبەتییەکانی شێخ سەعید بۆ دەست درێـژ نـەکردن بـۆ سەر و سامانی خەلك هیچ سوودێکی نـەبوو. ئـەو عەشـایرە راپەڕیوانـە هـەر شـتێکیان بەر دەست بکەوتایە لە ڕێگایـاندا دەیانـبرد یـا دەیـان شـکاند، ئەمـە وای لـە دانیشـتوانی شار کرد کە ناچار بن بە چەك ڕوو بە ڕوویان ببنەوە. ئەنجامی ئـەم هەلسوکەوتانەش ئـــەوە بـــوو ئـــەو شـــوێنانەی کـــە لـــە لایـــەن راپەڕیوەکانـــەوە گـــەمارۆ درابـــوون، دانیشـتووان سـەربەخۆ دەسـتەی چـەکداریان پێکدەهێنـا بـۆ ئـەوەی ڕێگـای هاتنـە نـاو گوندەکانیان لـێ بگرن.

دەنگوباسی رەفتار و زۆرداریی راپەڕیوەکان لە هـەموو ناوچـەکاندا بـلاو بوویـەوە، هەر لەبەر ئەوە بوو، کاتێك شێخ سەعید بە پێنج هەزار چەکدارەوە هێرشی کردە سەر دیاربەکر، تووشی شکستێکی گەورە بوون. دانیشتووانی شار ڕۆلێکی گـەورەیان گـێڕا لـە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەل ڕاپـەڕیوەکاندا، تـەنیا لـە چـەند گـەرەکێکی دیـار بـەکر و لـە

وارتا نەبێت کە هاوکاری شێخیان د ەکرد لە شەڕەکەدا و ئەوانەش ئەوەندە زۆر نەبوون، ئیتر لە شوێنەکانی تر هاوکارییان نەئەکردن.

ئەم سەرنەکەوتنە ئاشکرایانەی ڕاپەڕیوەکان، بە تایبەتی کاتێکیش کە هێزەکانیان لە ناوچە کوردییەکانەوە دوور بوون کاریگەری هەبوو لەسەر ورەی عەشایرەکانی تری کورد کە هیوایان بەسەرکەوتنی ڕاپەڕینەکە هەبوو، لەبەر ئەوە هەڵوێستێکی بێ لایەنەیان گرتەبەر. لە ئەنجامدا و بە دوای دەرکردنیان بەسەر شۆڕی لە خارپووت و ناوچە کوردنشینەکانی تر، شێخ سەعید و سەرکردەکانی تری کورد بە ناردنی بروسکە بۆ کەمال بەڵێنی وەفاداریی خۆیان دا بۆ کۆماری تورکیا و تەنانەت ئامادەیی خۆیان پێشاندا بوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو چەکدارانە کە هێشتا لە هەندێ شوێندا مابوون.

ئەو کوردانەی کە دوور بین بوون و پێش بینی سەرکوتکردنی توند و بێ بەزەییانەی ڕاپەڕینەکەیان کردبوو، بۆ خۆ دەرباز کردن و ڕزگار بوون لە تۆڵە سەندنەوەی ئەنکەرە، بە پەلە دوور کەوتنەوە لە ڕاپەڕینەکە، جگە لەوە کەسانێکی وەك ڕابەری گەورەی کورد نەجیب بەگ پەیوەندییان کرد بە ئەنکەرەوەو تەنانەت ڕۆژانی سەرەتای ڕاپەڕینەکە دژی شێخ سەعید وەستانەوەو بەرەنگاری چەکدارانەیان بوونەوە.

هێزی شێخە ڕاپەڕیوەکان بۆ خۆیان پێکیان هێنا بوون و سەرکەوتنەکانی سەرەتای ڕاپەڕینەکە کاتێك بوو کە دەستەکانی ژاندارم و هەروەها چەند تاقمی سەرباز لە ڕیزی جووڵانەوەکە دا بوون، پاش کشانەوەی ئەوانە ئیتر چالاکیی کاریگەرانەی خۆیان لە دەستدا و ئەوە بوو لە ناوەندی مانگی مارتدا بزووتنەوەکە بەرەو شکستێکی گەورە ڕۆیشت.

لە پێشان وترا کە لایەنە تورکییەکان پشتگیری ڕاپەڕینەکەیان نەکرد لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی دروشمەکان دژ بە تورکەکان بوون، ڕاستە بەرزکردنەوەی هەندێ دروشمی کۆنەپەرستانە، قەرەبووی ئەم کەم و کوڕییەیان کردەوە، بەڵام نەك بەو ڕادەیەی کە ئەوان یارمەتی ڕاپەڕینەکە بدەن، لە ئەنجامیشدا داردەستەی کۆنەپەرستان دەستیان بە دوورکەوتنەوە کرد لە ڕاپەڕینەکە. لە لایەکی ترەوە

چاپەمەنییەکان بە هەموو شـێوەیەك دوورە و پـەرێز بـوون لـە خسـتنە ڕووی دروشمـە ئایینـی‌یـەکان و هـەر دەیـان گـوت ڕاپەڕینەکـە بـە فیتـــی بێگانـــە ڕێکخـــراوەو هـــەر بـــۆ بەرژەوەندی ئەوانە و ئەو دروشمانەی ڕاپەڕیوەکان هەڵیان گرتووە دژی تورکیزمە، هەر لەبـەر ئـەم هۆیـەش هـێزە پێشـکەوتووەکانیش لـە ڕاپەڕینەکــە دوور کەوتنــەوە بــەڵام لەگـەڵ یـەك جیـاوازیدا، ئـەوان کــە بــە تــاکتیکی خۆیــان وەفــاداربوون و لــە پێنــاوی بەردەوامی بەرو پێش بردنی (لائینیزم)، هەوڵی ئـەوەیان دەدا دروشمـە کۆنەپەرسـتانە کانی شێخ سەعید بخەنە ڕوو، بەڵام سەرکردە پێشکەوتن خوازەکان لە ئیشکردندا پـاکی خۆیان دەنواند. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەلومەرجێکی وادا هـەر چەشـنە پشـتیوانییەك لـە ڕاپەڕینەکە کرا با، بیانووی دەدا بە دەستی کەمالەوە کە لە مێژ بوو بـۆ بیـانوو دەگـەڕا بـۆ ئـەوەی پێشـکەوتنخوازەکان سـەرکوت بکـا و دایـان بکوتـی بـە کۆڵەکــەدا. ڕێکخــراوە ناوەندییـەکانیش (سـەنتەرییەکان) کــە خۆیــان بــە بەرپرســی چــالاك کردنــی توێــژە نارازییـەکان دەزانـی لـە ژێـر پـەردەی یارمـەتیدانی ڕاپـەڕیوەکان کـە لـە هیـچ شــوێن و جێگایـەك نـەیانوێراو و نـەیانتوانی بیکـەن، تەنانــەت لـە کوسـتانینە پـول تـاك تـاك هـەبوون ئـەو جەسـارەتەیان بـە خـۆدا کـە لـە کـاتی ڕاپـەڕیندا دژی ئانکـەرە ڕاوەســتن. کۆنەپەرستانی تورکیا چارەنووسی خۆیان دابووە دەستی شێخ سەعیدی جیاخوازو ئـەم چارەنووسەش شکست هێنانە کۆتایی هات.

## لابردنی فه تحی بەگ و هاتنه سەر کاری عیسمەت پاشا

دەوڵەتی فەتحی بەگ لە سەرەتای راپەڕینەکەدا هەوڵی زۆری دا هەر چۆن بێت راپەڕینەکە داپۆشێت و لە گرنگییەکەی کەم بکاتەوە، بە پێچەوانەی باڵی چەپی پارتی گەلی کەمال کە لە چاپەمەنییە سەرەکی و رەسمییەکاندا راپەڕینەکەیان بە مەترسییەکی گەورە دەزانی و پێیان وا بوو کەسەرچاوەکەی دەبێ لەپەیوەندی لەگەڵ هێزە کۆنەپەرستەکانی سەرانسەری تورکیا بدۆزرێتەوەو لە ناو ببرێت. ئەوانە فەتحی بەگیان بەوە تاوانبار دەکرد کە پێشبینی راپەڕینەکەی نەکرد بوو، بەم هۆیەوە باڵی چەپی پارتی گەلی لە *1925/2/30*، راپەڕینەکەی شێخ سەعیدیان کرد بە بیانوو بۆ لەسەر کار لابردنی کابینەی فەتحی هەراو هۆریایەکیان بەرپا کرد و دەیانگوت کە فەتحی هیچ هەنگاوێکی توند و تیژ یا سەرکوتکەرانەی نەناوە دژی کۆنە پەرستان لەسەرانسەری وڵاتداو ئامادە نەبوە بەم ئەرکە هەستێت. بۆیە پارتی گەل، باڵی چەپی کەمالییەکان، پەرۆش و نیگەران بوون، فەتحی بەگ لە سەرەتای ڕۆژانی پەرەسەندنی جووڵانەوەکەوە کاتێك کە هێشتا بارودۆخەکە بەلایەکدا نەکەوتبوو، فەتحی دەیتوانی هەندێ هەنگاوی ساکار بنێ وەك وتووێژ لەگەڵ (پروگریسیستەکان) بۆ ئەوەی بەویستی خۆیان، خۆیان هەڵوەشێننەوە، لەم دوو ساڵەی دواییدا چاپەمەنییەکانی کوستانتینە پول ئویەرسیۆنەرەکان کە ڕەخنەیان دەگرت و دژایەتی باڵی چەپی پارتی گەلیان دەکرد زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن، کەمالییەکانیش تۆڵەی خۆیان سەندەوەو پاش لابردنی فەتحی بەگ هەموویان پێ داخستن، بەڵام فەتحی بەگ بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو هیچ هەنگاوێك بنێت بۆ تەنگە تاو کردنیان.

فەتحی بەگ لە سەرەك وەزیری لابراو عیسمەت پاشایان لە جێی ئەو دانا، عیسمەت سەرۆکی باڵی چەپی پارتی گەل بوو. فەتحی تەنیا ئەوەی بۆ مایەوە، وەك

باڵیۆزی تورکیا بچێت بۆ پاریس. عیسمەت بە هاتنە سەر حوکم رایگەیاند کە هەر شك و گومانێك لە پروکریسستەکان بکرێت بێ بەزەییانە سزا دەدرێن و هێرشی کردە سەر چاپەمەنییەکانی کوستانتینە پۆل و تۆمەتی ئەوەی دەدانە پاڵ کە ئەوانە هیوای کۆنەپەرستەکانی زیاتر کردووە بۆ روخاندنی دەوڵەتی ئانکارا. لە ئەنجامدا عیسمەت توانی بریارێك لە مەجلیسی تورکیا پەسەند بکات کە وەك یاسایەکی گشتی ڕێگای دابە دەوڵەت، کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی هەبێت بەرامبەر بە کەسانی دژ بە کۆمار بە توندی بجولێتەوە، پاش پەسەند کردنی ئەم یاسایە دوو دادگای سەر بەخۆ پێك هێنرا، ئۆرگانەکانی ئۆپۆزسیۆن لە کۆستەنتینەپول و هەرێمەکان داخران لە وانە ئۆرگانی پروگروسیستەکان (ئیستیقبال) لە تەرابزونە، جگە لە گرتن و تەسلیم کردنی دادگای چەند کۆنەپەرست و (کلیریکال) کە یەکێکیان ئەندامی پارتی پروگرسیست بوو.

مەبەستی سەرەکی عیسمەت لەو هەنگاوەی ئەوە بوو، لە لایەکەوە کۆنەپەرستان و ئۆپوزیسیون بترسێنێت و لە لایەکی ترەوە، بوونی یاسایەکە دژ بەوانەی دەیانەوێ بچووکترین پشتگیری لە ڕاپەڕیوەکان و کۆنەپەرستانی تورکیا بکەن، هەر هەوڵدانێك بوو سوود وەرگرتن لە ڕاپەڕینە وە لە دژایەتی کردنی سیستمی کۆماری و ئانکارا لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت، دەوڵەت بە هێزی چەك وەڵامی دەداتەوە، دادگا سەربەخۆکان دەسبەجێ نێردراون بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەڵات ڕۆڵێکی چالاکیان بینی و ڕۆڵی دادگای ئانکەرەیش ئەوە بوو کە بە پێی توانا ئەو سیاسەتە تۆقێنەرانە کەلە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن جێبەجێ بکات ئەم هەنگاوانەی عیسمەت بوونە هۆی تۆقینی کۆنەپەرستەکان و لە ترساندا خۆیان شاردەوەو بێدەنگ بوون.

سەبارەت بە هەڵوێستی سوپا بەرامبەر بەم ڕووداوانە، لە سەرەتادا وایان دەزانی کە تەنیا بەکارهێنانی ئەو هێزانەی کە لەناوچەکەدان دەتوانێت کۆنترۆڵی ڕاپەڕینەکە بکات و بەسەر شێخ سەعیددا زاڵ ببێت. بەڵام لەبەر بێ باوەڕی بە ژاندرمەی ناوچەکە، کە بەشێکیان چوو بوونە ریزی هێزەکانی شێخ سەعیدەوە، یاخود چەکیان پێدابوون، بەرە نگار بوونەوەی راپەڕینەکە خرابووە ئەستۆی کازم پاشای والی بەتلیس و فەرماندەی هێزی جێگری بە تلیس و پشکنەری سوپای سێهەمی تورکیا.

کازم پاشا دوو هێزی ئامادەکرد بۆ شەڕ دژی راپەڕیوەکان، یەکێکیان لە دۆڵی کەباسەوە کەوتەڕێ بە مەبەستی داگیرکردنی (لێجە)، بەڵام شێخ سەعید پێشتر ئەم دۆڵەی گرتبوو و لەبەر نەبوونی ڕێگایەکی تر هێزەکە بەرەو دوا گەڕایەوە،جگە لەوە لەوانەبوو پشت بەرە بکەوێتەبەر مەترسییەکی یەکجار گەورەوە.

هێزی دووهەم لە سەرەتادا هەندێ سەرکەوتنیان بە دەست هێناو تەنانەت لەماوەی چەند ڕۆژێکدا (پیر ان) یان گرت کە یەکێك بوو لە ناوەندی ڕاپەڕینەکە، بەڵام کە دەگەنە لای (خۆ) لە خوارەوەی پیران لە لایەن راپەڕیوەکانەوە گەمارۆ دەدرێن و پاش شەڕێکی کورت ناچار بەرەو دیار بەکر پاشەکشەدەکەن.

چاپەمەنییەکانی سووریا، لەو بارەوە دەنووسن کە (*500*) نەفەر لەو هێزە کە لە دانیشتووانی ناوچەکە بوون دەچنە ڕیزی راپەڕیوەکانەوەو لە کاتی هێرشکردندا هاواریان دەکرد: "بۆ خاتری موحەمەد خۆتان بدەن بە دەستەوە.

ئەم تێکشکانانەو پەرەسەندنی بزووتنەوەکە دەوڵەتی ناچار کرد پەنابەرێتەبەر هێرشی بەر بڵاو بۆ لەناوبردنی راپەڕینەکە، وەك لەسەرەوە باسکرا لە سەرەتادا بەرەنگار بوونەوەی ڕاپەڕینەکە خرابووە ئەستۆی ئەو هێزانەی کە لە ناوچەکەدا جێگیر بوون، لەوانە خۆبەخشەکانی دانیشتووی ناوچەکە و ئەو عەشایرانە کە لە مێژە وەفادار و هاوکاری دەوڵەتن، لەگەڵ چەند پلانی هەوایی. ئەرکی ئەم هێزانە تەنیا ناوەرۆکێکی پارێزگارانەیان هەبوو و بۆ ئەوە بوو ببنە کۆسپ وتەگەرە لە ڕێگای پێشکەوتنی هێزی راپەڕیوەکان تا هێزەکانی دەوڵەت دەگەنە ئەو شوێنانەی کە راپەڕیوەکانی لێبوو. ئەرکی فرۆکەکانیش بۆمباران کردنی شوێنی سەرهەڵداوەکان بوو بە مەبەستی ترسا ندن یا لەناوبردنی پێگەسەرەکییەکانیان. دەبێ ئەوەش بگوترێت کە تەسك کردنەوەی ناوچەی راپەڕینەکە بووە هۆی ئەوەی کە گەلێك لە شێخەکان چیتر پشتیوانی شێخ سەعید نەکەن و دانیشتوانی ناوچەکە ئەم ئەرکەیان بەجێ گەیاند. جگە لەوە دەوڵەت بانگەوازی دەرکرد بۆ هەندێ لە دانیشتوانی تورکیا کە بچنە ڕیزی سوپاوە، ستادی گشتی سوپای تورکیاش دەستی کرد بە گەمارۆدانی ناوچەی ڕاپەڕینەکە لە ناوچەی بەتلیس و هێزەکانی کازم پاشا لە ڕۆژئاوا جێگیر کران، لە باکوورەوە لە

ناوچەی خنیس ئەو هێزانەی کە لە ئەرزرۆم بوون فەرمانی دەسپێکردنی هێرشیان پێدرا، لە ڕۆژئاواوە بە هاتنی ئەو هێزانەی کە لە سیواس بوون پشت ئەستوورکران، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە ناوچەی هەرە گرنگەوە هەبوو واتە ناوچەی باشوور – ڕۆژهەڵات، ناردنی سوپا لە ڕێگای سووریاوە جێبەجێکرا بە پێی پەیمانی نێوان فەرەنسا- تورکیای ساڵی *921* کە بە ڕێککەوتنی ئەنکەرە ناسرا بوو.

وەك لە چاپەمەنییەکاندا باس دەکرێ، بەری باشوور – ڕۆژهەڵات زۆر گرنگ بوو، چونکە تەنیا لەو ڕێگایەوە دەکرا یارمەتی بنێردرێت واتە لە ڕێگای سوریا و ئالپووە. دەوڵەت رایگەیاند کە خەبات دژی راپەڕیوەکان زۆر بێ بەزەییانەو سەخت دەبێ.

راپەڕینەکە بێگومان ئەنجامێکی زۆر سەخت و گرانی بە دواوە بوو ئێستا لەبەر چاودایە، خەباتی چەکدارانە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات زیاتر ئەم ناوچانەی تووشی وێرانی و هەژاری کردووە. یەکەم هێز کە دەچنە دیار بەکر تەواوی گوندەکانیان وێران کرد. ناردنی هێزەکانی دەوڵەت بۆ ئەوێ چەند ملیۆنی تێچوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەت دەبێ یارمەتی ئەو شێخ و گوندنشینانە بدات کە پشتی دەوڵەتیان گرت و لەلایەن راپەڕیوەکانەوە زیانێکی زۆریان لێکەوت.

راپەڕینی کوردەکان کاریگەرییەکی خراپی هەبوو لەسەر باری نێو نەتەوەیی تورکیا، بە تایبەتی لە کێشەی مووسڵ و سووریادا، بەڵام دەبێ ئەنجامی باشیشی هەبێت، وەك ئێستا دەردەکەوێ، پێش هەموو شتێك لەبەرەو پێشەوە چوونی یا جێبەجێکردنی دروشمە ئابوورییەکان سەبارەت بە لە ناوبردنی دەسەڵاتی فیودالی – شێخی و توندو تیژ کردنی خەبات دژی کۆنەپەرستی و.. هتد.

"زاریای وەستوك" ئورگانێکی رەسمی پارتی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سوڤێت -بەلشەویك- بوو لە قەوقاز و لە شاری تیفلیس دەردەچوو، واتە بیرو بۆچوونی پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی یەکیەتی سۆڤێتی بەرامبەر بە رووداو و سیاسەتی دەرەوەی ئەو دەوڵەتەی بڵاو کردووەتەوە. وەك ئاشکرایە لە سۆڤێت چاپەمەنی نا دەوڵەتی و ناحیزبی، بە واتایەکی تر بێ لایەن یا ئازاد نەبوە تا بڵێین ئەوەی نووسراوە و بڵاوکراوەتەوە مەرج نییە گوزارشتی لە هەڵوێست و بیرو بۆچوونی دەوڵەت یا پارتی کۆمۆنیست کردبێت، ئەو نووسین و وتارانە بەبێ پەسەندکردن یا رەزامەندی دەزگاکانی کۆنترۆڵی یەکیەتی سۆڤێت بڵاو نەبوونەتەوە.

هەڵبژاردنی رۆژنامەی زاریا وەستۆك لە ناو چاپەمەنییەکانی تری یەکیەتیی سۆڤێتدا بە مەبەست نەبوەو وە نەبێ رۆژنامە و گۆڤارەکانی تری یەکیەتیی سۆڤێت هەڵوێستێکی تریا ن هەبوو بێت، یاخود لەسەر کێشەی کورد وەك ئەو رۆژنامەیە شتیان نەنووسیبێت، نا ئەو رۆژنامەیە لە قەوقاز، واتە لەو شوێنانەی کە کوردی تیا دەژین، یاخود لەو ناوچەیە کە دراوسێی کوردستانی ژێر دەستی تورکیا و ئێران بووە، چاپ و بڵاوکراوەتەوە، لە لایەکی ترەوە سیاسەتی کوردی یەکیەتی سۆڤێتی دەربڕیوە، ئەو دەوڵەتەی کە بانگەوازی برایەتی و پشتیوانی لە خەباتیگەلانی ژێر دەستی بۆ سەربەخۆیی ئەداو گەلی کوردیش لە ریزی ئەو گەلانەبوو کە بۆ رزگار بوون لە دەستی داگیرکەران راپەڕیبوو.

بەشێك لە کوردستان بە خاك و دانیشتوانیەوە کە لە چوار چێوەی یەکیەتیی سۆڤێت مابووەوە و لە نێوان ساڵەکانی *1923-1930* دا جۆرە کیان و قەوارەیەکیان پێدابوو وناوبانگی بە کوردستانی سوور دەرکرد و پاشان هەڵوەشێنرایەوە و دانیشتوانی دابەشکران بەسەر کۆمارەکانی یەکیەتیی سۆڤێتدا و دوور خرانەوەو کوردستانیان پێ چۆڵ کردن و ئازەری و ئەرمەنی یان هێنایە جێگایان و بوو بە دوژمنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە بەشەکانی تر، واتە بە پاڵپشتی ئەتاتورك و رەزا شا، بە کورتی لە باتی ئەوەی کە کوردستانی ژێر دەستی سۆڤێت ببوایەتە نموونەیەك بۆ پارچەکانی تر و کوردستانی سوور پێگە و پاڵپشتی بەشەکانی تر بوایا و کوردەکانی سۆڤێتی بۆ

یارمەتیدان هاندابا، دەبینین بۆ نموونە چۆن لەسەر ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید لە ساڵی *1925*دا کە ناوەڕۆکی بابەتەکەمانە هەوڵی لەناوبردنی داوەو چۆن ئەو شۆڕشەی چەواشە کردووە و چۆن بە گەلانی سۆڤێت و بە تایبەتی گەلی کورد لە سۆڤێتی ناساندووەو چۆن شەڕێکی ناڕەواو پڕوپاگەندەی دژی ئەو بزوتنەوەیە ڕاگەیاندووە.

سۆڤێت جگە لە شەڕی پڕوپاگەندە ڕاستەوخۆش لەسەرکوتکردنی ئەو شۆڕشە بە چەك و پارە و یارمەتیدانی ئابووری و سیاسی و دیپلۆماسی و بە هێرشی هەوایی دەستێکی باڵای هەبوەو بگرە دیاری کراویش. بەلشەویکەکان لەبەرەیەکی یەکگرتوودا لەگەڵ کەمالیستەکاندا بوون و بەلگەش لەم بارەوە یەکجار زۆرە و لەم بابەتەدا جگە لە نووسینەکانی زاریا وەستوك هەندێ بەلگە و دیکومینتی وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤێت (روسیای ئەمڕۆ) هەیە کە ئاراستە دەکرێن و لە هەندێکیاندا دەردەکەوێت کە چۆن کونسوڵ و سیخوڕ و دیپلۆماتەکانی سۆڤێت لە تورکیا لە ژێر پەردەی دۆستایەتی و پەیوەندی کردن بە لایەنی کوردییەوە ئەرکی دەزگا سەرکوتکەرەکانی تورکیایان لە کوردستاندا بەڕێوە بردووە، بەلگەکان هەندێکیان ئەو ڕاستییانە ناشارنەوە کە:

*1*-زۆر کەس و لایەنی کوردی هاندەدەن کە دژی دەوڵەتی دژی ئیمپریالیستی ئەتاتورك ئەجووڵێنەوەو پشتگیری شۆڕشەکە نەکەن.

*2* -بەهۆی ئەو کەس و لایەنانەوە دەنگوباسی کوردستان و چۆنیەتی بزووتنەوەکە لە لایەن دیپلۆمات و سیخوڕی سۆڤێتیەوە دەدرێتە ڕژێمی ئەتاتورك لێرەدا مەبەست ئەو سۆڤێتییانەیە کە لە کوردستانی بندەستی تورکدا بوون وەك کونسولەکانیان لە چەند شاری کوردستاندا.

*3*-ساردکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك لە پشتیوانی کردنی شۆڕشی شێخ سەعید، گوایا شێخ سەعید کابرایەکی کۆنە پەرست و داردەستی ئیمپریالیزمە.

فریودان و بەڵێندان بە لایەنی کوردی کە کۆماری نوێی تورکیا ئۆتۆنۆمی دەدات بە کوردان.

لە نووسینەکانی (زاریای وەستوك) کە زۆربەیان هەر هەمان نووسینەکانی ڕۆژنامە کەمالییەکانی تورکیایە، جاری وا هەیە ئەو درۆ و دەلەسانە و بەدناوکردنی شۆڕشەکە زیاتر و گەورەتر کردووە و پەیتا پەیتا لەسەرکەوتنی هێزە سەرکوتکەرەکانی تورکیا هەواڵ ئەدا.

بێشەرمی بەرێوەبەرانی ڕۆژنامەکە گەیشتبوە ڕادەیەك لە هیچ بوختان و سوکایەتی کردن بە کوردو بزوتنەوەکەی، خۆیان لانەداوە، ئەگەر بە وردی سەیری سەر دێڕ و وتار یا هەواڵەکان بکرێت ئەم دەستەواژانە بەرچاو دەکەن، "دژە شۆڕشییەکانی تورکیا" "فەناتیکەکان"، "خەباتگێڕانی ئایینی" ، "کۆنەپەرستە یاخی بووەکان"، "چەتە و باندو ڕێگر و هەلخەڵەتاوەکان"، "لایەنگرانی خەلیفە و سوڵتان"، "نۆکەرەکانی ئیمپریالیزم" یا لە دوو توێی وتارەکاندا هەندێ ڕستەی وەك "سەعید و کۆنەپەرستانی تر"، "فیودالە کوردەکان"، "بەپارەی بێگانەکان ئەو سەرهەڵدانە ڕێکخراوە".

هەروەها دەنووسێت، ئەم ڕاپەڕینە لە ژێر دروشمی سەربەخۆیی بۆ کوردستان یا ئۆتۆنۆمی دروستکراوە، لە لایەکی ترەوە دەڵێ بۆ گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەت یا دەمەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینی و لابردنی ڕژێمی دژە ئایینی کەمال، ئەم سەرهەڵدانە بەرژەوەندی دەوڵەتانی بێگانەی تێدایە و دەیانەوێ دەوڵەتێکی تری وەك عێراق دروست بکەن و دیاربەکر بکەنە پایتەختی ئەو دەوڵەتە، یاخود دەنووسێت "یەکیەتی کۆنەپەرستان لەگەڵ ئیمپریالیزمدا"، یاخود "باند یا چەتەکانی دژی شۆڕش" کە لە ناو کۆچەرە وەحشییەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا کە هاو سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئینگلیز، واتە کوردستانی باشوور لە مووسڵەوە دەستی پێکردووە و ڕاپەرینەکە هاوکات بووە لەگەڵ هاتنی کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) بۆ مووسڵ، کە ئەمە بۆ خۆی جارێکی تر دیمەنی ڕاستەقینەی ئەو ڕاپەڕینە نیشان دەدات، واتە بۆ ئەوەیە کە تورکیا سەرقاڵی ڕاپەڕینەکە بێت و ناچار ببێت دەست لە مووسڵ هەڵبگرێت و بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ ئینگلیزەکان. هەروەها دەڵێت هەموو ڕاپەڕینەکانی کورد بە هاندانی ئیمپریالیزم بووەو ئەم سەرهەڵدانەی ئەمڕۆش بۆ

خنکـاندنی شۆڕشـــی پێشـــکەوتووی تورکیـــا و کۆمـــاری لاوی تورکیایـــەو لـــە لایـــەن ئیمپریالیزمەوە ڕێکخراوە، بۆیە ئەمڕۆ چینی کرێکاری جیهان پشتگیری خـەباتی دژی ئیمپریالیزمی تورکیایە.

زاریا وەستۆك دەڵێ گـەرچی دەوڵـەتی تورکیـا لەسـەرکوتکردنی ئـەم ڕاپەڕینـە دوا کـەوت - دیـارە سـۆڤێت پێشـتر ئاگـای لـێ بـووە - بۆیـە بۆلشـەویکەکان داوای هـەنگاوی توندتر و بێ بەزەییانە تر دژی ڕاپەڕیوەکان دەکەن و داوا دەکـەن کـە نابـێ دەرفـەتیان پێ بدرێت.

لـــە ئیســـتەتێکی نووســـینی بەلشـــەویکەکاندا، گـــەلی کـــورد وەك گـــەلێکی دوا کەوتوو یا خێڵ و هۆزە کوێرەکان یا تاریکەکان" ، "کێوییەکان یـا کێونشـینەکان.. و دەبینرێت.

ئێمـە لـەم باسـەدا جارێ هـەر باسـی شۆڕشـی شـێخ سـەعید دەکـەین و هەڵوێسـتی سۆڤێتەکان بەرامبەر بەو شۆڕشە، بەڵام وەك بیر خسـتنەوەیەك ئامـاژە بـە دوو یـا سـێ نووسـینی زاریـا وەسـتۆك دەکـەین کـە پـەیوەندی بـە سمکـۆ و ڕاپـەڕینی کوردەکـانی ڕۆژهەڵاتـەوە هەیـە و دەنووسـێت کـە ڕاپـەڕینی کوردەکـانی ئـێرانیش بـە سـەرۆکایەتی سمکۆ هەر بەو دەستانە (واتە ئیمپریـالیزم ڕێکخـراوە کـە شۆڕشـی شـێخ سـەعیدیان لـە بـاکووری کوردسـتان ڕێکخسـت و ڕاپـەڕینی سمکۆ بـە درێـژە پێـدەری ڕاپـەڕینی شـێخ سەعید دەزانێت و بە ئەڵقەیەکی تری دادەنێ لە پیلانەکانی ئیمپریـالیزم، هـەروەها تـا پەیوەندی کردنی شێخ مەحموود بـە سۆڤێتەوە شۆڕشـەکەی کوردسـتانی باشووریشـیان بـە دەسـتکردی ئینگلیـز و دژی دەوڵـەتی تورکیـا زانیـــوە و بـــە پیلانێکیـــان دادەنـــا بـــۆ دروسـتکردنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ و دەســـەمۆی ئیمپریـالیزم کـە دژی سـۆڤێت و تورکیا دەبێت.

لە شوێنێکی تردا دەنووسێت: ئەو ئاگرەی کە ئینگلیزەکان لە کوردستانی تورکیا و ئـێران هـەڵیان گیرسـاندبوو، کڵپـەی گەیشـتووەتە ویلایـــەتی مووســـڵ و ئـــەم جـــارە لـــە کوردسـتانی باشـوور، ئاگرەکـە ڕووبـە ڕووی خۆیـان بوویـەوە -مەبەسـتی شـەڕی شـێخ مەحمووده لەگەڵ ئینگلیزەکان-.

زاریا وەستۆك ئەو بڕیارانەی كە دەوڵەتی توركیا داویەتی بۆ سەركوتكردنی بزووتنەوەی كورد و دەركردنی یاسای تایبەتی بۆ ناوچە كورد نشینەكان و ڕاپەڕیوەكان و دادگا تایبەتییەكان و گرتن و كوشتنی مەلا و شێخ و سەیید و پیاوی ئایینی و نیشتمان پەروەر و ئازادیخواز و خەڵكی بێ تاوان پەسەند دەكات و لە بری ئەوەی ڕەخنەیان لێ بگ رێت یاخود بێ لایەنانە وەك هەواڵ و دەنگوباس بڵاویان بكاتەوە، هەم پشتیوانییان لێدەكات و هەم چەپڵەیان بۆ لێ دەدات.

لێرەدا پێویست بە شیكردنەوەی ئەو بڕیار و یاسا فاشیستییانەی توركیا ناكا.

لە لایەكی ترەوە جێی سەر سوڕمانە كە زاریا وەستوك و چاپەمەنییەكانی تری بەڵشەویكەكان لەگەڵ كەمالیستەكان و دەزگای راگەیاندنیان، ڕەخنە و هێرشێكی زۆر دەكەنە سەر بەرهەڵستكارانیتوركیا، ژمارەیەك لەو چاپەمەنی و هێزە بەرهەڵستكارانەی (ئۆپۆزسیون) توركیا بەرامبەر بە شۆڕشەكەی شێخ سەعید یابێ دەنگن، یا جاروبار بێ لایەن و تەنا نەت هەندێ جاریش ڕەخنە یا داوای كەم كردنەوەو سووك كردنی سزای بەشداربووانی ڕاپەڕینەكە دەكەن.

بە گشتی بەلشەویكەكان وەك كەمالیستەكان دژی هەموو هێزێكی بەرهەڵستكار و ئۆپۆزیسیۆن و لیبرالی توركیا بوون، بەرە بەرە لە توركیا زۆربەی ئەو ڕۆژنامە وهێزە ئۆپۆزسیۆن و لیبرالانە، بە پارتی كۆمونیستی توركیاشەوە دادەخرێن و راوە كۆمۆنیستیش لە لایەن كەمالییەكانەوە دەست پێدەكات.

زاریا وەستوك كە باسی دادگاییكردنی شێخ سەعید وهاوڕێكانی دەكات بەبێ هیچ بەڵگەو سەرچاوەیەك، تەنانەت نالێت كە لە ڕۆژنامەكانی توركیاوە وەرگیراوە یا دەوڵەتی توركیا رایگەیاندووە، دەڵێ: شێخ سەعید لە دادگادا خۆی بە تاوانبار زانیوەو وتوویەتی راپەڕینەكە بۆ گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەت و سوڵتان و شەریعەت و... بووە، ئەم درۆ بێ شەرمانە كە كەس نە باوەڕیان پێ دەكات و نەفریوی كەس دەدەن، ئەم جۆرە بوختانانە هەر دەبێ لە هەمبانەی بەلشەویك و پان توركیستەكاندا هەبێت، زاریا وەستوك، هەروەها دەنووسێت كە شێخ سەعید دۆستی نزیكی سوڵتان عەبدولحەمیدەو لە شێخەكانی نەقشبەندییە و هەر كاتێك بیەوێ، بە هەر

بیانوویەکەوە بێت دەتوانێت هێزێکی زۆر لە مەلا و دەروێش و سەیید و.. لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، کارێکی لەو جۆرەش لە کۆمەڵگایەکی دوا کەوتووی وەك کوردستاندا شتێکی دژوار نییە.

هەر بە پێی نووسینەکانی زاریا وەستوك، ڕاپەڕینەکە دوانزە ویلایەتی ڕۆژهەڵاتی تورکیای گرتووەتەوەو ژمارەی چەکدار و شۆڕشگێڕ *5* تا *12* هەزار کەسن. باشە ئەم ڕۆژنامەیە لە خۆی ناپرسێت ئەوەندە دەروێش و مەلا و سەیید و دەرەبەگ لەکوێ پێکەوە کۆ دەبنەوەو ئەو دەروێش و شێخانە چۆن دەتوانن تەواوی دانیشتوانی کوردستان بە دوای خۆیاندا ڕاکێشن؟.

کابینەی سەرەك وەزیران فەتحی بەگ کە لە لایەن هێزە بە ناوچەپەکانی تورکیا و ئەوانەی سەربە سۆڤێت و هەروەها لە لایەن باڵی چەپی پارتی گەل و پان تورکیستە ڕەگەز پەرستەکانەوە، دەکەوێتە بەر لافاوی ڕەخنە بەوە تاوانبار دەکرێت کە هەڵوێستی توند و تیژی بەرامبەر بە ڕاپەڕیوەکان نەبوە، لە ئەنجامدا بە پاڵپشتی و خواستی بەلشەویکە کان لە کار دەکەوێت و گوایا باڵی چەپی ئەم پارتە (باڵە راستەکەی بە سەرۆکایەتی فەتحی بەگ بووە) بە سەرۆکایەتی عیسمەت پاشا دەسەڵات دەگرێتە دەست و بەلشەویکەکان پێشوازی لێدەکەن، سەرەنجام لە هیچ کردەوەیەکی دڕندانە و فاشییانە لە کوردستان دەست ناپارێزێت و لە لایەکی ترەوە دەست بە ڕاونانی کۆمۆنیستەکان دەکات و بەم چەشنە هەڵوێستی نا دۆستانەی خۆی بەرامبەر بە بەلشەویکەکانی روسیا دەردەبڕێت. ئینجا سۆڤێت نە رووی هەیە باسی ئەو کردەوانە بکات و نە دەسەڵاتیشی دەبێ بۆ بەرگری کردن لێی.

وەك لە ڕووداوەکانی دواتردا دەرکەوت، پاش هەر سەرکوتکردنێکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا بوو بێت، لێدانی پارتە کۆمۆنیستەکان و هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئەو وڵاتانەی بە دواوە بووە. بۆ نموونە پاش شۆڕشی سمکۆ، پاش کۆماری مەهاباد، پاش شۆڕشی ئیسلامی ساڵی *1979*ی ئێرانی، هەروەها پاش سەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەو ڕاپەڕینێك لە عێراقدا کۆمۆنیستەکان پرژی ئاگری تۆڵە سەندنەوەیان بەرکەوتووە.

زاریاوەستوك 27ی فیورالی 1925

## را پەڕینی فەناتیکەکانی ( خورافییەکانی ) تورکیا
## بە پارەی بێگانەکان
## کوستانتینە پول -ئەستەنبوڵ- 1925/2/26.

لەویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا، ڕاپـەڕینێك سـەری هـەڵداوە، شـێخ سـەعید سـەرکردەی ڕاپەڕینەکەیـە. ڕاپەڕینەکـە لـە ژێـر دروشمـی پێکهێنانی دەوڵـەتی کـوردی وسەقامگیرکردنی خەلافەت دەستی پێکرد، هەروەها بەمەبەستی گۆڕینی ڕژێمی سیاسی ودانانی ڕژێمێك لە سەر بناغەی شەریعەت و لابردنی کابینەی ئاتـە ئیستی (بێ دینـی) عیلمـانی کەمالـە، ڕاپەڕینەکـە، کـە بـە تێکهـەڵچوونی ژمارەیـەك لـە دانیشـتووان لەگـەڵ ژاندارمەکان دەستی پێکرد، یانزە ڕۆژە درێژەی هەیە و چـوار ویلایـەتی گرتـووە وە کـە ژمارەی دانیشتوانیان شەست هەزار کەسە، ناوچـەی ڕاپەڕینەکـە نزیکیشـاخەکانی دیـار بەکرن.

## دەوڵەتی تورکیا سوپا دەنێرێت بۆ سەرکوتکردنی ڕا پەڕینەکە

لـە دوانـزە ویلایـەتی ڕۆژهــەڵاتی تورکیــا بــارودۆخی تایبــەتی ڕاگەیــەنراوە. لــە مەجلیسـی تورکیـا فـەتحی بـەگ ئـەم ڕاپەڕینـەی بـە ڕاپـەڕینێکی ئـایینی فـەناتێکی لـە قەڵەمداوە. هەندێك لە نوێنەرانی مەجلیس لە وەڵامی وتەکانی فەتحی بەگدا وتیان کە ڕاپەڕینەکە نـاوەڕۆکێکی سیاسـی هەیـە و ئـەنجامی سیاسـەتی سـەرنەکەوتووی نـاوخۆی دەوڵەت و لێنەهاتوویی بەڕێوە بەرانی ناوچەکانە.

کابینەی دەوڵەت بە سەرۆکایەتی کەمال لەم بارەوە کۆ بووەتـەوە. وەزیـری نـاوخۆ ڕایگەیاند کە بزووتنەوەکە لـە لایـەن دەوڵەتـە بێگانەکانـەوە، پشـتیوانی لێدەکرێـت کـە بەرژەوەندییان لە دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆی وەك عێراقدا هەیە.

ئانکـارا سـەبارەت بـەم ڕووداوانـە بێدەنـگ بـووەو پـاش تێپـەڕبوونی یـانزە ڕۆژ ئاشـکرای کـردووە. هـۆی کۆمەڵایـەتی بزووتنەوەکـە نـاڕەزایی ناوچـەکانی ڕۆژهەڵاتـە بەرامبـەر سیاسـەتی دەوڵـەتی کـەمال ڕۆژنامـەکانی ئەسـتەنبول بـە ئاشـکرا ڕۆیشـتنی کوتوپڕی عیسمەت پاشا لە ئانکاراوە باسدەکەن.

## بزووتنەوەی ڕا پەڕیوەکان

ئـەم بزووتنەوەیـە شـتێکی گرنـگ وجـددی ئاشـکرا کـرد. دەرکـەوت کـە رابـەری ڕاپـەڕیوەکان: شـێخ سـەعید و هاوکارەکـانی بـە هـاندانی بێگانـەکان جووڵاونەتـەوە. ڕۆژنامەکان ئەوەیان خستووەتە ڕوو کـە لـە نـاو ڕێکخـەرانی ڕاپەڕینەکـەدا لایـەنگرانی سوڵتانیش هەن. شێخ سەعید بە شـێوەیەکی چاوەڕوان نـەکراو و بـە هـێزێکی زۆرەوە، شا ری گەورەی (گەنجە)ی گرتووەو هێزێکی تریش بەرەو شاری دیاربەکر کەوتووەتە ڕێ و هێزێکیش بەرەو شاری (ئارگاکی).

دەوڵەتی تورکیا لە مەجلیس ئەم ڕاگەیاندنەی بڵاوکردووەتەوە:

ڕاپەڕینی چەکدارانە دژی هێزەکانی دەوڵەت کە لە ئارگاکەوە دەسـتی پـێ کـرد بـۆ ویلایەتەکانی دیاربەکر و خـارپوت و گەنجـە پـەرەی سـەندووە و دەرکـەوتووە کـە دوور نییـە لـە ویلایەتـەکانی تریـش بـڵاو بێتـەوە، دەوڵـەت لـەو ویلایەتانـەی کـە ڕاپـەڕیون بـارودۆخێکی تایبـەتی ڕاگـەیاندووەو گـەمارۆی داون و لـە مـەجلیس داوا دەکـات ئـەم هەنگاوانـەی دەوڵـەت پەسـەند بکا. بـە پێـی ڕاگـەیاندنی (ڕۆیتـەر) لـە ئەسـتەنبوڵەوە، پارتی گەل پێشنیارەکەی دەوڵەتی پەسەند کردووە سەبارەت بـە ڕووبـە ڕوو بوونـەوەی بزوتنەوەکـە لـە ناوچـە کـورد نشـینەکان و بڕیـارێکی پەسـەند کـردووە کـە پێویسـتە

راپـەڕینی کوردەکـان بەشـێوەیەکی بـێ بەزەییانـە سـەرکوت بکرێـت، جگـە لـەوە پـارتی پێشنیار دەکات کە یاسای پەیوەند بە خیانەتکردن لە دەوڵـەت بگۆڕدرێـت و سـزای ئـەو کەسانە بدات کە بۆ گەیشتن بە مەبەست کەڵك لە ئایین وەردەگرن.

## هۆکانی ڕا پەڕین لە تورکیا

**مۆسکۆ** *1925/2/26.*

ڕۆژنامـــەی براڤـــدا وتـــارێکی بڵاوکردووەتـــەوە کـــە هـــاوڕێ راســـکولنیکوف نووسـیویەتیتیایدا هـاتووە: "ئێسـتا تەلگرافـەکان سـەبارەت بـە ڕاپـەڕینێکی تـری کۆنەپەرسـتانی تورکیـا هـەواڵ ئـەدەن و ڕادەگەیـەنن کـە دەیانـەوێ بـە هاوکـاری ئیمپریالیستەکان بزووتنەوەی نەتەوایەتی شۆڕشگێڕانەی تورکیا کە وەستانی بـۆ نییـە تێك بشکێنێت لەم دواییە لە تەواوی تورکیـادا ئـەم ئۆپۆزسـیۆنە کۆنەپەرسـتە بـەرچاو دەکەوێت. ڕێکەوت نییە کە ڕاپـەڕین لـە ناوچـەکانی ڕاپـەڕین سـەری هـەڵداوە، چونکـە فیوداڵ و خاوەن زەوییە گەورەکان لەوێ مۆڵیان داوە. ڕۆڵی پیاوە ئایینییەکان لەوێ بـە هێزە کە زۆر جار مەلا کۆنەپەرستەکانیان وەك نوێنەری خۆیـان ناردووەتـە مەجلیسـی تورکیـا. وەك ئەفغانسـتان ڕاپەڕینەکـە لـە لایـەن بـاندە (چەتـە) دژ بـە شۆڕشـەکانەوە پێکهاتووە. باندەکـان لـە نـاو خـەڵکی نـەزان و دوا کـەوتوو کۆچـەرە کێوییەکانـەوە راسـتەوخۆ لەگـەڵ ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ئینگلیـس هاوسـنوورن و سـەرەتاکەی لـە نزیك ناوچەکانی سەر سنووری موسڵەوە دەستی پێکردووە.

هێزی ڕاپەریوەکان دەگاتە پێنج هەزار نەفەر. ئەوەش دەبێ لەبەرچاو نەکەین کە هەموو کوردێك هەر لە منداڵییەوە هیچ کـاتێك لـە چـەك و تفـەنگ دوور ناکەوێتـەوە، ژمـارەی شـەڕکەرەکان لەوانەیـە لـە ماوەیـەکی کـەمدا زۆر زیـاد بکـات. پێویسـت بـە بـیر هێنانەوەیە، کە کاتی ڕاپەڕینەکە هاوکات بووە لەگـەڵ سـەردانی نوێنـەرانی "کۆمەڵەی

نەتــەوەکان" بــۆ مووســڵ، ئەمـــەش ڕووناکییـــەکی تـــرە لەســـەر ڕاســـتی مەبەســـتی ڕاپەڕینەکە.

ڕۆژنامەکانی تورکیا بە تەواوی ڕاست دەڵێن کە ڕاپەڕینەکە بە فیت و هاندانی ئینگلــیز و پشــتگیریی فیـــوداڵ و فەناتیکـــە موســـڵمانەکانە و ئینگلیزەکـــان ئـــەم بزووتنەوەیان دروست کردووە و بە تەلیس و گونیە پارەی ئەوان پشـتیوانی لێدەکرێت و یارمەتی دەدرێت.

دەوڵەتی تورکیای تازە، بەرهەمی بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازە و ڕاپەڕینەکە لە لایەن ئیمپریالیزمی ئینگلیزەوە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێك خراوەو دەیەوێت ئەم بزووتنەوە پێشکەوتنخوازە بخنکێنێت، بۆیە چینی کرێکاری دنیا لەم خەباتەدا لە ڕیزی دەوڵەتی ئانکارا رادەوەستێت و بە ئاگر و شمشێر دژی ئیمپریالیزمی چەوسێنەری جیهانی پشتی شۆڕشی نەتەوایەتی تورکیا دەگرێت.

## قۆناخی دژواری شۆڕشی تورکیا

## زاریا وەستوك- *925/2/28.*

ڕۆژنامــەی حاكمییــەتی میللــی ســەبارەت بــە ڕاپــەڕێنی كوردەكــان دەنووســێت: ڕاپەڕینی گەنجە یەكێكە لە قۆناخە دژوارەكانی شۆڕشی تورکیا و ئـەوە دەردەخـات كـە شـۆڕش هێشــتا زۆری مــاوە بــە ئــەنجامی خــۆی بگــات. كەمتەرخــەمی بەرامبــەر بــە كۆنەپەرســتان دەبێتــە هــۆی پــەلاماری بــەربلاویان بــۆ ســەر شــۆڕش. گــەرچی دەوڵــەت هــەنگاوی بــۆ بەرەبــەركانێ دژی شــۆڕش هــەلگرتووە، بــەڵام لــەم كــارەیدا دواكــەوتووە پێویستە هەنگاوی خێراتر و كاریگەرانەتر هەڵگرێت و....

## بارودۆخەكە زۆر جیددییە. *3/5* – زاریا وەستوك.

ئانكارا. سەرەڕای هەندێ سەركەوتن كە دانیشتووانی خارپوت و گیگی لـە خـەبات دژی ڕاپەڕیوەكان وە دەستیان هێناوە، بەڵام ئەمـە بنچینەیـەك نییـە بـۆ خـۆش بینیـی سەبارەت بە بارودۆخەكە، چونكە ڕەوتی ڕووداوەكان هەروا ئاڵۆزن. فـەرمانڕەوای (والی) پێشووی مووسڵ، نەزیف پاشا بە ڕۆژنامەكانی وتووە كە ڕاپەڕینەكـە لـە ئەسـتەنبوڵەوە ڕێكخراوە، لەبەر ئەوە ڕاپـەڕیوەكان هـەموویان لایـەنگری سـەربەخۆیی كوردسـتان نـین چونكە لە ناویاندا تورك لە كورد زیاترن.

## لاچوونی فە تحی بەگ *925/3/5*

لە كۆبوونەوەی پارتی گەل، زۆر بـە توندیـی ڕەخنـە گیراوە لـە كـارو كردەوەكـانی فەتحی بــەگ و بـەوە تاوانبـار كـراوە كـە لـە دژی ڕاپـەڕیوەكان جیـددی نـەبووەو داوایـان لێكـردووە بـۆ ئارامكردنـەوەی وڵات هـەنگاوی تونـد و تۆڵـتر هـەڵبگرێت، لــە دەنگدانــی

پێشوودا بۆچوونی باڵی چەپی پارتی گەل کە فەتحی بەگ سەرۆکایەتی دەکات، سەرکەوت کەبە دوای ئەمەدا فەتحی بەگ داوای خۆکێشانەوەی لە سەرۆك کۆمار کردو ئەوە بوو کە کۆبوونەوەی گشتی داوای لە فەتحی بەگ کرد بەشێوەیەکی کاتی سەرکردایەتی کابینەی وەزیران بکات. ئێستا لەوانەیە سەرکردایەتی کابینەی نوێ بدرێتە عیسمەت پاشا و رەجی بەگ بکرێتە وەزیری ناوخۆ و وەزیری بەرگری کازم پاشا و وەزیرانی تری کابینەی عیسمەت لە کاتی خۆیدا دیاری دەکرێن.

زاریا وەستوك لە ڕۆژی *925/3/3* بەپێی هەواڵی گەیشتوو لە ئەستەنبولەوە دەنووسێت کە کەوتنی کابینەی فەتحی و هاتنە سەر کاری عیسمەت مانای ئەوەیە سانسۆر و داخستنی چاپەمەنییەکان و ڕاوەدوونانی بەرهەڵستکاران، هەروەها گەمارۆ و گوشار و بارودۆخی تایبەتی لەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵات زیاتر دەبێت.

## زاریا وەستوك *925/3/3* سەندیل کوردی و مەلا سەلیم

بەپێی هەواڵی گەیشتوو سەرکردەی راپەڕینی کوردی دژ بە تورکیا، مەلا سەندیل کوردییە، ئەم مەلایە کە یەکەمجارە دژی تورکیا راوەستاوە تەمەنی پەنجا ساڵە و ناوبانگی بە قسەکەرێکی باش و لێهاتوو دەرکردووە، ناوبراو خوێندنی لە مەدرەسەی ئایینی کوردستان تەواو کردووە و بۆ خۆی لە گوندێکی ناوچەی وان لە دایك بووە. پارتی "یەکیەتی و پێشکەوتن" الاتحاد و الترقی - لە کاتی خۆیدا لە توانای قسەکردن وزانایی ئەو کەڵکی وەرگرت وپشتیوانییەکی زۆری لێکرد. ناوبراو، بە تایبەت لە نێوان ساڵانی *1910-1911* دا، خزمەتێکی باشی ئەم پارتەی کرد، بەڵام تا دەست پێکردنی شەڕ ناوبانگێکی وای نەبوو. لە ساڵی *1916* سەندیل کوردی لە پاراستن و بەرگری کردن لە شاری بەتلیس بەرامبەر بە سوپای روسیا بەشداری کردووەو بەوتار و خوتبەکانی خۆی دانیشتووانی ناوچەکەی دژی رووسەکان هاندەدا. کاتێ شارەکە لە لایەن رووسەکانەوە گیرا، گرتیان وناردیانە پشت بەرەی رووسەکانەوە.

راپەڕینی ئیستای وی دژی موستەفا کەمال لەبەر ئەوەیـە کەپـەیوەندی بـە تورکـە گەنجەکانەوە هەیە و ئێستا ئەوانە لە بەرەی ئۆپۆزسیوندان.

هەڵەیـەکی تـەواوە ئەگـەر بگوترێـت سـەندیل کـوردی دەورێکـی هـەبووبێت لـە شۆڕشی ساڵی *1914* دا، وا دیارە ناوی وی لەگەڵ مەلا سەلیم بەهەڵە وەرگیراوە یا گۆڕاوە ئەوکاتـەی سـەندیل کـوردی وەفـاداری تورکیـا بـوو، بـەڵام ئـەوەی پـەیوەندی بـە مـەلا سـەلیمەوە هەیـە ئەوەیـە کـە دەوری ئـەو بـەم چەشـنە بـوو. نـاوبراو یـەکێك بـوو لـە ڕێکخەرانی ڕاپەڕینی *15*ی مارتی *1914* کە باشووری بە تلیس لـە دەسـتی راپـەڕیوەکاندا بوو، لەم شارەدا کونسوڵ خانەی یەکێك لـە وڵاتـانی بێگانـەی –واتـە رووسـیا- لێبـو، دوو هەزار نەفەر لە ڕاپەڕیوەکان ئەم شارەیان گرتبوو کاتێك کـە هـێزی پشـتیوانی لـەوان و موش دەوە دەگاتە یارمەتی لەشکری تورك، ڕاپەڕیوەکان دەشکێن و مەلا سەلیم بـە هـۆی کونسـوڵی روسـیاوە رزگـاری دەبێـت. مـەلا سـەلیم تـا راگـەیاندنی شـەڕ دژی روسـیا لـەو کونسـولخانەیەدا دەمێنێتـەوە، پـاش ئـەوەی کونسـوڵی روسـیا لـەوێ دەردەکرێـت مـەلا سەلیم دەکەوێتە دەستی دوژمنانی خۆی واتە دەوڵـەتی تورکیـا. نـاوبراو لەگـەڵ سـێزدە هاوڕێی خۆیدا هەڵدەواسرێ و لە گۆڕستانی بە تلیس دەنێژرێـن سـەندیل کـوردی هیـچ پەیوەندییەکی بە راپەڕینی مەلا سەلیمەوە نەبوە.

## زاریا وەستوك *925/3/6*.

## ئەو زیانەی لە ئە نجامی را پەڕینەکەوە بە دەوڵەت گەیشتووە.

ئانکارا، *3/30* – ڕۆژنامەی دەوڵەتی جومهورییەت دەنووسـێت کـە دەوڵـەتی تورکیـا بە هۆی ئەو ڕاپەڕینەوە، یەك ملیون فونتی تورکی زیانی لێکەوتووە جگە لە روخـاندن و کاولکردنی شوێنەکان لـە لایـەن راپەڕیوەکانـەوە، هـەروەها دابـەزینی فونتـی کاغـەزی تورکی بە دواوە بوو، ڕۆژنامەکە دەنووسێت ئـەو ڕاپەڕینـە دەبـێ بـە دەسـتێکی ئاسـنین سەرکوت بکرێت.

**زاریا وەستوك** *925/3/10*.

## ڕووداوەکانی تورکیا، فه تحی بەگ چۆن ڕۆیشت؟.
## ئانکارا.

بەپێی دوایین هەواڵ، لە کۆبوونەوەی پارتی گەل دا هەموو کردەوەکانی کابینەی فەتحی بەگ بە توندی ڕەخنەی لێگیراوە. ئەم کۆبوونەوەیە لە ژێر گوشاری نوێنەرانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات بەڕێوە چوو، ئەو نوێنەرانە زۆر بە توندی داوایان کردووە کە هەنگاوی توند و تیژ و بەوپەڕی بێ بەزەییانەوە دژی ڕاپەڕیوەکان بنرێت و ڕەخنەیان لەسەر کابینەی فەتحی بەگ ئەوە بوو کە گوتوویانە ئەو هەنگاوانەی ئەو ناویەتی جێی ڕەزامەندی نین.

فەتحی بەگ لە وەلامی ئەم ڕەخنەو پرسیارانەدا دەڵێ: کە بارودۆخەکە هێندە جێگای مەترسی نەبوە کە هەنگاوی توند و تیژ بنرێت. ناوبراو گوتی: ئەگەر لایەنگرانی توند و تیژی گوشار بخەنە سەری کابینەکەی خۆی لە کار ئەکشێتەوە. زۆربەی بەشداربوانی کۆبوونەوەکە لەگەڵ بۆچوونەکەی فەتحی بەگدا نەبوون و ئەوە بوو کە فەتحی بەگ خۆی لە کارکێشایەوە.

وا بلاوە کە پارتی پێشکەوتن بە تایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەلات پڕوپاگەندەی ئایینی دەکات، کوڕی سەرکردەی ڕاپەڕینەکە واتە شێخ سەعید ماوەیەك لەمەوبەر هاتووەتە ئەستەنبووڵ و لەگەڵ ئەندامانی پێشکەوتندا چاوپێکەوتنی هەبوە، ڕابەری پارتی پێشکەوتن بە توندی ئەم هەواڵەی بە درۆ خستەوەو گوتی پڕ و پاگەندەی وا پێچەوانەی بەرنامەی پارتەکەیەتی.

**زاریا وەستوک** *925/3/10.*

**یاسای پاراستنی هێمنایەتی.**

**ئەستەنبووڵ** *925/3/7.*

مەجلیسی تورکیا یاسایەکی پەسەند کرد سەبارەت بە پاراستنی هێمنایەتی، بە پێی ئەو یاسایە، دەوڵەت بڕیاری داوە، بزووتنەوە کۆنەپەرستانەکەی کوردەکان سەرکوت بکات و تاونبارەکان بدرێنە "دادگای سەربەخۆ" کە بۆ ئەم مەبەستە دانراوە و دوو دادگان، یەکێکیان لە ئەنقەرەو ئەویتریان لە ناوچەی راپەڕینەکەیە. راجی بەگ وەزیری بەرگری نیشتمانی سەبارەت بە دانانی ئەم یاسایە لە مەجلیس رای گەیاند: ئەم یاسایە بە هۆی گوشاری چاپەمەنییەکان لە سەرمان، دانراوە کە بە وتار و راگەیاندنەکانیان یارمەتی راپەڕینەکەی رۆژهەلاتیان داوە، ئێمە دەمانەوێ ئەم هێلانە مارە تێکبدەین. کازم قەرەبەکر کە یەکێکە لە سەرکردەکانی پارتی کۆماری لە وەڵامی راجی بەگ دا گوتی: چاپەمەنییەکان گوزارشت لە بیرو ڕای تەواوی گەل دەکەن.

**بانگەوازی کەمال پاشا**

**ئەنقەرە** *925/3/8*

کەمال پاشا لە بانگەوازێکدا داوای لە دانیشتووانی تورکیا و سوپای تورکیا و فەرمانبەرانی دەوڵەتی کرد و گوتی: راپەڕینەکە لە ژێر پەردەی ئاییندا بەرێوە دەچێت، بەڵام مەبەستی دژە شۆڕشانەی هەیە و کۆسپێکە لەبەردەم کارەکانی دەوڵەتدا بۆ سەقامگیرکردنی ئاسایش و ئاشتی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و پێشخستنی باری ئابووری. لەبەرئەوە پێویستە مەجلیس و دەوڵەت و سوپا و ژاندار مری و پۆلیس و

دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی ئەرکی خۆیان بـەجێ بگەیـەنن و یارمـەتی دەوڵـەت بـدەن و دەستور و بڕیارەکانی دەوڵەت بۆ لەناوبردنی بززوتنەوەکە جێ بەجێ بکەن.

## داخستنی چاپەمەنییەکان

### ئەستەنبوول – *925/3/8*

دەوڵـەتی تورکیـا بـەپێی یاسـای پاراسـتن، ئـەم ڕۆژنامانـەی داخسـت: "تـەوحید ئـەفکار" ، "سـەبیلیا دیشـاد"، "ئیسـتیقبال" و "سـون تیلگـراف" هـەروەها ڕۆژنامـە کۆمۆنیستییەکانی "ئوگا" و "چیکبچ".

بەپێی هەواڵی گەیشتوو لە (نۆ)ی مارتەوە لە ئەنکـەرە راپـەڕیوەکان دەیانـەوێ لـە بـاکووری دیاربـەکرەوە هێرشـی خۆیـان درێـژە پـێ بـدەن، بـەڵام لەگـەڵ سـوپای تورکیـا تووشی پێکدادان هاتوون.

## زاریا وەستووک *925/3/14*

## یەکیەتی سوڤیت و تورکیا

### ئانکارا *13*/ی مارت.

"حاکمییـەتی میللـی" ئورگـانی رەسمـی دەوڵـەتی تورکیـا لــە وتـارێکی سـەرەکیدا دەنووسێت: دۆستایەتی و بەردەوام بوونی، بناغەی سەرەکی نێوان ئەو دەوڵەتانەیـە کـە هەسـت و ئـارەزووی گـەلانی خۆیـان دەزانـن و جێبـەجێی دەکــەن. ئـەم پەیوەندییانــە بەهۆی گۆڕانی سیستمی سیاسییەوە لاواز و خەوشدار نابن. پەیوەندی دیپلۆماتی نێوان گەلانی تورکیا و رووسیا لەم کاتە گەورەیـە دایـە، هـەموو بزووتنەوەیـەکی دژی شـۆڕش کە لە یەکیـەتی سـۆڤێت یـا لـە تورکیـا سـەرهەڵدەدا پەیوەندییـەکانی هـەردوو دەوڵـەت زیاتر بەهێز دەکات و دەبێتە هۆی سیمپاتی یەکتر بەرامبەر بە یـەك. ئاشـکرایە، ئێسـتا پەیوەندییەکی وا هەیە لە نێوان روسیای نوێ و تورکیـای نوێـدا کـە لـە کـاتی سیسـتمی

قەیسەری و خەلافەتدا نەبوە. هەردوو گەل هەست دەکەن کە ئەم پەیوەندییە نزیك و توند و تۆڵە بۆ بەرژەوەندی هەردوولا پێویستە.

ڕۆژنامەی (شیکا گوتریبون) دەنووسێت کە گوایا بولشەویکەکان بارودۆخێکی وەهایان لە ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلی دا پێکهێناوە و مەبەستیان ئەوەیە کۆسپێك لە نێوان تورکیا و قەفقاز دروست بکەن، بۆ ئەوەی ڕۆڵی تورکیا لەو ناوچەیەدا نەهێڵن. مەبەستی ئەو ڕۆژنامەیە و چاپەمەنییەکانی تر ئەوەیە کە نێوان تورکیا و یەکیەتی سۆڤێت تێك بدەن. شیکاگوتریبون دەیەوێ پەیوەندی نێوان دووگەلی مەزن تێکبدات کە گەورەترین ڕۆڵیان هەیە لە ڕۆژهەڵاتدا، کاربەدەستانی هەردوو دەوڵەت جگە لەو سیاسەتەی کە ئەمڕۆ گرتوویانەبەر، ناتوانن بیگۆڕن بە سیاسەتێکی تر و ئەم سیاسەتەی ئێستایان کە حەوت ساڵە بەردەوامە خزمەتی ئازادی و سەربەخۆیی هەردوولا دەکات، شیکاگوتریبیون دەبێ بزانێت کە گەلی تورکیا ئەو یارمەتی و خزمەتەی کە هاوسێ مەزنەکەی واتە یەکیەتی سۆڤێت نە تەنیا لەم سەردەمەدا کە کۆمارەکەمان بەهێز و لەسەر پێی خۆی راوەستاوە، بەڵکو لە رابوردوویشدا، کاتی خەبات بۆ سەربەخۆیی، کاتێك ئاگری شەڕ و ڕاپەڕین باڵی کێشابوو بەسەر وڵاتەکەدا، هەر بەردەوام بووە و سەبارەت بەم راپەڕینەی ئێستاش هاوهەستی خۆی نواندووە. دەوڵەتی یەکیەتی سۆڤێت باوەڕی تەواوی هەیە کە کۆماری نوێی تورکیا، هەرچۆنێك بێت ئەم دوژمنە کۆنەپەرستە لە ناو دەبات. ئێمە بۆ ئەم پەیوەندییانە رێز دادەنێین.

## زاریا وەستوك *1925/3/14*

## ناودار و گەورەکانی دژی شۆڕش

ئەو ڕاپەڕینەی کە ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا سەری هەڵداوە و چوار ویلایەتی گرتووەتەوە، لە ژێر دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەڕێوە دەچێت. ئەم دروشمە بۆ ڕاپەڕیوەکان بە ڕواڵەت زۆر جێی سەرنج راکێشانە. کوردەکان دەیانەوێ سەربەخۆبن و

بۆ ئەم مەبەستەش خەبات دەکەن، لەم بارەوە هیچ شتێکی دژ بە شۆڕش بە ئاشکرا بەدی ناکرێت. بەڵام ئەگەر بە وردی تەماشای ڕووداوەکان بکرێت بیرو بۆچوونەکان هەر لە یەکەم نیگاوە بە پێچەوانەوە دەگۆڕدرێن.

ئاغا و سەرکردەکانی ئەم ڕاپەڕینە، لە دەرخستن و ئاشکرا کردنی دیمەنی خۆیاندا پەلەیان کرد، لە بانگەوازێکدا کە دەریانکردووە، یەکێك لە خوێن ڕێژترین کوڕەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدیان داناوە بە پاشای کوردستان. جێی پێکەنینە کە کوڕی جەللادی کوردستان، کە بێگومان خۆیشی جەللاد و خوێن ڕێژە ببێتە رابەر و ئاڵا هەڵگری سەربەخۆیی وڵاتێك کە باوکی دەشت و شاخەکانی بە خوێنی گەلی کورد ڕەنگین کردووە.

بەرزکردنەوەی دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لێرەدا تەنیا تاکتیکێکە بۆ ڕاکێشانی کورد کە لە لایەن سەرکردەکانی ڕاپەڕینەکەوە بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆیان کەڵکی لێ وەردەگرن. بانگەوازی ئەوانە کە دەیانەوێ کوڕی دڕندەیەك وەك پاشایەك پێشکەشی گەلی کورد بکەن هیچ مانایەکی نییە و دەبێ ئەندامە چالاکەکانی کورد ئەوە بزانن کە ئەم بزوتنەوەیە هیچ شتێکی بۆ گەلی کورد لێناکەوێتەوە جگە لە قورسترکردنی زنجیری کۆیلایەتی و زێر و پارەی ئینگلیزەکانیشی پێوە هەڵدەواسن و بارمان زیاتر قورستر دەکات.

جێی پرسیارە ناوەڕۆکی ئەم بزووتنەوە چییە کە تەواوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیای گرتووەتەوە؟ لە بەرژەوەندی کێدایە و خزمەتی کێ دەکات؟

هیچ شك و گومان لەوەدا نییە کە ڕاپەڕینی ئەو باندانە (چەتە) هەمووی دژی ئەو کۆمارەیە کە گەلی تورکیا دایمەزراندووەو دژی سەربەخۆییەکەیەتی، دژی ئەو ڕژێمە نوێیەیە کە بە خوێنی گەلی تورکیا بەسەرۆکایەتی ڕێبەری پارتی گەل کەمال پاشا بە دەست هاتووە، تێگەیشتن لەم هەموو شتە کارێکی سەخت نییە. شۆڕشی تورکیا و ئەم شەڕەی دوایی کە بۆ سەربەخۆیی دژی هێرشکەرانی ئینگلیزی - یۆنانی، زیانێکی گەورە بگرە گیانکێشانی گەیاندە ئەو گروپانەی کۆمەڵگا کە کاتی خۆی سوڵتانی پیرو پەککەوتەو نەخۆشی تورکیا پێی گەیاندبوون.

شۆڕش یاسا و داب و نەریت و ژیانی دەرەبەگایەتی تورکیای تێکداو (نەك بە تەواوی) رژێمی كۆنی لەسەر كار لابرد و تورکیای نوێی دامەزراندو تورکیای سوڵتانی كردە كۆماریی كە پێشتر سوڵتان پارچە پارچەی كردبوو و دابوویە دەرەبەگەکان، ئێستا تورکیای نوێ بووەتە وڵاتێکی یەك پارچە و خاوەن دەوڵەتێکی ناوەندیی و بە ڕیفۆرم کردنێکی بەربڵاو بە تایبەت لە بواری کشتوکاڵدا وڵاتەکەی نوێ کردووەتەوە، هەموو ئەمانە زیانی بە باری ئابووری و كۆمەڵایەتی دەرەبەگەکان گەیاندووە و دەوری ئەوانی نەهێشتووە و ئێستا بوون یا نەمان و نەبوونی ئەوانی هێناوەتە کایەوە.

لە بارو دۆخێکی وادا دەرەبەگەکان ناتوانن نەچنە ڕێزی دوژمنانی تورکیای نوێوە و لە بوونی دەوڵەتی نوێدا دوژمنی سەرسەختی خۆیان دەبینن و ئامادەن هەموو شتێك بکەن بۆ لەناوبردن و گەڕاندنەوەی تورکیا بۆ بارودۆخی كۆن، واتە بۆ سەردەمی سوڵتان و کوێرەوەری، ئەو سەردەمە كە ژیانی ئەوانی دابین كردبوو. ئەم دارو دەستە كۆنەپەرستانەی سەدەکانی ناوەڕاست چ لە پایتەخت و چ لە ناوچەکاندا ئەمڕۆ هێرشیان هێناوەتە سەر تورکیای نوێ. ئەمانە کەسانێکی وەك نەورەس پالکوڤنیکی ستادی گشتی سوپای تورکیا و دەرەبەگە كورد و تورکەکانن كە سەرکردەیی سەربازی و ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینەکە دەکەن، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بۆچوونەکانی ئێمە. جگە لەوە بێ کەلتوورییەکی تەواو و نەزانی و دواکەوتوویی دانیشتوانی كورد باشترین زەمینەیە بۆ ئەوەی دەرەبەگەکان بە ناوی ئایینەوە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان سوود لەم بارە وەربگرن.

مەجلیسی تورکیا سەد جار مافی ئەوەی هەیە و ڕاستی كردووە كە لە *2|26* دا یاسای سزادانی خیانەتکارانی گۆڕی كە بە پێی ئەم یاسایە خیانەتکار هەموو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەکەڵك لە ئایین وەردەگرن بۆ گەیشتن بە مەبەستی سیاسی خۆیان. بورژواکانیش كە زیانیان لێ کەوتووە و تەنگیان پێ هەڵچنراوە لە مەجلیسی تورکیا دێنە قسە و لە بارو دۆخەکە کەڵك وەردەگرن دژی دەوڵەت دەجووڵێنەوە و بێگومان لە یارمەتیدانی ڕاپەڕیوەکان خۆیان دوور ناگرن. یەکگرتنی ئەم سێ لایەنە كۆنەپەرستەی تورکیا، واتە دەرەبەگەکان و پیاوانی ئایینی و لایەنگرانی سوڵتان و

بورژوازییـەت ئـەمڕۆ خۆیـان لـە سیمای شـێخ سـەعیدا دەرخسـتووە لــە کوردســتان و بوونەتـە بـرا، دەربـارەی هـەندێ کەسـی وەك پرۆفیسـۆر فـارس دەبـێ بگوترێـت کـە لـە زانسـتگای ئەسـتەمبووڵ مووچـەی کـەمی دەدرێتـێ، بۆیـە چووەتـە ڕیــزی ڕاپەڕینــەوە، لەوێ دەسکەوتی زۆرە و جێگایەکی تایبەتی بۆ خۆی دیاری کردووە، ناوبراو دەیەوێ بە بەشداریکردنی لە ڕاپەڕینەکەدا بەو پلـە و پایـە رووناکبیرییـەی خۆیـەوە بـەرگێکی تـر بکـا بــە بــەری راپەرینەکــەدا، کــە گوایــا پێشــکەوتنخوازە یــا باشــتر بڵێــین بــۆ پێشکەوتنخوازییە.

پاراسـتن و مانـەوەی تورکیــا بــەو شـێوەیەی ئێسـتا مەترسـییەکە بـۆ سیسـتمی کۆلۆنیالیسـتانەی ئینگلـیز و دەبێتـە نموونەیـەك بـۆ گـەلانی تـر. بۆیـە ئینگلیزەکــان و بۆرژوازییەت دەیانەوێ بە هەر شێوەیەك بووە تورکیـا وەك جـاران بەشـێوەیەکی نیـوە کۆیلایەتی بمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی لە ڕێگای تورکیاوە گەلانی تر بچەوسێننەوە، بـەڵام بەرژەوەندییەکانی ئینگلیس هـەر بـەوە کۆتـایی نایـەت. خـاوەن بانکـەکانی ئینگلـیز لـە تورکیا بەرژەوەندییان هەیە. سیاسەتی تورکیای کەمالی کۆسپێکە لەسـەر ڕێگـای بـازاڕی فرۆشـتنی شـتومەکی ئینگلـیز کـە هـەم زیانـە بـۆ بـۆرژوای بازرگـانی و هـەم بــۆ دراوی ئینگلـیزی و پیشەسـازی سـووك و بـورژوای بازرگـانی ئینگلـیز. ئەمـە جگـە لــەوەی کـە ئینگلیز لە تورکیا بەرژەوەندی نەوتی هەیە و نەوتی مووسڵ بـووە هـۆی پـەیدا بوونـی کێشە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا.

لای هەموان ئاشکرایە ئەو کێشە گەورەیەی نێوان ئەو دوو وڵاتە لە کـاتی پـەیمانی ئاشتی لۆزان کە تا ئێستاش بەردەوامە چارەســەر نــەکراوەو هەمووی‌شـی بـۆ ئەوەیـە کـە ئینگلیز دەیەوێ نەوتی مووسڵ کە دانیشتوانی کوردن بـۆ خـۆی بهێڵێتـەوە، هـەر بۆیـە بەشێوەیەکی تایبەت دەوڵەتی ئینگلـیز لـە پـەیمانی سـیڤەردا سـەربەخۆیی کوردسـتانی ڕاگەیاند، ئەمڕۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز لـە مووسـڵ کەوتووەتـە ئەسـتۆی کوردسـتان و دەبـێ پارێزگارییــان لێبکـات. هــەموو ئــەم بەرژەوەندییــە گرێدراوانــەی ئینگلیز وای لێکردووە کە سیاسەتی لاوازکردن و پارچە پارچە کردنی تورکیا (تەنانەت تا دەست پێکردنی شەڕی جیهانی ئیمپریالیستەکان) بگرێتـە بـەر و چالاکانـە بەشـداری

**شەڕەکان لە گۆڕەپانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکات و درێژە بە شەڕی تورکیا و یۆنان بدات و ئێستاش پاش شەڕی ئیمپریالیستی و بەگشتی بە هەموو شێوەیەك دەیەوێ تورکیا بکاتە کۆیلەی خۆی، لەم دواییانەدا بە هاتنی کەنسیرواتیفەکان بۆ سەر دەسەڵات بە چالاکانە دەجووڵێنەوە و تا ئێستا توانیویانە راپەڕینی کوردەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێك بخەن.**

**ئەم سیاسەتەی بورژوای ئینگلیز، ئەمڕۆ ڕێبەرانی بزووتنەوەی کوردی بە دەرەبەگ و پیاوە ئایینییەکانیەوە لەگەڵ بورژوازی تورکیا یەکیان بخات و دژی کەمال هانیان بدات. لێرەدا هیچ جێی سەرسوڕمان نییە ئەگەر کوردە راپەڕیوەکان جلوبەرگی سوپای بێگانەیان لەبەرکردووە و بە چەکی ئینگلیزی چەکدار کراون و بە پارەی ئەوانیش مووچەیان دابین دەکرێت.**

**بەم چەشنە کوردەکان لە راستیدا بۆ گەڕاندنەوە سیستمی کۆنی تورکیا شەڕ دەکەن و بۆ بەرژەوەندییە نەوتییەکانی ئینگلیز، بۆ کردنەوەی دەرگاکانی تورکیا بە رووی سەرمایە دارانی ئینگلیز و بۆ پاراستن و ڕاگرتنی ئیمپراتورییەتی کۆلۆنیالانەی ئینگلیز شەڕ دەکەن، کە ئەمانە بە بۆچوونی کوردەکان خۆیان کارێکی نا پەسەندە.**

**لە هەلومەرجێکی وا دا دەوڵەتی تورکیا مافی ئەوەی هەیە کە دووبارە بڕیار بدات هەنگا وی توند و بێ بەزەییانەتر دژی راپەڕیوەکان بنێت ئەگەر بیتو هێزێك خەریکی ئامادەکردنی راپەڕینێکی تری چەکدارانە بێت.**

**جگە لەوە بە پێی ئەو هەواڵانەی بە ئێمە گەیشتووە دەوڵەتی لاوی تورکیا زۆر بە باشی لە بارو دۆخە کە گەیشتووە وا دەزانێت کە راپەڕینی کوردستان رووداوێکی خۆیی یا ناوچەیی نییە، بەڵکو قورساییەکە بۆ هەموو تورکیا و چارە سەرکردنی کێشەی نێوان تورکیای کۆن و نوێیە.**

**بەڵام تورکیا سەد جار زیاتر مافی ئەوەی هەیە ئەگەر لەسەر کاغەزیش نەبێت بەڵکو بە وتەو کردەوە ڕاپەڕینەکە لەناو ببات، ئەوانەی دژی شۆڕشی تورکیا کاردەکەن پێویستە بێ بەزەییانە سەرکوت بکرێن و دەستی تۆڵە دەبێ تەواوی ئەو پاشماوە کۆنانە لەسەر خاکی تورکیا بسڕێتوە و لە هیچ شتێك سڵ نەکاتەوە. ناسیونالیستەکانی**

تورك دەبێ بزانن كە بەبێ تیروری بە كۆمەڵ و زۆر كە تەواوی دوژمنانی شۆڕش بهێنێتە لەرزە ئەم كارە ناكرێت و نابێ چاوپۆشی لە هیچ كەس بكرێت كە پەیوەندی هەبێت بە ڕاپەڕینەكەوە، تەنیا ئەو كۆچەرە ساویلكانە نەبێت كە لە لایەن سەركردەكانیانەوە خەڵەتێنراون و درۆیان لەگەڵدا كراوە.

بە هۆی دژایەتی و ململانێی نێوان بورژوای فەرانسە و ئینگلیزەوە دەوڵەتی فەرانسە بە پێی ڕاگەیاندنی "پتی پاریزین" ئامادە بووە ڕێگا بە لەشكری تورك بدات كە لە ناوچەكانی باكووری سووریاوە بچن بۆ سەركوتكردنی ڕاپەڕینەكە لە كوردستان. "ئێمە هیوادارین كە دەوڵەتی توركیا وەك پێویست كەڵك وەربگرێت لەو ناكۆكییەی نێوان فەرەنسا و ئینگلیز و بەزووترین كات بێ بەزەییانە و یەكسەر دەست بە كار بێت، ئەزموونی شۆڕشی ئێمە كردەوەی وای بە دروستی سەلماند".، بەڵام لەگەڵ هەنگاوی توند و تیژ و بێ بەزەییانەدا بەرامبەر بە دوژمنانی شۆڕش، دەوڵەتی توركیا دەبێ ئەوەندەش هەنگاوی توند هەڵنێ بۆ بەرگری كردن لەسەرهەڵدانی داهاتووی كوردەكان.

ئەو هۆیانەی كە كوردە كۆچەرەكانی خستووەتە باوەشی دوژمنانی شۆڕش و سیاسەتی بێگانەكانەوە زۆر ئاشكراو ڕوونن. دەوڵەتی توركیا كە دەستی داوەتە ریفۆرمی سیاسی زۆر جیددی نەبوە و چاوپۆشی لە هەندێ كێشە كردووە كە پەیو ەندییان هەیە بە ڕیفۆرمی زەوی و زار و باج و مالیاتەوە، تا ئێستا نە ڕیفۆرمی كشتوكاڵ و نە ڕیفۆرمی مالیاتی جێ بە جێ نەكردووە. بارودۆخی جوتیارانی توركیا بە تایبەتی جوتیارانی كوردستان زۆر خراپە و بووە بە هۆی بێزاری ئەوان و هەمیشە لە لایەن كۆنەپەرستانەوە كەڵكیان لێ وەردەگیرێت، تەنیا بە جێبەجێكردنی تەواوی ریفۆرم لە بواری زەوی و زار و دابەشكردنی زەوی و زاری دەرەبەگ و پیاوە ئایینییەكان بەسەر جوتیاراندا و نەهێشتنی باج و سەرانە و موڵكانە لەلایەن دەرەبەگەكانەوە، دەتوانێت باری ژیانی جوتیاران سووك بكات و لە باری سیاسییەوە ئەوانە بە لای دەوڵەتی نوێی توركیادا ڕابكێشرێن، دەوڵەت بەم هەنگاوانە دەتوانێت دوژمنانی شۆڕش بێ هێز بكات و سەرچاوەی ئابوورییان لێ وشك بكات.

چارەسەرکردنی کێشەی کوردیش بایەخێکی کەمتری نییە با دانیشتوانی کورد ئوتۆنۆمی خۆیان لە دەستی دەوڵەتی نوێی تورکیا وەربگرن نەك لەسەر دەستی ئینگلیز و کۆنەپەرستەکان، (چونکە ئۆتۆنۆمییەکەی ئەوان هیچ نییە و هەر لەسەر کاغەزە). بەم چەشنە دەوڵەتی کەمال نەك هەر تەنیا کۆتایی بە ئاوانتوری سیاسی لە داهاتوودا دێنێت، بەڵکو دانیشتوانی کورد دەبەستێتەوە بە تورکیای نوێوە و کوردەکان ئەو دەوڵەتە بە رزگارکەر سەیر دەکەن نەك بە چەوسێنەر. ئەزموونی رووسیا بۆ وێنە پەیوەندی بەرامبەر یەکی نێوان ئەبخازیا و جورجیا و ئاجارستان باشترین نیشاندەری ئەو وتەیەی سەرەوەیە.

بەم رێگایانە لەگەڵ سەرکوتکردنی بێ رەحمانەی دوژمنانی شۆڕش و بە گرتنە بەری سیاسەتێکی ژیرانە و مرۆڤانە بەرامبەر بە جوتیاران و دانیشتوانی کورد، دەوڵەتی کەمال دەتوانێت ئەو رێگایەی کە بۆ بنیادنانی تورکیای نوێ گرتوویەتە بەر تا کۆتایی ببڕێت و تەواوی بکات.

## زاریا وەستوك *1925/3/14.*

لە چوارەمین کۆنگرەی شووراکانی ناوچە لینینییەکان لەسەر ناوەڕۆکی بزووتنەوەی کورد لە تورکیا هاوڕێ چیچەرین وتی: ئێمە لێرە لە ناوچە لینینییەکان لەگەڵ گەلان و عەشیرەتی جۆراوجۆر و جیا دەژین و دەبینین کە چۆن دەسەڵاتی زەحمەتکێشان هاوبەشی و پەیوەندی باشی لە نێوانیاندا دروستکردووە و دەرفەتی پێکەوە کارکردنی پێداون. لە هەمان کاتدا ناتوانم باسی ئەوە نەکەم کە لە نێوان گەلانی جۆراوجۆری دانیشتووی ئەم ناوچەیەدا گەلی کورد هەیە و ناتوانم ئەوە نەڵێم کە زۆر باش بوو ئەگەر ئەو کوردانەی کە لێرە دەژین هەوڵیان دا با کاریگەرییان هەبوایە لەسەر ئەو کوردانەی لە دەرەوەی کۆمارەکەی ئێمە دەژین بۆ ئەوەی ئەوانە نەکەونە ژێر کارتێکردنی کۆنەپەرستانی جیهانی کە دەیانەوێ یارییان پێ بکەن، من دەزانم و ئێوەش دەزانن کە هیچ پارچەیەکی یەکیەتی سۆڤێت وەك ئەلیکساندەر پول

(لینینییەکان) زیانی پێ نەگەیشتووە لە دەستی تورکیای دراوسێمانەوە، بەڵام هاوڕێیان ئێمە دەبێت بە گشتی پێشکەوتنی مێژوویی لەبەر چاوبگرین، ئێمە دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە ئەوە تورکیای نوێیە کە بۆ یەکەمجار مزگەوت و کەنیسەی لە دەوڵەت جیا کردووەتەوەو دەزگای خەلافەتی لەناو بردووە و دەسەڵاتی کۆنی ڕوخاندووەو چین وتوێژە خاوەن ئیمتیازە کۆنەکانی تێکداوە کە بەراستی سیاسەتێکی پێشڕەوانەیە لەناو دەوڵەتانی موسوڵماندا.

ئەم تورکیا نوێیە خەباتێکی تەواو دەکا دژی کاپیتالی بێگانە، ئێمە دەزانین تورکیای نوێ تا چ ڕادەیەك دەیەوێ دژی ئینگلیز و فەرەنسا خەبات بکات کە دەیانەوێ دەست بەسەر سەروەت و سامانی تورکیادا بگرن، هەر بۆیە لەم کاتەدا کە تورکیای نوێ هەموو هێزێکی خۆی خستووەتە کار بۆ پاراستنی سەربەخۆیی خۆی لە داوی کاپیتاڵ و کۆنەپەرستی جیهانی، لەم کاتەدا ڕاپەڕین و بە پلەی یەکەم ڕاپەڕینی کوردەکان ناتوانێت نەبێتە چەکی دەستی کۆنەپەرستان و کاپیتاڵی جیهانییەوە کە دەیانەوێ دەسەڵاتی نوێی تورکیا لەناوبەرن.

ئاشکرایە کە کێشەی کوردەکان زۆر ئاڵۆزە بەڵام چارەسەرکردنی لێرە بە دەستی ئێمە نییە و ئەوەش کاری ئێمە نییە، بەڵام ئەوەش مانای ئەوە نییە کە داوا لە ها وڕێیانی کوردی خۆمان نەکەین و بڵێین تکایە سەرنجی هاوڕەگەزەکانتان رابکێشن بۆ ئەوەی کە لەم هەلومەرجەدا بە تەواوی ئاشکرایە ئەم ڕاپەڕینە پەیوەندی بە هەوڵدانی کۆپەرستانی جیهانی و دۆستانی سوڵتانی لەسەر دەسەڵات لابراوی تورکیاوە هەیە کە دەیانەوێ دەسەڵاتەکەی جارێکی تر بگەڕێننەوە بۆ ئەستەنبول و خەلافەت زیندوو بکەنەوە و دەرگا بخەنە سەر پشت بۆ سەرمایەی بێگانە و تورکیا واز لەسەربەخۆیی خۆی بهێنێت و بە کاپیتال جیهانییەوە ببەسترێتەوە، ئەم پەیوەندییەی ڕاپەڕیوەکان بە کۆنە پەرستانەوە وامان لێدەکا کە بە چاوێکی تر تەماشای بکەین و هەڵوێست وەربگرین و بڵێین، ئەو هێزەی بووەتە هۆی بەرپاکردنی ئەم ڕاپەڕینە هێزی ئیمپریالیستە زلهێزەکان و کۆنەپەرستانی جیهانییە کە هەوڵی ئەوە ئەدەن ئەم ناوچە هەرە گرنگەی جیهان کە دوو کیشوەری جیهانی بەیەکەوە بەستووەو هەروەها ئەو

جێگایەی کە تیایدا تەنگە (بوغاز) کانی ئەوروپا و ئاسیا بە یەك دەگەن، داگیر بکەن و بیخەنەوە ژێر دەستی خۆیان، بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش بەو شێوەیەی کە هەمیشە پەیڕەوییان کردووە پشت دەبەستن بە دەستەیەك یا گروپێك لە دانیشتووانەوە.

ئێمە دەبێ دژی ئەمە ڕاوەستین، هەر بۆیە من هیوادارم کە هاوڕێیانی کوردی ئێمە کە لێرەن هەنگاوی وا هەلگرن کە نەهێڵن براکانیان ببنە داردەستی کۆنەپەرستانی جیهانی و دژی ئەو هێزە نوێیەی کە ئەمڕۆ خەبات دەکا دژی کاپیتاڵی جیهانی.

## **زاریا وەستوگ** *1925/3/15* **–ڕا پەڕین لە کوردستان.**

باتوم – *3/14* : دوێنێ سەرنووسەری ڕۆژنامەی وەتەن ئەحمەد شوکری هاتە باتوم و ڕایگەیاند: ڕاپەڕینی کوردستان جووڵانەوەیەکە دژی ڕژێمی دیموکراسی تورکیا و ئەم ڕاپەڕینە هەندێ کەس بەڕێوەی دەبەن کە ناتوانن واز لە خوو ورەوشتی دەرەبەگایەتی خۆیان بێنن و دەست لەو بەە ئارەزووی خۆ هەڵسوکەوت کردنەی لە سەردەمی سوڵتاندا هەیانبووە هەڵبگرن.

کوردستان لە باری کەلتوورییەوە هێشتا لەسەردەمی سەدەکانی ناوەندی دایە، ڕێبەری بززوتنەوەکە شێخ سەعید کابرایەکی هیچە و کەسایەتیەکی نیە کە بتوانێ کۆمەلانی خەڵك بە دوای خۆیدا راکێشێت، ئەو لە هەستی ئایینی کوردەکان کەڵك وەردەگرێت و بە فۆنتەکانی ئینگلیز گەرمیان دەکاتەوە.

ژمارەیەك لەو ڕاپەڕیوانە کە گیراون فۆنتیان لە کیفان بووە. بەوتەی ئەحمەد شوکری راپەڕینەکە بەم زووانە کۆتایی پێدێت و سەرکوت دەکرێت دەست گەیشتن بە ناوچەکانی راپەڕین لەبەر کوێستانی بوون و بەفر کە دەگاتە دوو مەتر زۆر زەحمەتە، بەڵام ناوچەکە پڕە لە سوپای دەوڵەت و چاوەڕێ دەکرێ بەم زووانە کۆتایی پێ بێت.

ناوبراو هەروەها گوتی: تورکیا لە ناخی دڵەوە دەیەوێت پەیوەندی بازرگانی خۆی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤێت بەهێز بکات. بۆچوونی گەلی تورکیا بەرامبەر یەکیەتی سۆڤێت

پڕە لە هەستی هاو دەردی و پێکەوە بوون و دۆستایەتی، ئانکارا هیچ کاتێك ئەو یارمەتییەی کە روسیای سۆڤێتی لە ئالۆزترین قۆناغی خەباتی گەلی تورکیا بۆ یەکپارچەیی و سەربەخۆیی کردوویەتی لە بیر ناچێتەوە. ناوبراو لە گەشتەکەیدا سەردانی چەند شارێکی تری سۆڤێتی کردووە وەك لینینگراد و دەورێکی باشی هەبوە لە پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی هەردوو ولاتدا.

## ڕاپەڕینی کوردەکان
## ڕاپەڕیوەکان گەمارۆ دەدرێن

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

کەمال پاشا لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ عیسمەت پاشا سەبارەت بە چۆنیەتی گەمارۆدانی ڕاپەڕیوە کوردەکان وتووێژی کردووە، کلاڵەی ئەم گەمارۆدانە بە پەلە ئامادە کراوە. ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانەی کە لە لایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە بە دەوری ڕاپەڕیوەکاندا دروستکراوە ڕۆژ دوای ڕۆژ تەنگ ترو بچووکتر دەبێتەوە.

## هەوڵی کوردەکان بۆ گرتنی دیار بەکر.

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

وەزیری ناوخۆی تورکیا ڕایگەیاند: "ئێمە لە مۆڵدانی هێزی ڕاپەڕیوەکان لە دەوروبەری دیاربەکر بە باشی ئاگادارین. شێخ سەعید هاتووەتە (توك سوور) کە دە کیلۆمەتر لە باکووری دیار بەکرەوەیە و هەزار کەسی لەگەڵ خۆی هێناوە، شەو هێرشی کردووەتە سەر دیاربەکر، بەڵام پاش دوانزە سەعات شەڕ کردن هێرشەکەیان شکستی هێناوە و ڕایانکردووە. ڕووداوەکان وانیشان دەدەن کە ڕاپەڕیوەکان ویستوویانە دیار بەکر بگرن و دەوڵەتی کوردی لەوێ ڕابگەیەنن.

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

دوو نەفەر دیل لەوانەی لە شەڕی دیار بەکردا گیراون، نامەیەکیان لە لا گیراوە کە لە بەغداوە نێردراوە بۆ ئەستەنبوول تیایدا هاتووە: "شێخ سەعید بە پێی فەرمانی کۆمیتەی سەربەخۆیی کە لە بەغدا کۆبووەتەوە ڕاپەڕیوە، کۆمیتەی کوردی لە (ئالیو)ش، هەر بۆ ئەو مەبەستە خەریکە ئەو خێڵ و هۆزانەی باشوور بانگ بکات بۆ ڕاپەڕین.

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

خزمەکانی مەلا سەلیم لە گەنجە کە دەساڵ پێش ئێستا لە سێدارە دراوە هاتوونەتە ڕیزی شۆڕشەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی مەلا سەلیم بکەنەوە، هەروەها خێڵی (خودان) کە سەرۆکەکەیان خزمی سەلیمە لەگەڵیاندا هاتوونەتە ڕیزی شۆڕشەوە دانیشتوانی ئوردوخان هەروا بە وەفاداری بەرامبەر بە دەوڵەت ماونەتەوەو بەرەنگاری ڕاپەڕیوەکان دەکەن و خێڵەکانی دەوروبەری ناوچەکەش یارمەتییان دەدەن.

## ناردنی کەتەلۆك

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

چەند کومپانیایەکی ئینگلیزی کەتەلۆکەکانی خۆیان بەم ئادرەسەی خوارەوە ناردووە بۆ دیاربەکر: "بۆ وەزیری جەنگی دەوڵەتی پاشایەتی کوردستان، دیار بەکر." کەتەلۆکەکان ئێستا لە دەستی دەوڵەتی تورکیادان. ڕاگەیاندنی ڕەسمی دەوڵەتی تورکیا دەڵێت کە ڕاپەڕیوەکان بە باشی چەکدار کراون و چەك و تفاقێکی یەکجار زۆریان هەیە، چەکەکانیشیان لەو چەکە ئەوروپاییانەن کە لەشکری تورکیاش بە کاری دێنێ.

## ڕاگەیاندنی ئەندامانی دادگای سەربەخۆ

**ئانکارا**. *1925/3/15*.

ئــەندامانی دادگــای ســەربەخۆ ڕاگــەیاندنێکیان بڵاوکردووەتــەوە، تێیــدا دەڵێــن: ڕاپەڕینەکـەی ئێسـتای دژی دەوڵـەتی تورکیـا سـێ سـەرچاوە و پشـتیوانی هەیـە. یەکـەم لایەنگری دەکەن لە سـوڵتان و سیسـتمی خەلافـەت. دووهـەم بـەپارەو زێـڕی بێگانـەکان بەڕێوە دەچێت، سێهەم، پاتریاتیزمی کـوردی (نیشـتمان پەرسـتی کـوردی) کـە لـە کـاتی ئاشـت بوونـەوە لەگـەڵ یۆنـان بـە سـەرۆکایەتی سـوڵتان، ئێسـتاش هـەر بـە سـوڵتان و خە لیفە وەفا دارەو..، ئێمە ناتوانین وەك مەكدۆنیا و ئەڵبانیا، ناوچەکانی ڕۆژهەڵات لە دەسـت بدەیـن، ئـەرکی نیشـتمان پەرسـتی ئێمەیـە کـە وشـەی کوردیـزم لـە فەرهــەنگدا بسڕینەوە.

## مانیفیستی دادگا سەربەخۆکان

**ئانکارا** *1925/3/15*.

نـاوەندی (دادگـای سـەربەخۆ) مانیڤێسـتێکی بـۆ خــەڵك بڵاوکردووەتــەوە تێیــدا دەڵێـت: دادگاکـان زۆر عادیلانــە و مرۆڤانــە دەجووڵێنــەوە و بــە پێــی پرەنســیپەکانی سەردەمی شەڕ دەجووڵێتەوە. دادگاکان دژی ڕاپەڕیوەکان و بە گشتی دژی کۆنەپەرستان کـە دەیانـەوێ بینـای ئـازادی و ئیدەئـالی گـەل بڕوخێنـن خـەبات دەکـەن، هـەروەها دژی ئەوانەی کە دەیانەوێ ئایین بکەنە بیـانوو و دار دەسـت بـۆ گەیشـتن بـە بەرژەوەندییـە سیاسیەکانی خۆیان و بەم جۆرە مێشکی خەڵکیان ژەهراویی کردووە و وایان لێکـردوون کە دژی دەسەڵاتی نوێی تورکیا بوەستن و هانیان دەدەن ڕیزەکانی سوپای تورکیا بــەجێ

بێڵن و ڕا بکەن. ئەوانە هەموویان دادگایی دەکرێن و دادگاکان هەوڵ دەدەن بۆ سەقامگیر بوونی ئاشتی و ئارامیی بۆ تەواوی هاو وڵاتییان. دادگاکان بڕیاریانداوە کە دادگایی کردنەکان نهێنی بن بۆ ئەوەی تووشی گێروگرفت نەبن لە کاروبارییاندا.

*.1925/3/18*

## لەسەر ڕا پەڕینەکەی کوردستان.

## هۆکانی ئەم ڕا پەڕینە چین؟

سەبارەت بە ڕاپەڕینی کوردستان تەنیا چەند بروسکەیەك هەیە و هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو لەم بارەوە نییە. لە ڕووداوە گەرم و توندو تیژەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلی دوو شت بە دی دەکرێت، یەکەم ئەوەیە کە ڕاپەڕینەکە کۆنە پەرستانەیەو دووهەمیان، دەربڕینی هەست و بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕانەی نیشتمانیی کوردە و لەوانەیە کوردەکان کرابنە داردەستی هەندێ سەرکردەی دەم و چاو داپۆشراو.

بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە خۆیدا ناتوانێت بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە بێت و کوردەکان نابێت لە بەرژەوەندی سیستمی خەلافەتدا بجووڵێنەوە، ئەویش لە پێناوی سەرو سیمای کوڕی سوڵتان عەبدولحەمیدی لابراودا. سێزدە سەدە باشووری کوردستان سەربەخۆ بووەو، تەنیا لە ساڵی *1834*دا کوردەکان بوونەتە هاووڵاتی تورکیا. لەسەردەمی شەڕی (کریم - قەرم) بە هۆی ئینگلیز و تورکەکانەوە کوردستان ئەو ئۆتۆنۆمییەی خۆی لە دەستدا.

ئێمە ئێستا باسی هەموو ڕاپەڕینەکانی کورد ناکەین، بەڵام ڕاپەڕینی یەزدانشێر (لە کاتی شەڕی کریم دا) و هەروەها ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا لە ساڵی *1880*دا لای هەموان ئاشکرایە. بەم چەشنە دەبینین ئەگەر لە ڕابوردوودا بزووتنەوەی دژی خەلافەت و سوڵتان و شاکان هەبوە، بۆ دەبێ جێی سەر سوڕمان بێت ئەگەر ئێستا لە سەردەمی شۆڕشەکاندا گەلی کورد بیانەوێت زنجیرەکان لە شۆڕشی خۆی بەردەوام بێت و زنجیرەکان بپچڕێنێت. بەڵام ئەگەر هەندێك سەرکردە ئەمڕۆ کوردەکانیان خستبێتە

ژێـر دروشمـی ئـایینی و خەلافـەت، ئـەوە بـەو مانایـە نییــە کــە هۆکـانی راسـتەقینەی ڕاپەڕین لە کوردستاندا ئەمانە بن.

بە گشتی کوردەکـان پێـش هـەموو شـتێك لـە سروشـتیاندا فـەناتیکی ئـایینی نـین، ئەوان بە ڕواڵەت ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە، چونکە ئەوان خـاوەنی ئـایینێکی کۆنـی خۆیانن و یە زیدین. هەر بۆیە لە ناو کوردەکاندا پەلوپۆی جۆراو جۆری ئیسلامیان لـێ پەیدا بووە. هۆکـانی ڕاپـەڕین دەبـێ لـە نـاو فـەناتیزمدا بـە دوایـدا نـە گـەڕێین، بـەڵکو هەمووی و لە هەموو جێگایەکدا دەبێ لە ناو باری ئابوورییاندا بدۆزرێتەوە.

شەڕی جیهانی ئەرمەنستان و کوردستانی گرتـە بـەر و شـەڕی تورکیـا و یونـانیش زیـانێکی گـەورەی لـەم ناوچانــەو تورکیـای نــوێ داو بــۆ بـــەرگریکردن لـــە تورکیـــا خۆبەختکـەریی و گیانفیداییـەکی زۆر کـرا. (هیــچ نـــەبێت فاتمـــە خـــانمی وان وەك نموونەیەك وە بیر دەهێنینەوە). شەڕ کوردسـتانی کـاول کـرد و کوردەکـانی خسـتە ئـەو پەڕی هەژاریی و کولە مەرگییەوەو ئێستاش هیچیان بـۆ نەماوەتـەوە جگـە لـەوەی ئـەو زنجیرەی بەستوونیەتەوە بیپچڕن، زەمینەش بۆ ڕاپەڕینێکی لەو جۆرە ئامادەیە و هـەر کەسێکیش بیـەوێ لـە تورکیـادا ڕاپـەڕێت دەبـێ کـەڵك لـە کوردسـتان وەربگرێـت. دەبـێ ئەوەش دووپات بکەینەوە کە لـە ڕابـووردوودا هـەر ڕاپـەڕینێك کـە دژی شـا یـا سـوڵتان کـراوە دژی چەوسـاندنەوە و چەوسـێنەران بـووە. بـەم چەشـنە هـۆی ئـابووری لـــە کوردسـتان بووەتـە هـاندەری ڕاپـەڕین و سـەرهەڵدانی بزووتنـەوەی نیشـتمانی، واتـە بەشێکە لە شۆڕشی جیهانی. بەڵام لێرە لـە قـەوقاز ئێمـە هێشـتا نـازانین کوردەکـان بـە ڕێگای ڕاستدا ڕۆیشتوون یا نا؟.

## ستراتیژ و سیاسەت لە ڕا پەڕینی کوردەکاندا.

بروسکەکان ڕایانگەیاند کە تورکیا لەگەڵ فەرەنسادا سەبارەت بە ناردنی سوپا بە ناو خاکی سوریادا بۆ سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی کوردەکان وتوێژی کردووە. ئەم بابەتە پێویستی بە چەند ڕوونکردنەوەیەك هەیە. بە پێی پەیمانی سیڤەری ساڵی *1920* سنووری نێوان سووریا و تورکیا بە درێژایی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا لە ئێستگەی (کنوبان بەی) تا (نەسیبین) دیاری کراوە، بەم هۆیەوە تەواوی سنجاقی ئۆرفە و ماردین لە تورکیا دابڕاون و تورکیا لە بارودۆخێکی وا بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت کەڵك لە ڕێگای ئاسن وەربگرێت، لەبەرئەوە ئیستگەی موسلیمە لە نزیك ئالپو ئەو شوێنەی کە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕێگای شەمەنەفەری بەغدا لەگەڵ ڕۆژئاوادا دەبەستێتەوەو دەگاتە ئەدەنە و قونیە، لە *20*ی ئۆکتۆبەری ساڵی *1921*دا تورکیا پەیمانێکی لەگەڵ فەرەنسادا مۆر کردووە، بە پێی ئەم پەیمانە سنووری بەرەو باکوور لە (عەین روبا) و (ئورفە) و (ماردین) کەم کرایەوە و پاشەکشەی لێکرا بەڵام مافی ئەوە درا بە تورکیا کە بۆ گواستنەوەی سوپا کەڵك لە ڕێگای ئاسنی بەغدا وەربگرێت. ئێستا زۆر زەحمەتە بۆ تورکیا کە سوپای خۆی بنێرێتە ناوچەی ڕاپەڕینەکە، واتە دیاربەکر و خارپووت.

ڕێگای هێڵی ئاسن لە ڕۆژئاوای ئەناتولی زۆر تۆکمە و تازەیە و تا ئێستا لە ناوچەی ناوەڕاستی ئەناتولییەوە هێشتا ڕێگای ئاسن دروست نەکراوە، بەڵام ڕێگای ناوەراست و ڕۆژهەڵاتی ئەناتولی تا مانگی نیسان و مایس تەواو دەبن و دەبەسترێن بۆ گواستنەوەی خێرای سوپا، جگە لەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە، لای سەمسون - ئەلیکساندریتەوە لە ناوچەی نزیك سیواس ناوچە کوردنشینەکان دەست پێدەکەن کە ڕێگا و بانەکان لەم بارودۆخەدا

جێی متمانە نین. لە حاڵێکی وادا بۆ تورکیا باشتر ئەوەیە، بۆ گەیاندنی خێرای سوپا بۆ دیاربەکر کەڵك وەربگرێت لە ڕێگای ئاسنی بەغدا.

بەم چەشنە دەکرێت لەشکری تورکیا بگەیەنرێتە ماردین و لەوێشەوە تا خارپووت کە ڕێگای خاکییە دەتوانێت بکەوێتە پشت ڕاپەڕیوەکانەوە. لە ماردینەوە تا دیار بەکر بەرەو ئانکارا هەمووی لە دوو یا سێ ڕێگاوە دەکرێ بۆی بچیت جگە لەوە بەشێك لە سوپا دەکرێ لە ئیستگەی مورشیدەوە بەرەو ئۆرفە و سیڤەریك بگاتە ناو دیار بەکر، یاخود لە چیاکانی سیڤەریکەوە بەرەو خارپوت بەڵام ئەم ڕێگایە زۆر زەحمەت و درێژ ترە و لە لایەکەوە لە دەست فەرەنساییەکاندایە.

وا دیارە کاپیتالی فەرانسەوی بەرژەوەندی خۆی بینیوەتەوە لە ئارگان و لیگاوین کە لەوێ ڕێگای ئاسن دروست دەکرێت و دەرهێنانی کانزایی لە کانەکانی ئەم ناوچەیە بەرەو پەرەسەندن دەڕوات. فەرانسەوییەکان دەتوانن تەواوی گێرە و کێشەکانی ناوچە سنوورییەکان لەگەڵ تورکیا چارەسەر بکەن ئینگلیزەکان لە بەرژەوەندییاندایە پشتیوانی ڕاپەڕینی باشووری کوردستان بکەن بەڵام فەرانسە بەرژەوەندیی لە دژایەتی کردنی ڕاپەڕینەکەدایە.

ئینگلیزەکان کە بەرژەوەندییان هەیە لە عێراقدا دەتوانن واز بێنن لە پشتیوانی کردنی ئەم ڕاپەڕینە و لە بەرامبەردا تورکیا دەتوانێت ناوچەکانی هەکاری و ڕۆژهەڵاتی جەزیرە ئیبن و ئومەر بداتە ئینگلیس و بەم چەشنە خۆ بە خۆ کێشەی مووسڵ چارەسەر دەکرا.

## زاریا وەستوك *1925/3/31*

## بەناوی خەلافەتەوە.

بانگەوازێك لە لایەن شێخ سەعیدەوە بڵاو کراوەتەوەو گەیشتووەتە ئەستەنبوڵ، شێخ سەعید بە ناوی ڕاپەڕیوەکانەوە داوای گەڕانەوەی خەلیفە دەکات و دەڵێت: "بەبێ ئەو ئیسلام هەبوونی نابێت" و دەوڵەتی تورکیا بە سەرۆکایەتی کەمال تاوانبار دەکات

کە گوایا هانی بزووتنەوەی دژی ئایین دەدات و پشتیوانی لێدەکات و لە قوتابخانە و خوێندنگادا وانەی خوانەناسی دەڵێنەوەو ژنانی تورك لە ناو شەقامەکاندا بەبێ چادر – عەبا دەردەکەون، پێنج مەلای سەر بە شێخ سەعید کە لە ئەستەنبوول گیراون لە پێچی مێزەرەکانیاندا پارەیەکی زۆریان شاردبوویەوە، لە کاتی لێپرسینەوەدا گوتیان شێخ سەعید خەزێنەیەکی هەیە دوو سەد هەزار زێڕی ئینگلیسی هەیە و بۆ ڕاپەڕین ئامادەی کردووەو مەبەستی گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەت و دانانی شازادە سەلیم ی کوڕی سوڵتان عەبدولحەمیدە بە خەلیفە.

وەك بڵاوبووەتەوە دوو مانگ پێش ڕاپەڕین لە (ئالپو) کۆبوونەوەیەکی نهێنی کراوە، تەواوی سەرکردە کوردەکان ئامادەبوون تیایدا و شازادە سەلیم یش بانگ کراوە بۆ ئەو کۆبوونەوەیە و لەوێدا ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەڵتەنەت و بۆ دەوڵەمەند کردنی خەزێنەی ڕاپەڕین یارمەتی داوە.

ڕابەری بزووتنەوەکە دۆستی کۆنی سوڵتان عەبدولحەمیدە و لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەناوبانگە، یەکێکە لە بەناوبانگترین سەرکردەی برا دەروێشە نەقشبەندییەکان هەر کات بیەوێت دەتوانێت چەند هەزار نەفەر دەروێش کۆبکاتەوە و دوای خۆیانی بخات، کارێکی وا بۆ برایانی نەقشبەندی شتێکی زەحمەت نییە، بە تایبەتی لە ناو کۆمەڵانی دوا کەوتوو و تاریکی کوردستان و خزمەتکارانی پێغەمبەر واتە مەلا و حاجی و مێزەرە ڕەنگاو ڕەنگ بەسەرەکان و هەروەها ئەوانەی کە لە کەمال ناڕازین.

ڕاپەڕین لە کوردستاندا دەستی پێکردووە و دوانزە ویلایەتی گرتووەتەوەو هێزی ڕاپەڕیوەکان دەگاتە حەوت هەزار نەفەر. سوپای کەمال کە بەرەو ناوەڕاستی وڵات پێشڕەوی دەکەن یەکەم سەرکەوتنیان بە دەست هێناوەو وەك ڕادەگەیەنین هێرشی شێخ سەعیدیان بۆ سەر دیار بەکر ڕاگرتووە و چالاکی هێزەکانی دەوڵەت لەبەر ناخۆشی هەوا تووشی گێرەو کێشە بوون، بەفرێکی زۆر دەبارێت، سەرما و سەهۆڵبەندان لە ناوچە کوێستانییەکان، خەباتی سوپای دژوار کردووە دژی سەرهەڵداوەکان.

سـەرکردەی ڕاپەڕینەکـە شـێخ سـەعیدە، بـەڵام ئـەو هـەر بـە نـاو سـەرکردەیە، لـە پشتی شێخەوە کەسـانێکی تـر هـەن کـە دژی دەوڵـەتی کـەمالن وەك مـەلاکان و پیـاوانی خەلیفە و هەروەها بێگانەکانیش. ڕۆژنامەکانیی ئینگلیز بە ئاشـکرا دەڵێـن کـە یـەکێك لە بزوێنەر و هاندەری ڕاپەڕینەکە خۆیانن و لە باشوورەوە، واتە لە مووسڵەوە یارمەتی پێدەگەیەنن.

لە ئانکەرە زۆر بـە جیـددی و بـە مەترسـییەوە دەڕواننـە ئـەم ڕاپەڕینـە ئێمـە لـە سەرەوە باسی هەنگاوەکانی دەوڵـەتمان کـرد بەرامبـەر بـە ڕاپەڕینەکـە، وەك دەرکردنـی یاسای پاراستنی کۆمار، ڕێکخستنی دادگا سەربەخۆکان کە لە زۆر ناوچەدا لق و پۆپیـان هەیە، داخستنی چەند ڕۆژنامەی ئەستەنبووڵ کە بە هاندەرو بزوێنـەری ڕاپەڕینـە کـە دادەنرێـن. دروشمـی سـەربەخۆیی بـۆ کوردسـتان کـە لـە لایـەن ڕاپەڕیوەکانـەوە بـەرز کراوەتەوە لێرە باوەڕی پێناکەن، ڕاپەڕینێك کە لـە دەرەوە ڕێکخرابێت، ئەگـەر هـەندێ سـەرکەوتنیش بـە دەسـت بـهێنێت، جگـە لـەوێرانی شـتێکی بـە دواوە نـابێت، ئـەو وێرانییەی کە دەسەڵاتدارانی ئێستای تورکیا هەوڵ دەدەن بۆ نەهێشتنی.

## زاریا وەستوك *1925/4/3*

## کۆمیتەی کوردی

سـەبارەت بـە پـەیوەندی کۆمیتـەی کـوردی ئـالپو لەسـەر ئـەو ڕاپەڕینـەی ئێسـتا کوردسـتانی تورکیـا، لـە بـەغدا گفتوگـۆ کـراوە. کۆمیتـەی کـوردی سـاڵی *1914* دوای سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینی کوردان لە بەتلیس دامەزرا، تـا دروسـتبوونی ئـەم کۆمیتەیـەی ئێستا کۆمەڵەی کوردی هەبوو کە لـە سـەرەتادا لـە قاهـیرە و پاشـان لـە جنێـف گۆڤـاری شۆڕشـگێڕانەی (کوردسـتان) یـان بـە زاراوەی بۆتـانی دەردەکـرد، تـەواوی ئـەندامانی کۆمەڵـەی کـوردی لـە کۆمیتـەی کـوردی دا بـوون، نـاوەندی کۆمیتەکـە لـە دەرەوەی کوردستانەو لە تەواوی شارە گەورەکانی کوردستاندا لقی هەبوو و بە شـێوەیەکی نـهێنی لەگەڵ ناوەند و لقەکانی تری کۆمیتـە پـەیوەندی هـەبوو. لـە نـاو ئـەندامانی کۆمیتـەدا

ژمارەیەکی زۆر هەبوون کە خوێندنی ناوەندی و باڵایان تەواو کردبوو، یا ئەفسەری پێشووی تورکیا بوون تەنانەت ئەفسەرانی ستادی گشتی سوپای تورکیای پێشوویان تێدا بوو. هەروەها کۆمیتە ئەندامی تری هەبوو لە دەرەوەی وڵات، لە سویسرا میراتی کۆمەڵەی کوردی بۆ بەجێما بوو واتە شوێنێکی گەورەو هەمیشەیی و لە ڕێگای سویسراوە ئەوانە دەیانتوانی لەگەڵ شۆڕشگێڕانی وڵاتانی ئاسیا و ئەوروپا پەیوەندی دروست بکەن.

لە دوای گرتنی ئەستونبوول لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە کۆمیتەی کوردی بەرنامەی خۆی گۆڕی و پەرەگرافێکی لێ زیاد کرد کە بە پێی ئەو پەرەگرافە ئەندامانی کۆمیتەی کوردی مەرج نییە تەنیا کوردبن بەڵکو دۆستانی گەلی کوردیش دەتوانن ببنە ئەندام. ئەمە کارێکی هەڵە بوو، چونکە تەواوی ئەو کەسانەی کە پۆست و پلە و پایەی خۆیان لە دەستدا بوو و دژی کابینەی دامادفەرید پاشا بوون و هەموو ئەو کەسانەی کە دژی لاواز بوونی دەوڵەتی تورکیا بوون، بە گشتی تەواوی ئەو لیبرال و بیروکرات و سوڵتان پەرستەکان لەگەڵ سیاسیە ئاوانتوریستەکانی پێشوو لەم گۆڕینی پرۆگرامە کەڵکیان وەرگرت و چوونە ڕیزی کۆمیتەی کوردییەوە. ئەوانە پێیان وا بوو کە لە داهاتوودا بارودۆخی کوردستان لە تورکیا باشترە بۆ ئەوان، چونکە بە پێی پلانی ئەوروپییەکان بارودۆخی کوردستان لە هی تورکیا باشتر دەبێت. هەر بەم هۆیەوە لەگەل شەریف پاشای سەر بە سوڵتان کە کوردێکی بەناوبانگە پێکهاتبوون کە ناوبراو ببێتە ئەندامێك لەم کۆمیتە کوردییە گەورەیەداو ئەمەش لە ڕاستییەوە نزیکە.

ئەو هەواڵە کەم و کورتانەی کە ئێمە لە ڕێگای بروسکەکانەوە دەستمان دەکەوێت، بە ئاشکرا ئەوە دەردەخەن کە تێکەڵ کردنی بیرو باوەڕی نەتەوەیی ڕاپەڕینی کورد لەگەڵ بزووتنەوەی کۆنەپەرستان و لایەنگرانی خەلافەت و سوڵتان لە تورکیا بە گوێرەی ڕاسپاردەی کۆمیتەی کوردی بێت کە لە ئالپو و بەغدادە و ئەم ڕاپەڕینە ڕێبەرایەتی دەکات و ڕاپۆرتەکانیان دەنێرنە ئەستەنبوول.

## زاریا وەستوك *1925/4/4*
## دەوڵەتی نوێی عیسمەت پاشا

بە هاتنە سەر کاری کابینەی عیسمەت پاشا، ژیانی سیاسی تورکیا زۆر دەگۆڕێت، لە ڕاستیدا ئاڵوگۆڕەکە هەر لە چوار چێوەی بەرنامەی پارتی گەلدا دەبێت، لە باتی باڵی راستی ئەم پارتی گەلە کە بەسەرۆکایەتی فەتحی بەگ بوو، باڵی چەپی هەر ئەم پارتە بەسەرۆکایەتی عیسمەت پاشا و ڕەجەب بەگ دەسەلآت دەگرنە دەست، بەلآم دەبێ ئەوەش بزانین کە لە نێوان ئەو دوو باڵەی پارتی گەلدا جیاوازییەکی زۆر هەیە و باڵی چەپ بە سەرۆکایەتی عیسمەت پاشا لە هەندێ شتدا سیاسەتێکی پێچەوانەی سیاسەتی فەتحی بەگ هەیە، کابینەی فەتحی بەگ یەکدەست نەبوو، لە دەرەبەگە کوردەکانەوە بگرە وەك فەیزی بەگ تا دەگاتە جوتیارێکی وەك مەحموودی ئەسعەد بەگ کۆبوو بوونەوە تیایدا و سیاسەتێکی ساز شکارانەیان گرتبوە بەر و لەگەڵ بەرهەڵستکارەکان ڕێك کەوتبوون، بەلآم کابینەکەی عیسمەت پاشا کابینەیەکی یەك دەستەو لە باڵی چەپی پارتی گەل پێکهاتووەو خەڵکی تری تیا نییە.

ئەرکی سەرەکی کابینەی عیسمەت پاشایەکخستنی رژێمی کۆماری تورکیا و پتەوکردنی دەستکەوتەکانی شۆڕش و سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کوردەکانە. رژێمی کۆماری مەترسییەکی گەورەی کەوتووەتە سەر لە لایەن یەکیەتی تەواوی ئۆپۆزسیۆنەکانەوە. کۆنەپەرستانی ئایین سالاریی کە لە دواکەوتووی و نەزانی کۆمەلآنی خەڵك کەڵك وەردەگرێت، چالاکیی و پڕ و پاگەندەی نهێنی خۆی دژی (ئەنتی ئایینی) رژێمی کۆماریی بەڕێوە دەبات. بچووکترین ریفۆرم لە لایەن دەوڵەتی ئانکاراوە، ڕەخنە و قین و تووڕەیی ئەو هێزە رەشانە هەڵدەستێنێت. سیاسەتی ڕووناکبیرانە و باشی کابینەی کۆماری، گۆڕینی ئەو یاسایانەی کە بە پێی شەریعەت

دانراون، داخستنی مەدرەسەکان، ریفۆرمی تەواو لە بواری مەوقوفات و... جێ پێی مەلا و سۆفی و شێخەکانی بۆش کردووە، بەرهەڵستکاران پاش یەکەم لێدانیـان لـە سـەردەمی فـەتحی بـەگدا هاتوونەتـەوە سـەرخۆ و ئێستا لـە حاڵـەتی بـەرگریکردندا دەسـتیان بـە هـێرش کـردووە. ئـارگۆمینتی سیاسـی ڕاپـەڕیوە کوردەکـان ئایدیۆلۆژییـەکی ئایینییـە، هێزی رەش و تاریکیش دەوری هەیە لە ڕێکخستنی ئەم جووڵانەوە کوردییەدا.

یـەکێك لـە هـەنگاوە یەکەمـەکانی دەوڵـەت پەسـەند کردنـی یاسـای سـزادانی ئەنیسـتوتە ئایینییەکانـە لـە سیمای ئـەو کەسـانە کـە پلـە و پایـەی ئـایینی خۆیـان بەکاردێنن بۆ گەیشتن بە مەبەستە سیاسییەکانیان. دەوڵـەتی عیسمەت پاشا بـە باشـی لەوە گەیشتووە کە سزا نەدانی ئەوانەی پڕو پاگـەندەی ئـایینی دەکـەن و سـەرپێچی لـە دەو ڵەت و یاساکان دەکەن کارێکی نا بەجێیە و لە پێناو مانەوەی خۆیدا دەبێ بە چەك بە گژیاندا بچێتەوەو بەرگری لە خۆی بکات.

یەکێك لەو هێزە ڕێکخەرانەی ئۆپۆزسیون کە چالاکانە دژی دەوڵەت دەجووڵێنەوە هـەندێ چاپەمـەنی خۆفرۆشـی ئەسـتەنبووڵن کـە ڕەخنـەی نابـەجێ و دوژمنانـە لـە دەوڵەت دەگرن، داخستنی ئەو چاپەمەنییە کۆنەپەرستانەی وەك "تـەوحیدی ئـەفکار" "ئیستیقبال" "سون تلیگراف" تارادەیەك دەمی ئۆپۆزسیون دەبەستێت.

یەکێکی تر لەو هەنگاوانەی کە دەتوانێت پارێزگاری لە دەوڵەت بکات، ئەوەیـە کـە پارتی گەل بارودۆخی نا ئاسایی لە ناوچەکانی ڕاپەڕیندا ڕابگەیەنێت، هـەروەها دادگـای تایبـەت بـۆ سـزادانی تاونبـاران و خیانـەتکارانی نیشـتمان دابمـەزرێنن، لەگـەڵ ئەمانـە دەوڵەت هەنگاو بنێ بۆ یاساغ کردنی چالاکی پارتی کۆماریی پێشکەوتوو لە ڕۆژهـەڵاتی تورکیا چونکە تەواوی هێزە ڕەشەکان لە ژێر باڵی ئەو پارتەدا کـۆ بوونەتـەوەو یـەکیان گرتووە، هەر چەندە تا ئێستا بڕیاریـان نـەداوە خۆیـان ئاشـکرا بکـەن، خۆشاردنەوە لـە پەنای کۆماری خوازی و پێشکەوتن خوازیداو بـە نـاوی ئـەو جـۆرە پارتیانـە وە چـالاکی کردن ئاسانترە و پاڵی چەپی پارتی گەل کە ئێستا لە سەر دەسەڵاتن لـەو بـاوەڕەدان کـە خەباتی شۆڕشگێڕانەی ئەناتولی هێشتا کۆتایی پێ نەهاتووە، پاراستنی کۆمـار پێویسـتی بـە هـەندێ ڕیفۆرمـی کۆمەڵایەتییـە، پاڵپشـتی بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕیی تورکیـای

نەتەوەیی سەربەخۆ دەبێ لە ناو کۆمەڵەی جوتیاران و بەهێز کردنی بورژوازی ئەناتولیدا بدۆزرێتەوە. سیاسەتی نالەبارو چەوتی دەوڵەتی فەتحی بەگ کە بەرەو ڕۆژئاوا گرتبوویە بەر و ڕێککەوتنی لەگەڵ بورژوازی بازرگانیدا و پشتگیری کردنی لە خاوەن زەوی و زارە گەورەکان، چینی جوتیاری لە شۆڕش و بورژوازی ئەناتولی دوور خستبوەوە، ڕێگای راستەقینە ئەوەیە کە ئێستا عیسمەت پاشا گرتوویەتیە بەر کە دەیەوێ، دەیەك و باج لە چینی ناوەندی و خەڵکی هەژار لابەرێت و ریفۆڕمی زەوی و زار جێبەجێ بکات و دەرەبەگ لەناو بەرێت. جوتیارانی ئەناتولی هێزی بزوێنەری شۆڕشەکەو پارێزەری سەربەخۆیی تورکیان و مافی ئەوەیان هەیە کە داوای داخوازییەکانی خۆیان بکەن.

دەوڵەتی چەپی ئەمڕۆی تورکیا بێگومان لەم بارەوە هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی دەبێت، هاتنە سەر حوکمی دەوڵەتی عیسمەت پاشا بە مانا کۆتایی هێنان بە یاریکردنی سەرمایەدارە بێگانەکانە لە تورکیا و...

ڕاپەڕینی کوردەکان بوو بەهۆی لەسەر کار لاچوونی کابینەی فەتحی بەگ پێویست بوو، فەتحی بەگ بە زوویی و خێرا و چالاکانە لە بەرامبەر ئەم بزووتنەوەدا هەڵوێست بگرێتە بەر و بەشێوەیەکی توند بجووڵێتەوە لەگەل هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێ ڕاپەڕینی کوردەکان بەکار بێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ڕۆژنامەکانی زمانحاڵی ئەم لایەنانە وەك "تەوحیدی ئەفکار" و ئەوانی تر، هەڵوێستێکی تەواو دوو ڕوویانەیان هەیە، لە لایەك پشتیوانی تەواوی خۆیان لە دەوڵەت ڕاگەیاندووە و لە لایەکی تریشەوە پاکانە بۆ ڕاپەڕین دەکەن و پاساوی بۆ دەهێننەوە. لە بەرامبەر هەڵوێستی ئۆپۆزیسیۆندا پرەنسیپی جێبەجێکردنی لامەرکەزی دەخەنە ڕوو و هەروەها داوای هێنانی سەرمایەی بێگانە پێشنیار دەکەن بۆ دەرهێنان و کارکردن لەسەر کان و سامانی ناوچەکانی ڕۆژهەلات و داوای ئازادیی زۆرتر دەکەن بۆ چالاکی پان ئیسلامییەکان.

دەوڵەتی سازشکار و پێست ڕەنگاو ڕەنگی فەتحی بەگ توانای ئەوەی نەبوو هەڵوێستێکی توند دژی ئۆپۆزسیون و میتۆدەکانی ئەو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد

بگرێتە بەر، دەوڵەتی عیسمەت پاشا تێگەیشت کە "پشتیوانی" کردنی ئۆپۆزسیون لە دەوڵەتەکەی بە پاکی و لە دڵەوە نییە و تەنیا کارێکی تاکتیکییە بۆ خافڵاندن و کات بردنە سەرەو چاوەڕێی هەلێکیان دەکرد کە لە بەرژەوەندیی ئەواندا بێت. لە وەڵامی "ئامۆژگاری"یەکانی ئۆپۆزسیۆندا، دەبوا ئەوان رووبەڕووی تاقمەکانی دژی دەوڵەت خەباتیان کردبا، چارەسەری کێشەی کورد لە قۆناغێکدا جێبەجێ دەکرێت کە کێشەی زەوی و زار چارەسەر بکرێت، کاتێك کە فیئودالیزم لە ناو دەبرێت و تەواوی شێخ و مەلا و ئاغاکان بخرێنە پەراوێزەوە.

بەرامبەر بە دەوڵەتی عیسمەت پاشا سێ کێشەی گەورە لە تورکیادا ڕاست بووەتەوە، پتەوکردنی ڕژێمی کۆماری و قووڵ کردن و زیاتر کردنی دەسکەوتی سیاسی و ئابووری بورژوازی نیشتمانی و پێشکەوتن خوازی ئەناتولی، چارکردنی کێشەی جووتیاران، دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی کوردەکان.

کردەوە سەرەتاییەکانی کابینەی عیسمەت پاشا نیشاندەری ئەوەن کە پشت بەستن بە بورژوازی و جووتیارانی ئەناتولی و هەروەها چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و زار و لابردنی (دەیەك – عوشر) و باشکردنی ژیانی دانیشتوانی تورکیا و خەبات دژی دەرەبەگ و خاوەن زەوی و زارە گەورەکان و بورژوای بەندەرەکان راسترین ڕێگایە کە گیراوەتە بەر و سەرکەوتنی عیسمەت پاشا بەستراوەتەوە بە درێژەدان بەو ڕێگایە.

*1925/4/5*

## شێخ سەعید لای دیاربەکرە

وەك ڕۆژنامە ئینگلیزییەکان ڕایدەگەیەنن، هێرشی ڕاپەڕیوەکان کە شێخ سەعید بۆ خۆی ڕێبەرایەتی کردووە سەرنەکەوتووە و لەم هێرشەدا سێ هێزی شەڕکەر کە ژمارەیان دەگەیشتە پێنج هەزار نەفەر بەشدار بوون. شێخ سەعید وای پێشبینی کردبوو کە دیاربەکر ئەگرێت و دەیکاتە "پایتەختی کوردستانی سەربەخۆ" و لەوێ دەوڵەتی کوردی ڕادەگەیەنێت. هێزەکانی شێخ سەعید توانیویانە بچنە ناو شارەکەوە،

بەڵام بە گەیشتنی هێزەکانی دەوڵەت ئەوانە تێکدەشکێنێ و هێرشکەرەکانی کورد زیانێکی گەورەیان لێدەکەوێت. شەڕەکە زۆر توند و خوێناوی بووەو سێ سەعاتی خایاندووە.

*1925/4/7*

## لە مێژووی بزووتنەوەی کورد دا

کوردستان شۆڕشگێڕێکی زۆری پەروەردە کردووە کە توانای خۆیان لە پێناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی تورکیادا خەرجکردووە. وێنەی پێشڕەوانی وا زۆرن، وەك دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت کە لەسەردەمی عەبدولحەمیددا وتار گەلێکی زۆرگرنگی دەنووسی، عەبدوڵڵا جەودەت نووسەرێکی بەناوبانگە و خەڵکی دیاربەکرە. ناوبراو شیعریشی بە زمانی تورکی و فەرەنسی داناوە، لە کاتی خۆیدا نامیلکەیەکی دژی عەبدولحەمید نووسیبوو لە ژێر ناوی "مەحکەمەسن کورا" واتە قازی گەورە کە زۆر دەنگی دا بوویەوە. هەروەها نوسین و بەرهەمێکی زۆری نووسەرە کلاسیکە ئەوروپییەکان کە زۆربەیان ئینگلیزی بوون وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی، لە ناو نووسین و بەرهەمەکانی ئەودا بابەتی وا هەن کە هێشتا لە ناو ئەدەبیاتی ئەوروپیدا کاری کەمیان لە سەرکراوە وەك نامیلکەی "چاکبوونەوە بە مووسیقا" و "تەندروستی...". عەبدوڵڵا جەودەت ماوەی سیانزە ساڵ لە دەرەوە دەژیت و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ تورکیا. بەڵام هێندەی پێناچێت بەهۆی جیاوازی بیرو بۆچوونی لەگەڵ تورکە گەنجەکان و هەستی نەتەوە پەرستی و شۆڤینیستی و هەروەها پشتیوانی کردنیان لە سوڵتان لێیان دوور دەکەوێتەوە خەریکی نووسین دەبێت و دەزگای چاپەمەنی "ئیجتیهادی - خەباتی" دادەمەزرێنێ.

دۆست و هاوشاری عەبدوڵڵا جەودەت، دوکتور ئیساق سیخوتی ئەمیش لایەنگریی کۆماریی بوو، ماوەیەکی زۆر لە پاریس و جنێف ژیا، دوکتۆر ئیساق یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی پارتییە شۆڕشگێڕەکانی تورکیا و هەمیشە دژی سوڵتان و خەلیفە بوو،

هەروەها لایەنگری جیابوونەوەی کوردەکان بوو و لایەنگری ئازادی و یەکسانی تـەواوی گەلانی ئیمپراتوورییەتی عوسمانی بوو. دوکتور سیخوتی لە ئیتالیـا بـە نەخۆشـی سـیل مـرد و پـاش ڕاگـەیاندنی یاسـای بنـەڕەتی لاشـەکەی هێنرایـەوە بـۆ ئەسـتەنبوول و بەڕێوڕەسمێکی تایبەتەوە نێژرا.

تورکە گەنجەکان کە دەسەڵاتیان گرتە دەست، کوردێکـی وەك عـەبدوڵڵا جـەودەت یان نزیك نەکردەوە لە خۆیان، بەڵکو کەسانێکی وەك فەوزی، سلیمان نازیف یان هێنایە لای خۆیان کە خیانەتێکی زۆریان کردووە بەرامبەر بە بیرو باوەڕی نەتەوایەتی کوردی و هاوکـاری تورکـەکانیان کـردووەو لـە جێبـەجێکردنی بەرنامـەی بـە تـورك کردنـی کوردەکاندا لە بری ئەوەی ئۆتۆنۆمییەکی بەربڵاویان بدەنێ.

لەنـاو ئـەو کوردانـەی کـە لـە پـارتی تورکـە گەنجـەکان دوور کەوتنـەوە، هـەندێکی خۆپەرستیشـیان تێـدا بـوو وەك شـەریف پاشـای کـوڕی سـەعید پاشـا. سەعید پاشـا لـە بنەماڵەیـەکی نـاودار بـوو، لـە وەزارەتـی دەرەوەی تورکیـا لـە سـەرەتادا وەك کـاتبێك دامـەزرا، ئیـتر وردە وردە پلـەی بـەرز بوویـەوە تـا گەیشـتە پلـەی وەزیری دەرەوە لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولحەمیددا. لە ڕاپـەڕینی ئەرمەنییـەکاندا، ناوبراویـان وەك کـورد هێنایـە پێشـەوە کـە سیاسـەتی ئەرمەنـەکانی پەسـەند نـەکرد. شـەریف پاشـای کوڕی سـەعید پاشـا، لـە قوتابخانـەی نـیزامی خوێندویـەتی و هیـچ ڕۆڵێکـی نـەبوە لـە خزمـەت کردنـدا تـەنیا ئـەوە نـەبێ کـە کـوڕی سـەعید پاشـا بـوو. هێنـدەی پـێ نـەچوو سـەعید پاشـا گەیشـتە پلـەی ژەنـەڕاڵی و بـوو بـە بـاڵیۆز لە ستۆکهۆڵم. جگە لەوە شەریف پاشا لە لاویەتیدا زمـانی دەگـرت و بـە تـەواوی قسـەی بۆ نـەدەکرا، بـەڵام پاشـتر چـاك دەبێتـەوە بـە کورتـی نـاوبراو هـەموو شـتێکی لـە ڕژێمـی کۆنـەوە وەرگرتـووەو هیـچ کـاتێك دژی ئـەو ڕژێمـە هەڵوێستێکی نـەبوە، پـاش ڕاگەیاندنی یاسای بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەسـتەنبووڵ و دەمـامکی خـۆی دەگۆڕێـت و هـەوڵ دەدات ببێتـە وەزیـری جـەنگ بـەڵام سـەرناکەوێت و دژی پـارتی "یەکیـەتی و پێشـکەوتن" ڕادەوەسـتێت و دەبـێ بـە ئـەندامی پـارتی "حورییـەت و ئیئتیـلاف" کـە پارتێکی لیبرال بووە.

شەریف دەچێتە پاریس و لەوێ گۆڤارێك دەردەكات بە ناوی "مەنلورییەت" واتە یاسای بنەڕەتی. لە گۆڤارەكەدا هێرش دەكاتە سەر توركە گەنجەكان و بەرگری دەكات لە سیستەمی خەلافەت و سوڵتان و دژایەتی كۆمەڵەی كوردی دەكرد. ساڵی *1918* جارێكی تر دەمامكی خۆی دەگۆڕێت و خۆی دەكا بە كوردێكی نیشتمان پەروەر و هەر لە پاریسەوە داوای مافی كوردی دەكرد و تا كۆمیتەی كوردی نارەزایی خۆی دەرنەبڕی بەرامبەر خۆتێهەڵقورتاندنی ئەو هەر بەردەوام بوو. ئەوە بوو پاشان لە كوردایەتی وازی هێنا تا هەلێكی باشتری بۆ ڕەخساو دەستی پێكردەوە. ئەم جۆرە كوردانە بوونە هۆی بەدناو كردن و لەكەدار كردنی مەسەلەی كورد.

بە گشتی لەناو كورداندا هەمیشە پیاوانی شۆڕشگێڕ هەبوەو دژی خەلافەت خەباتیان كردووەو ژیانی خۆیان بۆ ڕزگار كردنی تەواوی گەلانی چەوساوە تەرخان كردووەو بەرهەمەكانیان لەلایەن توركە گەنجەكان و شۆفینیستەكانی ترەوە كەڵكیان لێ وەرگیراوە. ئێستا هەرە راسترەوەكانی توركیای ئەمڕۆ لە ڕێگای هەندێ كوردی شۆڕشگێڕی خراپەوە دەیانەوێ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد جیابكەنەوە.

*1925/4/8*

## ڕاپەڕینی كورد.

ڕۆژنامەكانی توركیا هەندێ هەواڵی راست لەسەر بزووتنەوەی كورد ڕا دەگەیەنن، بواری ئەوە ئەدەن تا ڕادەیەك تابلۆیەكی روون لەسەر چۆنیەتی بزووتنەوەكە و ئەو ناوچانەی كە ڕاپەڕینەكەیان گرتووەتەخۆ، بكێشرێت. ناوچەی بزووتنەوەكە دەكرێ بڵێین تەواوی ناوچەكانی سەرەوەی فورات لە ئەرمەنستانی توركیایە. ڕوونتر بڵێین ناوچەكانی نێوان دیار بەكر و خارپووت، موش و بتلیس، كە دەكەوێتە نزیكەی دوو سەد كیلۆمەتر لە باكووری سنوورەكانی سووریاوە، لەو ناوچانە و شوێنە كورد نشینەكانی تر بارودۆخی تایبەتی سەربازی تیایدا ڕاگەیەنراوە بۆ ماوەی مانگێك.

بیانوویەك كە لە مێژە بووەتە هۆی ڕاپەڕینی سەعید و شێخەكانی تر ئەوەبوو كە لە *1925/2/11*دا تێك هەڵچوونێكی بچووك ڕوویدا، لەو كاتەدا كە سەربازی تورك دەیانویست دوو كەس لە موریدەكانی شێخ سەعید دەسگیر بكەن، كە لە لایەن دادگاوە فەرمانی گرتنیان دەرچوو بوو بە هۆی ئەنجامدانی تاوانەوەو شێخ سەعید ئامادە نابێت ئەو دوو نەفەرە بداتە دەستی ژاندارمەكان و لە ئەنجامدا بەیەكدا هەڵدەچن و چەند ژاندارمێك بریندار دەبن و فەرماندەكەیان بەدیلی دەگیرێت. ئەو ڕووداوە دەبێتە چەخماخەی ڕاپەڕین.

هۆی راستەقینەی ڕاپەڕینەكە ئەوە نییە (وەك زۆر جار ئاماژەی پێكراوە) كە بە ڕواڵەت بە هۆی پەیوەندیی نێوان شێخ سەعید و كار بە دەستانی توركیا بێت، بەڵكو زۆر لەوە قووڵترە. سەرەڕای ئەوەی كە ڕاپە ڕینەكە ڕووداوێكی چاوەڕوان نەكراو بوو بۆ دەوڵەت، بەڵام كاربەدەستانی توركیا بەرامبەر بەسەرهەڵدانەكە دەسەپاچە نەبوون پلانی سەركوتكردنی بزووتنەوەكە لە لایەن باشترین ئەفسەرانی ستادی سوپاوە بەبێ هیچ دواخستنێك ئامادە كرا. وەرزی زستان، بێ ڕێگایی، دووری ناوچەكانی ڕاپەڕین لە ناوەند، ناردن و مۆڵدانی سوپای دەوڵەتییان زۆر دواخست لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەدبینییەك لە ناو دارودەستەی دەوڵەتی توركیادا بەدی نەدەكراو لە ئانكەرە باوەڕی تەواویان هەبوو كە هەر چۆنێك بێت كوردەكان ناتوانن دەوڵەتی ئیستای توركیا لە ناوبەرن.

ئانكارا لەو باوەڕەدا بوو كە گواستنەوەی سوپای توركیا بە ناو خاكی سووریادا بەبێ هیچ گێرەو كێشەیەك جێبەجێ دەكرێت و لە لایەن كار بەدەستانی فەرەنسییەوە پێشوازییان لێدەكرێت.

ڕۆژنامەی "تەن" ئەم یاداشتەی دەوڵەتی توركیای بڵاوكردووەتەوە سەبارەت بە نارد نی هێزەكانی خۆی بە ناو خاكی سووریادا. "لەبەر ئەوەی كە ڕاپەڕینی كوردەكان دەوڵەتی توركیایان ناچار كردووە هێزەكانی خۆی ئامادە بكا بۆ سەركوتكردن و دامركاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینە و، بۆ ناردنی ئەو هێزانە دەوڵەتی توركیا دوو ڕێگای لەبەردەمدایە. یەكەم گواستنەوەی هێزەكان لە ڕێگای تەرابزون و ئەرزرۆمەوە كە ئەمە

زۆر دووره و لەبەرسەختی ناوچەکە لە باری جوگرافییـەوە زۆر زەحمەتـە، دووهـەم لـە ڕێگای شەمەندەفەری (قونیە - ئەدەنـە)وە بگوێزرێنـەوە. ئـەم ڕێگایـە زۆر کورتـە و لـە ماوەیـەکی کـەمدا هێزەکـان دەگەنـە ناوچەکـە. دیـارە ئـەم ڕێگایـە بـە خـاکی سـووریادا تێدەپەڕێت و گواستنەوەی هێز بە بێ وەرگرتنی مۆڵەت و ئاگاداری فەرەنسە جێبـەجێ ناکرێت. بۆیە دەوڵەتی تورکیا داوا لە دەوڵەتی فەرەنسە دەکات کە ئیجازە بدەن سوپای تورکیـا بـەناو خـاکی سـوریادا بگوێزرێنـەوە بـە مەبەسـتی گەڕاندنـەوەی ئـارامی و هێمنایەتی بۆ یەکێك لە ناوچەکانی تورکیا".

دەوڵەتی فەرەنسا کە زانی ئەم جموجووڵە سەربازییە بۆ کارێکی ناوخۆی دەوڵەتـە و لەو ناوچانەدا ئارامی هەیە و لە لایەکی ترەوە فەرەنسـا دەیـەوێ دۆسـت بێـت لەگـەڵ تورکیادا، ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ گواستنەوەی هێزەکە بە ناو خاکی سووریادا.

*1925/4/9*

## -چالاکی دژی کوردەکان-

لەم کاتەدا لە دیار بەکر و ناوچەکانی دەوروبەری بارودۆخەکە ئارامە. لە ناوچەی سیڤەریك، دانیشتووانی هەندێك گوند کە لـە ژێـر دەسـتی ڕاپەڕیوەکاندایـە هاتوونەتـە ڕیـزی هێزەکـانی دەوڵەتـەوە کـە لـە ناوچەکـەدان و بەشـداری سـەرکوتکردنی سەرهەڵداوەکان دەکەن. لە ڕۆژهەڵاتی خارپوتدا چەکدارەکانی ژێر دەستی فەخمید بابا تێکشکێنران و زیانێکی گەورەیان لێکەوتووە. دوو بە تالیونی پۆلیس کە لە دانیشتوانی ناوچەی (کیرلی) نزیك (گیگی) پێکهاتوون ماوەیـەك بـەر لـە ئێستا نـێردراون بـۆ شـەڕ لەگەڵ ڕاپەڕیوەکاندا.

## -دیسانەوە سمکۆ-

ئاشنای کۆنی (تیفلیس)مان (سمکۆ) یا (سیمیتکۆ) وەك لەم ڕۆژانەدا ناوی دەبەن، دیسانەوە سەری لە فارس (ئێران) دەرهێناوە. ماوەیەك لەمەوبەر وەك مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ڕابوردوو، سمکۆ بە پەیامنێری ڕۆژنامەی "جمهوریەت"ی ڕاگەیاندبوو، کە ئەو نایەوێ لە برا تورکەکانی جیا ببێتەوە (بڕوانە ژمارەی *708* و *738* ی زاریا وەستوك)، چونکە خۆی خەڵکی ئەوێیە و لەگەڵ فارسەکان ناتوانێت بژیت، سمکۆ هاتە تورکیا بۆ ئەوەی پشتگیری لە تورکیا بکات لە خەباتدا بۆ وەرگرتنەوەی ویلایەتی مووسڵ و ئامادە بوو کە خوێنی جەنگاوەرە دلێرەکانی لە پێناوی بەرژەوەندی تورکیادا بڕێژێت. سمکۆ لە سەردەمی جیاجیادا لایەنگیری لە روسیا و لە تورکیا و هەروەها لە فارس و ئینگلیزەکانیش کردووە و ئێستاش دووبارە لایەنگیری لە تورکەکان دەکات و هەندێ جاریش لەگەڵ هەردوولادا بووە. هەروەها ئەو لای پەیامنێرەکان دانی بەوەدا نابوو کە ڕووسەکان گومانیان لە دۆستایەتی ئەو هەبوە کاتێ کە ناردبوویانە تیفلیس بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ڕووسەکاندا.

زۆر لە مێژ نییە کە سمکۆ بە فیتی ئینگلیزەکان دژی فارس (ئێران) و تورك دەجووڵایەوە، ئێستا سمکۆ گەڕاوەتەوە (چارێك قەلا) نزیکی کۆنەشار. جاری دوایین کە سمکۆ خۆی دابووە دەستی تورکەکان پاییزی ساڵی ڕابوردوو بوو. ناوبراو پێشبینی ڕاپەڕینی گشتیی کوردەکانی نەکردبوو، هەر بۆیە بە باوەڕێکی تەواوەوە ئامادەیی خۆی دەرخستبوو بۆ نۆکەرایەتی تەواوی تورکە کان. بەڵام بارودۆخەکە بەشێوەیەکی تر هاتە پێش و بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت پێشی رەوتی ڕووداوەکان بگرێت و لەبەردەم لافاوی چاوەڕوان نەکراوی بەربەستە روخاوەکەدا خۆی ڕاگرێت ئەگەر ئەو لەگەڵ تورکەکان ڕۆیشتبا، بێگومان ئێستا کوژرابوو، هەر بۆیە ئێستا لە ئێران سەری هێناوەتە دەرێ و خۆی گەیاندووەتە ئەوێ، چونکە ئێران زوو ڕابوردوو فەرامۆش ئەکات و وڵاتێکی

سارشکارە. ئەو باوەڕی تەواوی هەیە کە لە ئـێران بـە هـۆی ئـەوەوە کـە چـەند مـانگێك لەمەوبەر هێرشی کردبوە سەر بەڕێوەبەرایەتی ئێران دادگایی ناکرێت.

شێخ سەعید گوتبووی، "تەنانەت هەموو فوتابییەکیش دەزانێت کە لە دژوارترین کاتدا کە مرۆڤ ڕێگای دەربازبوونی نامێنێت، دەست دەبا بـۆ تـیر و شمشـێر." و هـەموو لـەو بـاوەڕەدان کـە ئـەو ناچـار بـووە ئـەم ڕێگایـە بگرێتـە بـەر. بـەڵام ئەمـە بـە هیـچ شێوەیەك راست نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە خۆی لە لێدانی ئەو شمشـێرەی کـە بـە سـەر سەریەوە بوو ڕزگار بکات.

مەبەستی گەڕانەوەی سمکۆ بۆ ناو ئێران لای هەموان ئاشکرایە. نـاوبراو چـاوەڕێی ئەوە دەکات کە ئەنجامی ڕووداوەکانی بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەگـەر تورکـەکان سـەر بکـەون سمکـۆ پێیـان دەڵێـت، وەك کوردێـك نـەیدەتوانی دژی بـرا کوردەکـانی خـۆی ڕاوەسـتێت بەڵام نەیشیدەویست دژی تورکەکان شەڕ بکات، لەبەر ئەوە بە باشـتری زانیـوە ڕا بکاتـە ئـێران تـا لـە بـەرەنگار بوونـەوە لەگـەڵ دۆسـتە تورکـەکانیدا دوور بێـت، ئەگـەر کوردەکانیش سەرکەوتن ئەوا پێیان دەڵێ کە لە دەستی تورکـەکان هەڵهاتووە بـۆ ئـێران تا تورکەکان نەتوانن دژی هاو خێڵەکانی کـەڵکی لێوەرگـرن، لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەڵێنێکی بە تورکەکان دابوو کە لە بەرژەوەندی ئەواندا شەڕ دەکات، بە هاتنەکەشی بۆ ئێران لـە پێناوی بەرژەوەندی کوردەکاندا دەجووڵایەوە.

سمکۆ وێنـەی دیپلۆمـاتیکی کـوردە کـە هیـچ فوتابخانەیـەکی نـەدیوە، نـە ئـەندامی کۆمەڵـە کـوردی پێشـوو بـووە و نـــە هیـــچ دەورەیـــەکی بـــۆ ئامـــادەکردنی تایبـــەتی بـــۆ کەسایەتییەکی سیاسی نەبینیوە. دواکەوتن و ئاگادار بوون لە کاروبـاری سمکـۆ و ژیـانی جۆراو جۆری ناوبراو زۆر بە کەڵك و سەرنج ڕاکێشە.

### -لە کوردستان- *1925/4/23*

لـــە کوردســـتانەوە ئـــەوە رادەگەیـــەنن کـــە هـــێزە ســـەرکوتکەرەکانی تورکیـــا ســـەرکەوتووانە لـــە باشـــوورەوە بـــەرەو رووژهـــەڵات پێشـــڕەوی دەکـــەن. ئـــەم هـــێزە

سەربازییەی تورکیا لە سەرەتای مـانگی چـوارەوە هاتوونەتـە دەوروبـەری پـالو، ئارگـان، ماردین، کیل، خانی. ڕاپەڕیوەکان ناوێـرن خۆیان لە قەرەی شەڕ بدەن و ناوچـەی نێـوان موش، وارتا بە تەواوی لە چەتــە چـەکدارەکان پـاك کراوەتـەوە پـەیوەندی ڕاپـەڕیوەکان لەگەڵ ناوچەکانی ڕۆژئاوای ڕاپەڕینەکە پچڕاوە.

## بـارودۆخی شڵەژاوی نـاوچەی ئـارتەوین

***1925/5/13***

ئارتـەوین. *5/11*: لـە کۆتـایی مـانگی چـواردا لــە ناوچــەی ئارتــەوین بانگــەوازێك بڵاوکرایـەوە لـە لایـەن دەوڵـەتی تورکیـاوە بـۆ زاپاســەکانی ســوپای تورکیــا (ســەربازی یەدەك) کە ئامادەبن بۆ ئەوەی بنــێردرێن بـۆ بـەرەکانی شـەڕی کوردسـتان. لـەم بـارەوە هـەندێ لـە کۆنەپەرسـتانی ناوچەکە مـەلا و دەرەبـەگ و کـۆڵاك و.. دەسـتیان کـرد بــە پڕو پاگەندە و چالاکی نواندن و داوایان لە دانیشتووان کردووە کـە نـەڕۆن بـۆ خزمـەتی سەربازیی و بە گشـتی گوێڕایـەڵی دەسـەڵاتدارانی "ناقـانونی" نـەبن. لـە سـەرەتادا ئـەم پڕوپاگەندەیە هەندێ سەرکەوتنی بە دەست هێنا و لە ڕاستیدا ژمارەیەك لەو سـەربازە یەدەکانە لە ڕۆژانی یەکەمی بانگەوازەکەدا ئامـادە نـەبوون لـە ئۆردووگاکانـدا بـەڵام لـە ئەنجامدا ملیان دایە بەرو خۆیان تەسلیم کرد، دەوڵەتیش نزیکەی چل نەفەر لەمـەلا و کۆنەپەرستەکان و ئەوانەی دژی دەوڵەت چالاکییان دەنواند، گرتن.

## وانەکانی ڕاپەڕینی کورد.

***.1925/5/17***

ڕۆژنامـە نووسـی فەرانسـەوی (ژان تـیزون) کـە لـە قـەوقازە و لای ئێمـە ناسـراوە، سەبارەت بە بـیرەوەریی خـۆی لەسـەر بـیروڕای خـەڵکی تورکیـا بەرامبـەر بـە ڕاپـەڕینی کوردەکان کە ماوەیەك لەمەوبـەر ڕوویـداوە، لـە ڕۆژنامـەی (تـان)دا چـەند نووسـینێکی

بڵاو کردووەتەوە، لەگەڵ ئـەو نووسـینانەی کـە ڕۆژنامـە نووسـەکانی ئێمـە لەسـەر ئـەو ڕاپەڕینە بڵاویان کردووەتەوە یەك دەگرنەوە.

ئـەو بیرەوەرییانـە کـە بـە نــاوی (نامــە لــە ئەســتەنبوولەوە) ژانتــی زۆن بــڵاوی کردوونەتـەوە، ئـەوەندە جێی سـەرنجن، بایــەخی ئــەوەیان هەیــە کورتەیــەکیان بــڵاو بکەینەوە. لە سەرەتادا مەترسی ئەوە هەبوو کـە ڕاپـەڕیوەکان نـەك هـەر بـە تـەنیا بـە چەك چەکدارن بەڵکو بە قورئانیش چەکدار کراون و لە لایەن هەندێ لە دانیشـتووانی تورکیاوە هاوسۆزییان لەگەڵ دەکرێت. جوتیارەکانی تورکیا لەگەڵ هاونیشتمانەکانی تــر کە بینییان، دەیانــەوێ ڕاپەڕینەکـە لـە کوردسـتانەوە بهێننـە تورکیـا، بەشێوەیەکی بـێ مەیلانــە خۆیــان لــە پڕوپاگەندیسـتەکان کشـاندەوە و لێیــان دوور کەوتنــەوە. شــارە تـورك نشـینەکان یـەك لـە دوای یـەك سـەربەخۆیانە بـۆ خۆیـان پێکــەوە دەســتیاندایە ڕێکخســتنی دەســتە خۆبەختکــەرەکان بــۆ بــەرەنگار بوونــەوەی ئـــەم پیلانـــە. هـــەر چـەکدارە خۆبەخشـەکان بـوون، نـەك هـێزە دەوڵەتییـەکان کـە هێرشـی ڕاپـەڕیوەکانیان بـۆ سـەر (ئەلعـەزیز) پەرچدایـەوە. لـە یەکـەم ڕۆژانـی ڕاپــەڕیندا هــەموو چــین و توێــژی دانیشــتوان، لــە ڕووناکبیرانــەوە بگــرە تــا کــۆڵ کێشــەکانی ئەســتەنبوول بـــە پەلە پشتیوانی خۆیان بۆ دەوڵەت دەربڕی و ئامادەیی خۆیان بـۆ هـەموو قوربـانیدانێك پیشاندا.

لەم بارەیەوە بزووتنەوەی کورد وەك تاقیکردنەوەیەك وا بوو بۆیـان و بـە ئاشـکرا دەریخست کە هەستی نیشتمانی گەلی تورکیـا لـە خـەو هەسـتاوە و لـە بـارودۆخێکی وادا بوو کە مەجلیسی تورکیا یاسای خیانەت بە نیشتمانی پەسەند کرد، کە تیـایدا هـاتووە: هەر کەسێك بۆ گەیشتن بە مەبەسـتی سیاسـی لـە بـیرو بـاوەڕو هەسـتی ئـایینی خـەڵك کەڵك وەربگرێت بە خیانەتکار لە قەڵەم دەدرێت.

لـەم دواییانـەدا لـە ئەسـتەنبووڵ بــە شــەپقەو کــڵاوی نیـزامییــەکانی دەوڵەتــەوە نیشانەی سەرکەوتن دەبینرێت. ئەم نیشانە سەر لە نوێژکەرەکان دەشـێوێنێت لـە کـاتی سوجدە بردندا کەشتی وا پێشتر لە تورکیادا نەبوە ئەمەش هەنگاوێکی پێشکەوتووانەی دەوڵەتـە. بـۆ یەکـەم جـار لـە مێــژووی تورکیــادا فەرمانبــەرانی بــە ڕۆژوو لــە مــانگی

ڕەمەزاندا لە ئیش ئازاد نەکران. لە سەردەمی دەسەلاّتی ئەنوەر پاشادا، ئەو ئەفسەرە ژنانەی دەردەکرد کە دەچوونە قاوەخانەکان. بەلاّم ئێستا ژنی تورك دەتوانێت لەگەلّ مەسیحییەکان بە ئازادیی هەلّپەڕێت. ئێستا هەر تورکێك بگری پێت دەلّێت ئایین نابێت دەست لە کاروباری ڕۆژانەی ژیانی دانیشتووان وەربدات و هەروەها مەجلیسی تورکیا بڕیاری وەرگێڕانی قورئانی بۆ زمانی تورکی پەسەند کردووە کۆمسیۆنێکی تایبەتی پێکهێناوە بۆ سەرپەرشتی کردنی وەرگێڕانەکە کە چۆن بێت و بە چ مەبەستێك دەنووسرێت. ڕاستە کە لە یاسادا ئیسلام وەك ئایینی دەولّەت ناوی هێنراوە، بەلاّم پەیوەندی کۆمەلّ و ئەنیستوتەکانی بە ئیسلامەوە هەمووی بچڕاوە. هەموو تورکێك دەزانێت کە ئیسلام کوێرەوەری و بەدبەختییەکی زۆری تووشی گەلی تورك کردووە.

بۆچوون و بینینی ڕۆژنامەنووسی فەرەنسەوی بۆ جارێکی تر ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ڕاپەڕیوەکان کە بەناوی ئایینەوە هاتبوونە مەیدانەوە لە کۆمەلگادا جێیان نابێتەوە.

## ڕاپەڕینی کوردەکان

*1925/5/21*

ڕۆژنامەکانی ئینگلیز بلاّویان کردەوە کە لەگەلّ ئەو ڕێبەرە کوردانەی لە دیار بەکر هەلّواسران چوار کەسی تر کە بەشداری ڕاپەڕینەکەیان کردووە لە بیتلیس لە سێدارەدراون، یەکێك لەوانە ئەندامی پێشووی پەرلەمانی تورکیایەو یەکێکیشیان مەلا بووە. هەر بە گوێرەی ئەو ڕۆژنامانە ژمارەیەك لەوالی و فەرمانبەرانی دەولّەت کە لە لایەن کوردەکانەوە بە دیل گیرابوون لە لایەن سوپای دەولّەتەوە ئازادکران و ژمارەیەکی زۆریش لە ڕێبەرانی کورد خۆیان بە دەستەوە داوەو داوای لێبوردنیان لە دەولّەت کردووە.

## لەسەر ناسیونالیزمی تورکیا

بــە ســەرکوتکردنی بزووتنــەوەی کــورد کۆتــایی بــە خۆشــی وشــایی گــێڕانی کۆنەپەرستان هــات، ئێستا دادگــا تایبەتــەکانی ئانکــەرە خــەریکی گرتــن و ســزادانی راپــەڕیوەکان و هاوبیرەکانیــانن، دەوڵــەتی تورکیــا لــەو مەترســییەی کــە هەڕەشــەی لەناوچوونی لێ دەکرد رزگاری بوو، ئەویش بەهۆی سیاسەتی سیستمی نوێی تورکیاوە بــوو کــە چالاکانــە و بــە دڵسۆزییەوە پارێزگــاری لێکــرد، ئێستا دەبــێ بــە هــەڵگرتنی هەنگاوی توند و بێ بەزەییانە جێ پێی خۆی پتەو بکات.

عیسمەت پاشا لــەم کاتــە تــەنگ و ســەختانەدا، ئــەرکی ســەرۆکایەتی کۆمیســەر (وەزیرانی)انی گرتە ئەستۆ و ماوەیەك لەمەوبەر ڕایگــەیاند کــە بەرنامــەی دەوڵــەت لــە سیاسەتی دەرەوەو نــاوەوەدا ناســیۆنالیزمە، هــەر چــەند ئــەم سیاســەتە لــە دەوڵــەتی پێشوشــدا پــەیڕەوی دەکرا بــەڵام ڕانەگەیــەنرابوو ئێستا کــە مەترســی و هەڕەشــە لــە دەوڵــەت دەکرێت بــە ئاشــکرا ڕادەگەیــەنرێت. ئەگــەر بزووتنــەوەی کــوردان نــەبوایا، دەوڵەتی تورکیا وا بە ئاشکراو بە ڕەسمی سیاسەتی خۆی ڕانەئەگەیاند بــە تایبــەتی لــە سیاسەتی ناوخۆدا. عیسمەت پاشا لەوتەیەکی خۆیدا دەڵێت: ناسیۆنالیزم لــە سیاســەتی دەرەوەدا واتە کێشەی مووسڵ و هەڵوێستی تورکیای دژی ئینگلیزە

فەرنسا بــەهۆی ئــەوەوە کــە ڕێگای دا بــە تورکیــا سوپاکەی لــە خــاکی ســووریاوە بگوێزرێتــەوە پــەیوەندی خــۆی لەگــەڵ ئــەو وڵاتــە بــاش کــردووە و ســەر کوتکردنــی کوردەکانی ئاسانتر کــرد و ڕێگای بــۆ پــەرەپێدانی پــەیوەندی نێــوان ئــەو دوو وڵاتــە خۆشکرد، فەتحی بەگ باڵیۆزی نوێی تورکیا لــە پــاریس ماوەیــەك لەمەوبــەر لــە لایــەن دەوڵەتی فەرانساوە گەرمترین پێشوازی لێکــرا. مامۆســتای فەرانســەوی بــۆ تورکیــا بــانگ کراون کە لە قوتابخانەکان وانە بە منداڵان بڵێنەوە، چاپەمەنییەکان لەم بارەوە باس لە دەوری باشی کولتوری فەرەنسا دەکەن لە تورکیادا.

ناسیونالیزم لــە سیاســەتی دەرەوەدا بــەو مانایەیــە کــە دەوڵــەتی تورکیــا داوا لــە وڵاتانی بێگانە دەکات کە نوێنەری دیپلۆماتی هەمیشەییان هەبێت لە ئانکەرە. تا ئێستا

دیپلۆماتە ئەوروپییەکان بە بیانووی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی مەلاریا لە ئانکەرە نەدەهاتنە ئەوێ و لە ئەستەنبووڵ دەمانەوەو بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵیان دەوڵەتی ئانکەرە نوێنەری دەنارده ئەستەنبووڵ بۆ لایان، بەڵام ئێستا پۆستی نوێنەرایەتی لابراوەو وڵاتانی بێگانەش ناچار بوون بێنە ئانکەرە بۆ پەیوەندی کردن.

بەشێکی زۆری سوپای تورکیا هەروا لەسەر سنووری مووسڵ ماوەتەوە دەوڵەتی ئانکەرە دەڵێ ئەمە لەبەر ئەوەیە کە گوایا بزووتنەوەی کوردەکان بە تەواوی سەرکوت نەکراوە. وا دیارە دەوڵەتی تورکیا کۆتایی بە چالاکی سەربازیی ناهێنێت، تا دادگاکان کۆتایی بە کارەکان دێنن و سزای بەشداربووانی ڕاپەڕین دەدەن.

بیروڕای گشتی لە تورکیا و هەروەها هی دەوڵەتیش لەسەر ئەوەیە کە باوەڕ بە دەوڵەتی ئینگلیز ناکرێت و لایان وایە کە ئەو دەیەوێ لە کێشەی مووسڵ باڵکانێکی تر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروست بکات و ڕۆژنامەکانی ئێمەش لە ڕابوردوودا زۆر جار ئەم مەسەلەیان باس کردبوو.

پەسەندکردنی یاسای چاپەمەنییەکان زۆرتر دژی لایەنگرانی دەورگێڕانی ئەوروپایی و کاپیتاڵی ئەوروپاییە لە تورکیا، کە لە سەردەمی ڕاپەڕینەکەدا بەشێوەیەکی بەربلاو پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرد.

سەربەخۆیی تورکیا کە بە تێکۆشانێکی زۆرو بە زەحمەت بە دەست هاتووەو ڕاگیراوە، دووبارە لە لایەن ئیمپریالیستەکانەوە کەوتووەتە مەترسییەوەو کاتی ئەوە هاتووە کە هەنگاوی هەرە توند و تیژی بێ بەزەییانە بۆ پاراستنی هەڵبگیرێت.

سەرنووسەری زۆر گیراون و ژمارەیەك لەوانە سزایەکی قورس دراون. حوسین جاهید سەرنووسەر و خاوەن ڕۆژنامەی "تانێك" لە وڵات دەرکراوە. یاسای نوێی چاپەمەنیی، دەرفەتی بچوکترین ڕەخنە لە دەوڵەت و تەنانەت بۆ تاقە کەسانی دەوڵەتیش نادات. ڕۆژنامە بۆرژوازییەکانی ئەوروپا لەم بارەوە دەڵێن کە ئەمە هێرشێکە بۆ سەر چاپەمەنی تورکیا و لەناو بردنیەتی و ئەگەر بێت و بەردەوام بێت ڕۆژنامەنووسەکانی ئەوروپا ناتوانن هیچ شتێك لەسەر تورکیا بزانن.

## دوای ڕا پەڕینی کوردەکان.

ڕاپــەڕینی کوردەکــان چیــتر، لای دانیشــتوانی ئەســتەنبووڵ و کــار بــە دەســت و بازرگانــەکانی ئەنکــەرە، ئــەو هــەرا و هوریایــەی جــارانی نــەماوە، تەنانــەت هەڵواســینی سیناتۆری سوڵتان، واتە عەبدولقادر و پرۆسەی دادگایی کردنی شێخ سەعید هیچ شادی و ناخۆشییەکی بە دواوە نەبوو بۆ ئەوان.

کۆماری تورکیا هێز و دەسـەڵاتی خـۆی لەگـەڵ دیسـیپلینی سـەربازی و دەزگاکـانی دەوڵەتی پیشانداو دەسەڵاتی حاکمە نیمچە وەحشییە کێوییەکانی نەهێشت و لـە دادگا سەربەخۆ و تایبەتەکاندا کارو کردەوە کانیانی ئاشکرا کردو بە سزای خۆیانی گەیاندن، پاش سەرکەوتن بەسەر یۆنانییەکاندا، ڕێگای نوێکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی گرتەبەر.

ڕاپەڕینی کوردەکان لە دەرەوەی کوردستان ڕێکخراوە و کێشەی ئـاڵوگۆڕی نـاوخۆی تورکیای هێنایە پێش. ئێـستا کۆمیـسیونێکی تایبـەتی چووەتـە ناوچـەی ڕۆژهـەڵات بـۆ لێکۆڵینــەوە لــە بــارودۆخی ویلایەتــەکان. دوای ڕاپەڕینەکــە دەســەڵاتی ئیداریــی لــە ناوچەکاندا بەهێز دەبێ و دەسەڵاتی سوپا و دادگایی کەمتر دەکرێتەوە.

تو ركیا ئێستا بووەتە خاوەن هێزی دەریایی و بۆ ئاسـانتر کردنـی بازرگـانی لەگـەڵ ئــێران و بازرگانــە ئێرانییــەکان کــە بازرگانییــەکی زۆریــان لەگــەڵ تورکیــادا هەیــە، دەستکراوە بە چاك کردنـەوەی ڕێگـای ترابـزون - ئـەرزرۆم، کـە بـۆ هـەردوو وڵات ئـەم ڕێگایە هەم کورتتر و هەم هەرزانتر دەکەوێت.

پــاش ســەرکوتکردنی ڕاپــەڕینی کوردەکــان، ئێــستا ڕابــەرە ناودارەکانیــان داوای لێبــوردن لــە دەوڵــەتی تورکیــا دەکــەن و ئامــادەیی خۆیــان بــۆ ســزا وەرگرتــن لــە ســەرکردەکانیان دەردەبــڕن و هــەروەها ئامــادەیی خۆیــان بــۆ خزمــەتکردنی تورکیــا و دڵسۆزییان بەرامبەر بە دەوڵەت پیشان دەدەن.

تـا ئێسـتا تـەنیا پرۆسـەی دادگـایی كردنـی شـێخ سـەعید و چۆنیـەتی هـاتنی بـۆ دیاربەكر ئاشكرا بووە. شێخ سەعید لەگەڵ (*28*) كەس لە هاوكـارە نزیكـەكانی هێـنراوە بۆ دیار بەكر و زاراواكەیشی لەگەڵدایە و لەوێ چاوەڕوانی دادگایی كردنە.

لە دادگایی كردنەكەی شێخ سەعیددا، چۆنیەتی ڕاپەڕینەكە ئاشكرا بـوو هـەروەها ئـەوەش دەركـەوت كـە تـاقم و گرووپـی پێشـوازییان لـەم ڕاپەڕینـە كـردووە یـەكێك لـە نوێنەرانی ئەم تاقمانە سیناتۆر عەبدولقادر بووە. ناوبراو كـوردە بـەڵام بـە پـیرو بـاوەڕ كۆنەپەرسـتە، هـەموو ژیـانی خـەریكی پێـلان گـێڕان و ئاژاوەنانـەوە بـووە، لـەم ئاژاوەگێڕانەی كوردەكاندا جێگای خۆی دۆزییەوە.

## جارێكی تر لەسەر ڕا پەڕین و ڕیفۆرم لە كوردستان

*.1925/6/3*

لەسەر پێویستی ڕیفۆرم لە كوردستان زۆر نووسراوە و ئێسـتاش هـەر دەنوسـرێت، هەم لە توركیا و هـەم لـە دەرەوەشـدا، ئەوانـەش كـە نووسـیویانە هـەموویان كەسـایەتی سیاسـی نـاودار یـاخود كەسـایەتی كۆمەڵایـەتی بـوون كـە بـە ئـەركی سەرشـانی خۆیـان زانیـوە ئامـاژە بـە جێبـەجێكردنی ئـەو ڕیفۆڕمانـە بكـەن كــە ئــەمڕۆ لــە كوردســتاندا پێویستن، بـەڵام ئـەو ڕیفۆرمانـە تـا ئێسـتا نـەكراون و دیارنییـە بكرێـن، ئایـا پێویسـتە بكرێن؟ ئایا دەكرێن؟.

پێویســتە هیــچ نــەبێت شــتێكی كــەم لەســەر كوردســتان بزانیــت بــۆ ئــەوەی گیروگرفتـەكانی جێبـەجێكردنی ڕیفـۆرم لـەم ناوچەیـەدا بزانرێت، بـە تایبـەتی لەبـەر ئـەوەی كـە توركــەكان خۆیــان زۆر خــراپ لــە كوردســتان تێگەیشــتوون و زۆر خــراپ دەیناســن. خۆڕایــی نــەبوو كــە (كـیرزون) لــە لــۆزان گوتبــووی: زانیــاری ئەفســەرە ئینگلیزەكـان لەسـەر كوردسـتان زۆر زۆر لـەهی توركـەكان زیـاترە" لــە كوردســتان پێویستییەكی زۆر هەیە كە یەك تورك ناتوانێت ئینكاری بكـات بـۆ وێنـە لـە نـاوبردنی شێخە دەرەبەگەكان، بەڵام ئەم دەرەبەگانە چۆن لە ناو دەبرێن؟

چۆن خێڵ و هۆزە کۆچەر و ئاوارەکان نیشتەجێ بکرێن؟ ئایا دەکرێت لە ماوەی یەك یا دوو ساڵدا ئەم ئەرکە جێبەجێ بکرێت؟ چۆن لە کوردستان قوتابخانە بکرێتەوە (دەبێ بە تورکی بێت چونکە ئەنکەرە قوتابخانەی کوردی یاساغ کردووە) کاتێك کە زۆربەی کوردەکان زمانی تورکی نازانن چۆن بخوێنن؟ چۆن زەوی زار دابەش بکرێت بەسەر جوتیاراندا؟. ئەم زەوییە لە کوێ بهێنرێت؟ ئەویش لە کاتێکدا دەرەبەگەکانی کوردستان زەوی و زارێکی زۆریان لە ژێر دەستدایە، هی وایان هەیە سی تا چل گوندی هەیە و نایانەوێ ئەو زەوی و زارانەیان لە دەست دەربچێ.

کێشە و گرفتی وا لە کوردستان زۆرن و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەرە دەستێنن و دیار نییە کە ئەنجامەکانیان بە کوێ دەگات، کێشەی ڕیفۆڕم و کەند و کۆسپەکانی تەنیا لە لایەن دەرەبەگەکانەوە نییە، بەڵکو کێشەی نەتەوایەتیش لەوێ هەیە و لێرە لە لایەن کاربەدەستانی تورکیاوە هەوڵی زۆردراوە کە بیروڕای کۆمەڵگا چەواشە بکەن ئەمەش مەترسی زۆر تێدایە.

-لە سەرەتادا ڕاپەڕینی کوردەکان دژی ژاندارمە تورکەکان و بەڕێوەبەرانی تورکیا و قوتابخانە تورکییەکان بوو. ئانکەرە هەروا بەردەوامە لەسەر دان نەنان بە مافی گەلی کورد وەك گەلێکی سەربەخۆ. لە مێژ نییە خودی عیسمەت پاشا لە وتارێکیدا وتی کە ئانکەرە تەنیا یەك نەتەوە بە ڕەسمی دەناسێت ئەویش تورکە و هەر کەسێکیش دژی ئەم نەتەوەیە بێت بە توندی و بێ بەزەییانە سزا دەدرێت، چاپەمەنییە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی تورکیا هەموو ڕۆژێك دەنووسن کە نەتەوەیەك بە ناوی کوردەوە نییە و کوردەکانیش هەر تورکن و کورد وەك گەلێکی جیاواز و تایبەت بوونی نییە و بەشێوەیەکی نا سروشتی ئەم ناوەیان دروست کردووەو لە دەرەوەی وڵات ئەم وشەیە دروستکراوە.

بەم چەشنە دەتوانین بڵێین کە یەکێك لە ڕیفۆرمەکان کە بۆ کوردستان دیاریکراوە، بە تو رك کردنی کوردستانە، بە وتەیەکی تر کردنەوەی قوتابخانەکان هەر بە تورکی دەبن و کاربەدەستانی هەر تورك بن و لە ئانکەرە دابنرێن و ڕۆژنامەکان هەر بە زمانی تورکی بن و...هتد.

ئاشکرایە کە هەڵوێستێکی وا بەرامبەر بە کێشەی کورد مەترسییەکی گەورەی بۆ ئانکەرە بە دواوە دەبێت. لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان قوتابخانەو فێرگەی تایبەتی بۆ فێر بوونی زمانی کوردی دروست دەکەن و کوردەکانی دەرەوە کە نزیك بە ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا دەژین بە زمانی خۆیان دەخوێنن و لە هەموو لایەکەوە وا پیشان دەدات کە کوردیزم بە ڕەسمی دەناسیت. ئەگەر دوای ئەوەی کوردستان بە ژیانی کۆماری ئانکەرە ڕابهێنرێت و بەسەریدا بسەپێندرێت و سیاسەتی بە تورك کردنی کوردستان پەرەی پێ بدرێت و بەهێز بکرێت، ئەوا بە تەواوی ڕوونە ئەو کاتە کێشەی ڕاپەڕین لە کوردستان نەك تەنیا لە تورکیا چارەسەر ناکرێت بەڵکو دەبێتە هۆی پاڵ پێوەنان و پەرەسەندنی زیاتری و چارکردنی زۆر دژوار تر دەبێت، ئەو کاتە شێخە کۆنەپەرستەکان دەبنە خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕ لە پێناوی کوردایەتیدا و بیروباوەڕی دەسەڵاتدارانی تورکیا کە دەیانەوێت خەڵکی کورد بکەن بە تورك بە یەکدەنگی بەرەنکاری دەبنەوە و هاندەرانی کورد لە دەرەوە بیانووی زیاتریان بۆ پەیدا دەبێت و ئەو کاتە ڕاپەڕین لە کوردستان هەر چەندە بە شێوەیەکی تۆقێنەرانە و بێ بەزەییانە سەرکوت بکرێت هەر سەرهەڵئەداتەوەو لە ناو ناچێ.

لەگەڵ ئەوەشدا کێشەو گرفتی فیودالیزم کە کۆسپی سەرەکییەو دەبێ خەبات دژی بکرێت، هەر دەمێنێتەوە. ڕۆژنامەی (جمهوریەت) کە نزیکە لە دارودەستەی دەوڵەتەوە، ماوەیەك لەمەوبەر نووسیبووی کە ئانکەرە تەنیا ئەو شێخ و دەرەبەگانە لە ناو دەبات کە لە ڕاپەڕینەکەدا دەستیان هەبوەو شێخ و ئاغاکانی تر دەستیان لێنادرێت لێرەدا دەرئەکەوێت کە ئانکەرە هێشتا بڕیارێکی تەواوی بۆ لەناو بردنی فیودالیزم و جیابوونەوەی لەگەڵیاندا نەداوە.

لێرەدا شتێکی تر هەیە کە کەمالیزم بۆ جارێکی تر گومڕا بووە، ئەویش ئەوەیە کە ڕاپەڕینەکانی تری کورد واتە ئەوانەی ڕابوردوو فەرامۆش و لە یاد بکرێن ئەگەر ئەمڕۆ ڕاپەڕینی شێخ و هۆزەکانی کورد لە کوردستان وەك ڕاپەڕینی شێخ سەعید و زازاکان و ئەوانەی سەربە تەریقەی نەقشبەندین. سبەی ئەو شێخ و عەشایرانەی تر کە بە زاراوەی تر قسە دەکەن و دژی شێخ سەعید خەباتیان کردووە رادەپەڕن و ئەو

کاتە نەنیوەی فیودالیزم و نە بەشێکی لە ناو دەچێت، بـەڵکو زیانیشیان پـێ ناگـات، بـە دەسەڵات لەناوبردنی شێخێك یا ئاغایـەك کارەکـە تـەواو نابـێ بـەڵکو دەبـێ دەسـەڵات و موڵکیەتی هەموو شێخ و دەرەبەگەکان لەناو ببرێت.

لـە کۆتـاییدا سـێهەم کێشـەی ئـاڵۆز لـە کوردسـتاندا، کێشـەی زەوی و زارە ئەگـەر چـاوەڕێی ئـەوە بکرێـت کـە بـە بـەلاش زەوی و زار لـە نێـو کوردەکـاندا دابـەش بکرێـت شـتێکی بـێ مانایـە، لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی ئـەندامانی مەجلیسـی تورکیـا لـە چینـی دەوڵەمەند و ئاغا و خاوەن زەوی و زارەکانن کە زۆر زەحمەتە بڕیـار لەسـەر شـتێکی وا پەسەند بکەن. جگە لەوە دابەشکر دنی زەوی و فرۆشتنی بە جوتیاران ئەویش هەر زۆر زەحمەتە. زۆربەی دەرەبەگە تورکەکان یا بە واتەیەکی تـر شـێخ و دەرەبەگـەکانی سـەر بـە دەوڵـەت بـــە هیـــچ شـــێوەیەك ئامـــادەنین پاشەکشـــە بکـــەن و زەوی و زاری خۆیـــان تەنانەت بە فرۆشتنیش بێت بیدەن بە جوتیاران، لـە ئـاخری کـاردا هـەر دەبـێ بـە زۆر ئەوەیان پێ بکرێت. ئایا ئانکارا ئامادەیە ئەم هەنگاوە هەڵبگرێت؟ بەڵگە بە دەستەوەیە کـە پـارتی گـەل تـا ئێسـتا لەگـەڵ ئـەم هـەنگاوە نییـە، بۆیـە گومـان هەیـە لـەوەدا کـە جێبەجێ بکرێت.

ئەمانـــە ئـــەو مەترســـییە ســـەرەکییانەن کـــە لـــە جێبـــەجێکردنی ریفۆرمـــەکاندا تووشـی دەوڵـەتی ئانکـارا دەبـــن. پێویســـت بـــە دووپـــات کردنەوەیـــە کـــە هیـــچ شـــتێك نییـــە بڵێیـــت جێبـــەجێ نـــابێت. دەوڵـــەتی ئانکـــارا کـــە پێویســـتی ئـــەم ڕیفۆرمانـــە دەبینێت هەندێ کۆمیسیۆنی تایبەتی بۆ دیاری کـردوون کـە یـەکێك لـەو کۆمیسـیونانە چووەتە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لە بارو دۆخی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات. ئایـا دەوڵـەت ئـــەم ریفۆرمانـــە جێبـــەجێ دەکـــات؟. داهـــاتوو ئـــەوەمان نیشـــان دەدات. گلاڵـــەی ئـــەم ریفۆرمانـە لـە لایـەن مەجلیسـەوە کـە بڕیـارە لـە مـانگی ئۆکتۆبـەردا کۆببێتـەوە دەبـێ پەسەند بکرێت.

ئانکـەرە لەسـەرکوتکردنی کوردەکـان لەوانـە ســەرکوتکردنی نوێنــەرانی پێشــووی مـەجلیس و شـێخەکان و تەنانـەت نـەوەکانی پێغەمبـەر (سـەییدەکان) ئازایـــەتی خـــۆی پیشـانداوەو و تـەنیا ئـەوە ئەمێنێتـەوە کـە هیـوای سـەرکەوتنی بخوازێـت، ئـەم هیوایـە

دۆستانی گەلی تورکیاش دەیخوازن کە لەم بارەشەوە مەردانە بجووڵێتـەوەو ڕیفۆرمـەکان لە کوردستاندا جێبەجێ بکـات، ئـەگینا دوور نییـە چـیرۆکی گویلەکـە سـپییەکە دوبـارە ببێتەوە.

## سەیید سەعید عەبدولقادر

### زاریا وەستوك *1925/6/19*

بە پێی ئەو هەواڵانەی کـە لـە تورکیـاوە گەیشـتوون، سـەعید عـەبدولقادری کـورد بەهۆی نامەیەکەوە کە لای کوڕەکەی دۆزرا وەتەوەو بووەتە هۆی بەد ناوی ناوبراو و لـە سێدارە دراوە. ناوی سەعید عەبدولقادر پەیوەندی بە زۆر ڕووداوو زۆر کەسـەوە هەیـە کـە هـەندێ لەوانـە هێشـتا زینـدوون و لەسـەر ئیـش و کـاری سیاسـی خۆیـان هـەر بەردەوامن.

سـەعید عـەبدولقادر کـوڕی شـێخ عوبـەیدوڵڵای بەناوبانگـە شـێخ عوبـەیدوڵڵا کەسایەتییەکی ئایینی بەناوبانگە، لە کوردەکانی شەمدینانی سەر بە سنجاقی هەکارییە کە لە شەڕی *1877-1878* لە بەرژەوەندی تورکەکان دەجووڵایەوە، بەڵام لە سـاڵی *1880* دا بیری لە یەکخستنی تەواوی کوردەکانی تورکیاو ئێران کردەوە، لەو سەردەمەدا ئێران لە تورکیا زۆر لاوازتر بوو، هەر بۆیە لـە خـاکی ئـێراندا دەسـتی کـرد بـە چـالاکی. لـە ژێـر کاریگـەری ڕووسـیا کـە لـە ئازربایجانی ئـێران هەڵگیرسـانی ڕاپـەڕینی پـێ بـاش نـەبوو، سوڵتان عەبدولحەمید دەستەیەکی نوێنەرایەتی بـەرز لـە کوردەکـان پێـك دێنێـت و بـۆ لـەناوبردنی ئـەو ڕاپەڕینـە کـە عوبـەیدوڵڵا دەسـتی پێکردبـوو، دەیاننێرێتـە ناوچەکـە. کومیسیونەکە (دەستەی نوێنەرایەتی بەرزی پێکهاتوو لە کوردەکان) شێخ عوبـەیدوڵڵاو عەبدولقادری کوڕی دەگرن و دەیاننێرنە ئەستەنبوول و لەوێوە دووریان دەخەنەوە بـۆ مەککە. عوبەیدوڵڵا لە مەککە دەمرێت. بـەڵام س. عـەبدولقادر تـا ڕاگـەیاندنی یاسـای بنـەڕەتی لـە تورکیـا لـە مەککـە دەمێنێتـەوە. دوای ئـەوەی کـە هـەموو دوور خـراوە سیاسـییەکانی کـورد بـواری گەڕانـەوەیان پێدەدرێـت، نـاوبراویش دەگەڕێتـەوە بـۆ

ئەستەنبوڵ و لەگەڵ ئەوەشدا کە نەخوێندەوار بوو سەیید عەبدولقادر دەکرێتە سیناتۆر چونکە تورکەکان دەیانویست وەك داردەستێکی خۆیان لە کوردستان بە کاری بێنن.

سەرکردەکانی کۆمەڵەی کوردی سەیید عەبدولقادریان بە چاوێکی جیاواز سەیر دەکرد و سەربەخۆیانیان دانەدەنا، لەبەر سیاسەتی بە تورك کردنی کورد و کوردستان. لە سەردەمی شەڕی جیهانی ئیمپریالیستیدا کوری عەبدولقادر کە سەرکردایەتی کوردەکانی دەکرد و پاڵپشت و دڵسۆزی دەوڵەتی تورکیا بوو و هەوڵی ئەدا دژی عەبدولرەزاق و سەیید تەها و سمکۆ کە لە بەرژەوەندیی رووسیا و دژی تورك دەجووڵانەوە، ڕادەوەستێت، ناوبراو لە لایەن کوردەکانی لایەنگری رووسیاوە دەشکێت و ڕادەکاتە مووسڵ. عەبدولقادر تا ساڵی *1919* هەر بەردەوام بوو لەسەر وەفاداریی خۆی بۆ تورکە لاوەکان. کاتێك هاوپەیمانەکان ئەستەنبووڵیان گرت، ئینگلیزەکان سەرنج و بایەخێکی زۆریان دابوو بە عەبدولقادر و دەیانویست هەروەك چۆن لەسەرۆکەکانی تری کورد کە لە کاتی شەڕدا کەڵکیان لێ وەردەگرتن، لەمیش کەڵك وەرگرن.

زۆربەی کردەوەکانی سەیید عەبدولقادر لە ماوەی *75* ساڵی ژیانیدا لە خزمەت و بەرژەوەندی کۆنەپەرستانی تورکیادا بووە، تا لایەنگیری بیری نەتەوایەتی کوردی. لەم بارەوە ناوبراو جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵای باوکی هەبوو، کە کوردەکانی سەرانسەری کوردستانی تورکیا و ئێرانی ڕاپەڕاند کە تا ئێستاش ڕاپەڕینێکی وا گەورە دووبارە نەبوەتەوە.

دوای ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا کوردەکان گەلێ جار ڕاپەڕیون، بەڵام جیاجیا، واتە هەندێ جار کوردی تورکیا و هەندێ جار کوردی ئێران، س عەبدولقادر لەو دەستە و تاقمە کۆنەپەرستانەی تورکیایە کە بە کەڵك وەرگرتن لە کورد بوونی خۆی دەیویست لە کاتێکی لەباردا کۆماری لاوی تورکیا لەناوبەرن. سەیید عەبدولقادر و بیرو بۆچوونەی کە هەیبوو کەسایەتییەکی گونجاو بوو بۆ بەرهەڵستکارەکانی تورکیای نوێ.

## ئەمیری کوردستان

### زاریا وەستوك 1925/6/30.

ئـەمیری کوردسـتان شـازادە بـەدرخان کـە لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا وەدەرنـرا، بـەرەو ئینگلسـتان کەوتـەڕێ. بـەڵام کـاتێك پاپۆڕەکـە گەیشـتە (لیفـەر پـول) دەسەڵاتدارانی ئینگلیز، ڕێگای پێنادەن کە لە پاپۆڕەکە دابـەزی و پێـی ڕادەگەیـەنن کـە دەبێ بگەڕێتەوە دواوە، بـە گەڕانـەوەی بـۆ ئـەمریکا دیسـانەوە دەردەکرێـت، بـەڵام ئـەم جارە روو دەکاتە فەرەنسا شـازادە بـەدرخان داوای قـەرەبووی ئـەو سـووکایەتییەی پێـی کراوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردووە.

## دادگای سەربەخۆ

ئانکارا. دادگای سـەربەخۆ لـە دیاربـەکر، بڕیـاری مـەرگی چـەند شـێخێکی کـوردی دەرکردووە، واتە ئەو شـێخە گەورانـەی کـە یـاریدەدەری شـێخ سـەعید بـوون، پرۆسـەی دادگاییکردنی شێخ سەعید خۆی هەر بەردەوامە. شێخ حاشا لەو تاوانە دەکات کە دادگا داوی ەتە پاڵی سەبارەت بە دروست کردنی کوردستانێکی سەربەخۆ و دەڵێت مەبەست لە ڕاپـەڕین تـەنیا گەڕاندنـەوەی خەلافـەت بـووە، بـەڵام تاوانبارەکـانی تـر دانیـان نـاوە بـە مەبەستی سیاسی ناوەڕۆکی ڕاپەڕینەکەدا.

## بەخشین لە ئە نجامدانی خزمەتی سەربازیی

### زاریا وەستوك 1925/6/26

سـەرۆك کۆمـاری تورکیـا بانگـەوازێکی بـۆ دانیشـتوانی تورکیـا بڵاوکـردەوە تیـایدا هاتووە، ئەو سەربازانەی کە بەشدارییان کردووە لەسەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کوردەکـاندا

لە ئەنجامدانی خزمەتی سەربازی دەبەخشرێن، هەروەها تیایدا هاتووە کە دادگا تایبەتەکان جارێك لەسەر ئیش و کاری خۆیان بەردەوام دەبن، هەروەها دەڵێت کە سەرکەوتن و پاداشتی مەزن بۆ ئێمە ئەوەیە کە ئاگاداری خێرا و بەپەلەی ئامادەبوونی گشتی بن، ئەگەر هاتو مەترسییەك رووی کردە وڵاتەکەمان چ لە ناوەوە، چ لە دەرەوە.

موستەفا کەمال لە کۆتایی بانگەوازەکەیدا دەڵێت: سەرکوتکردن و سزادانی پاش ڕاپەڕینەکە دەبێ لەبەر چاوی ئەو کەسانەدابێ کە دەیانەوێ کۆماری تورکیا تێکبدەن و بەر لە پێشکەوتنی نیشتمان بگرن.

## نامەیەکی کراوە بۆ دەوڵەتی تورکیا

*1925/6/27*

بە پێی ئەوەی کە لە ڕۆژنامەکانی ئەستەنبووڵدا بڵاوکراوەتەوە، لەم دواییەدا بیست و پێنج کەس لە هاووڵاتیانی تورکیا بە تۆمەتی پڕوپاگەندەی کۆمونیستی گیراون، هەندێك لەو گیراوانە بەوە تاوانبار کراون کە بەبۆنەی یەکی ئەیارەوە، ڕۆژی جیهانیی کرێکاران بەیاننامەیان بڵاوکردووەتەوە.

هەندێك لەو گیراوانە نێردراون بۆ ئانکەرەو ڕەوانەی دادگای تایبەتی کراون بەم چەشنە دادگا تایبەتەکان کە سەری دەرەبەگ و دوژمنانی شۆڕش و بەکرێگیراوانی بەریتانیای مەزنیان دەبرییەوە خەریکن کۆمۆنیستەکانی تورکیاش دادگایی بکەن، بۆچی؟. ئایا کۆمۆنیستەکان هەوڵیان داوە بۆ لەناوبردنی کۆماری تورکیا؟. نەخێر بە پێچەوانەوە لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا کە شێخ سەعید سەرکردایەتی دەکرد و بە یارمەتی و پارەو چەکی ئینگلیزەکان ڕاپەڕین، کۆمۆنیستەکان یەکەم کەس بوون کە داوای سەرکوتکردنی ئەو ڕاپەڕینە دژە شۆڕشەیان دەکرد و لەم بارەشەوە بە ڕەشی لەسەر سپی لە گۆڤاری "ئایدشلیك"، (کە بەداخەوە ئێستا لە لایەن کاربەدەستانی ئەستەنبووڵەوە داخراوە) نووسراوە و هەروەها لە ڕۆژنامەی حەفتانەی "ئوراك چەکج" کە ئەویش ئێستا کەوتووەتە بەر پەلامار نووسراوە.

ئــەی بۆچــی و لەســەر چــی کۆمۆنیســتەکانی تورکیــا دادگــایی دەکرێــن؟ چاپەمەنییـەکانی تورکیا بڵاویـان کردووەتــەوە کـە گوایـا نوێنــەرێکی پەرلـەمان کـە کەمالیست بووە گوتوویەتی: ئێمە دژی پاشماوەکانی پێشوو خەبات دەکەین (بڵێـین دژی فیودالیزم) و دژی ئەو مەترسییە کە لە داهاتوودا بـەرەو رووما ن دەبێتـەوە، واتـە دژی بینای کۆمۆنیستی خەبات دەکەین ئەگەر ئـەم بۆچوونـە ڕاست بێت ئـەوە دەگەیـەنێت کە نـابێت لـە ئێـوە واتـە کەمالیستەکان لـە سیاسـەتێکی وا پـیرۆز بابیتـان لـێ بکرێـت، خـەبات دژی فیودالـیزم لـە ئەسـتۆی ئێوەیـە و جێبـەجێکردنی ئـەرکێکی مێژووییــە و کێڵگەی پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی کاپیتالیستی لە تورکیا پـاك دەکەنـەوەو ئامـادەی دەکەن، چەندە دە ستی بەزەبر و کوشندە دژی فیودالیزمی سەردەمی پێشوو بە هێز تـر بێت ئـەوەندەش شانسی سـەرکەوتنی بینـای بـۆرژوا – دیموکراتیـەت لـە تورکیـا زۆرتـر دەبێت.

ڕێبەری مرۆڤە چەوساوەکان (لینین) زۆر جار گوتوویەتی لە ڕۆژهەلات هەلگرتنی ئەم هەنگاوە، پێشکەوتنخوازانە و شۆڕشگێڕانەیە، لەبەر ئەوە ئێوە دژی کۆنەپەرستی و پاشماوەکـانی سـەدەی نـاوەندین و بـۆ ئـەم کردەوەیـەش تــەواوی کرێکـار و جوتیـارانی رووسیا لەگەڵ ئێوەدایـە، بـەڵام هەڵەی ئێـوە لـەوەوە دەست پێدەکـات کـە سـەر نووکی خەباتەکەتان دژی کۆمۆنیستەکان بێت کە لە خەباتی پێشکەوتنخوازانەتاندا بەرامبـەر بە دوژمنانی شۆڕش پشتیوانیتان لێدەکەن. ئێوە نـاتوانن "تویادانـەی داهـاتوو" لـە نـاو بەرن، لەبەر ئەوە ئێوە دەتانەوێ چەرخی مێژوو ڕاگرن و ناتوانن، کە وابێ نابێ پێشی پەرەسـەندنی هـێزە بەرهـەم هێنــەرەکانی وڵات کـە ئـەمڕۆ لـە کارخانــەو فابریکـە و پیشەسـازییەکاندا کاردەکـەن، بگـرن، بــەم چەشـنە ئێـوە خۆتـان لـە دیمــەنی چینـی کرێکـارانی لاوی تورکیـا دەخەنـە خـەباتێکی ئانتاگونیسـتانە، کـێ بێـت لــە هێڵــی شەمەندەفەر کار بکات کە ئێوە بۆ ناو فابریکـەکان دەیکێشن و ئێـوە دروسـتی دەکـەن؟ کـێ بێـت سـەرەوت و سـامانی نەتــەوەیی پێـك بـهێنێت، ئەگـەر پرولیتاریـای تورکیـا نەبێت؟. ئەم پرۆلیتاریایە داوای مافی خۆی دەکات و ئێوە خۆشتان لە کۆنفراسی ساڵی *1923* دا دەنگتان بۆ داوە، تێکۆشانی کۆمۆنیستەکانی تورکیا لـەم قۆناغـەدا کـە بـۆرژوای

تورکیا لە گەشە کردندایە بۆ ئەوە نییە کە دەست بگرێت بەسەر دەسەڵاتدا، بۆ ئەوە نییە کە کۆماری کەمالیستی لەناو بەرێت، بەڵکو یەکەم بۆ ئەوەیە کە بە هێزی بکات و قووڵتر و بەرینتری بکات، دووهەم بۆ ڕێکخستنی پرۆلیتاریای تورکیایە وەك هێزێکی سیاسی و ئابووری سەربەخۆ، ئەویش لە چوار چێوەی یاسای بنەڕەتی تورکیادا هەر کا تێك کە دەستی تۆڵەی شۆڕش بەسەر دوژمنانی تورکیادا شکست دێنێت کرێکاران و جوتیارانی یەکیەتی سۆڤێت بە سووکی هەناسە دەکێشن، لەو ڕۆژەی کە هەواڵی بە دیل گرتنی بە کرێگیراوی ئینگلیزەکان واتە شێخ سەعید گەیشت، زەحمەتکێشانی یەکیەتی سۆڤێت بەخۆشی و شادییەوە وەریان گرت و پێشوازییان لێکرد.

چاپەمەنییەکانی ئێمە بە ڕێکی و ڕاستی تەواوی ڕووداوەکانی خەباتی گەلی تورکیایان لەبەرەی شەڕ دژی کوردەکان بڵاو دەکردەوە کاتێك کە سەربازە تورکەکان دەکەوتنە ناو بەفر و دژی ڕاپەڕیوەکان خەباتیان دەکرد. کەچی بە داخەوە ڕەوشتی چاپەمەنییەکانی ئێوە بەرامبەر بە یەکیەتی سۆڤێت، ئەم هەڵوێستەی نییە و نابینرێت. هیچ نەبێ ئەوە وەبیر دێنینەوە کە چۆن چاپەمەنیەکانی تورکیا دەنگوباسی ڕاپەڕینە دژە شۆڕشییەکەی گورجستانیان بڵاو دەکردەوە، هەروەها ئەو دەنگوباس و وتارە پیسانەی کە لەسەرچاوەی گاردە سپییەکانەوە ڕادەگەیەنرا دەرخواردی خوێنەرانتان دەدا. با لەمە گەڕێین، خۆ تەواوی خوێنەرانی چاپەمەنییەکانی کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت بە پەرۆشەوە دەیانڕوانییە ئەنجامی ئەو دراما گەورەیە کە لە کێوەکاندا سەری هەڵدا بوو.

زەحمەتکێشانی ئێمە لەوە تێناگەن کە کۆمۆنیستەکانی تورکیای هاوپەیمانی ئێوە بەرامبەر بە دوژمنانی شۆڕش بۆچی دەگیرێن و چۆن شتی وا دەکرێت. کاتێك کە لە ڕۆژنامەکانی ئەم ڕۆژانەی لای ئێمەدا بەشێك لەو وتار و نوسینانەی چاپەمەنییەکانی تورکیا سەبارەت بە گیرانی کرێکارانی ئەستەنبووڵ بڵاوکرایەوە کرێکارێکی زۆری ئێمە لە کارخانەکان بەسەر سورمانەوە پرسیاریان ئەکرد: بۆچی دەوڵەتی پێشکەوتنخوازی کەمالیستی هەڵیان کوتاوەتە سەر پارتی کۆمۆنیستی تورکیا؟ وا بیر مەکەنەوە کە کۆمۆنیزمیش وەك فیودالیزم دەکرێت لەناوببرێت، ئێوە دەتوانن بزووتنەوەی کرێکاری

لەناوبەرن و خۆشتان بمێننەوەو لەناو نەچن؟ کۆمۆنیستەکانی تورکیا دوژمنی کۆماری تورکیا نین، بەڵکو باشترین دۆستی ئێوەن و دژی شۆڕش نین، بەڵکو بۆ قووڵکردنەوەو بەهێز کردنی تا سەقامگیر بوونی دیموکراتیەت لە سەرانسەری وڵاتدا، لەگەڵتانن. کەواتە کەی کۆمۆنیستەکانی تورکیا ئازاد دەکرێن؟.

گروپێکی دۆستی گەلی تورکیا

## وتوێژ لەگەل سەرنووسەری ڕۆژنامەی "وەتەن"ی تورکی
## زاریا وەستوك 29/مارتی/1925
## ڕا پەڕینی کوردەکان

لە ناوچەکانی باشووری تورکیا خێڵ و هۆزە کوردەکان دەژین کە هێشتا لە سەردە می قۆناغی سەرەتاییدا دەژین وەك کێوی، وشەی یاسا لە ناو ئەوانەدا هیچ مانا و بایەخێکی نییە، خود سەرییەکی بێ سنووری سەدەکانی ناوەڕاست لەوێدا زاڵە، مافی بەهێز بەسەر بێ هێزدا تا ئێستاش لە لایەن سەرۆك خێڵەکانەوە جێگایەکی تایبەتی خۆی هەیە. هەر لە کۆنەوە تا ئێستا هەموو هەوڵدانێك بۆ سەقامگیرکردنی ئەو یاسایانەی کە گەلانی خاوەن شارستانییەت و کولتور بەسەریاندا تێپەڕیون، ئەوانە دژی ڕاوەستاون و بووەتە هۆی سەرهەڵدان و ڕاپەڕینیان تا هاتنە سەر دەسەڵاتی کۆماری تورکیا، تەواوی هەوڵ و هەنگاوەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بۆ کوژاندنەوەی یاخیبوونی کوردەکان، تەنیا بە کڕینی سەرکردەکان بە پارە و پوول و دیاری و پلە و پایە لە لایەن سوڵتانەوە کۆتاییان پێ هاتووە.

## کوردەکانی فارس

*1925/7/16*

هاوکات لەگەل ڕاپەڕینی کوردەکان لە تورکیا، ڕۆژنامەکان ڕادەگەیەنن کە کوردەکانی ئازربایجانی فارسیش دەستیان داوەتەوە ڕاپەڕین، جووڵانەوەی کوردەکانی ئازربایجان، بێگومان هەر بە دەستی ئەو هێزە نادیارانەیە کە لە تورکیا ڕاپەڕینیان ڕێك خستووە.

ڕۆژنامەکە، باس لە هەژاری گەلی کورد و زوڵم و زۆری کاربەدەستانی تاران لە کوردستان دەکات و دەڵێ کە ژمارەیەك لە سەرکردەی خێڵە کوردەکان، داوای کەم کردنەوەی باج و خەراجیان کردووە لە شای ئێران. لە کۆتایی وتارەکەدا، وەك ڕێنوێنییەك بۆ دەوڵەتی فارس، دەنووسێت: پێویستە دەوڵەتی ئێرانیش وەك دەوڵەتی تورکیا، هەندێ ریفۆرم لە باری بەڕێوەبەرایەتییەوە ئەنجام بدا لە ناوچەکەدا. (واتە ناردنی سوپای زۆرتر، هەڵواسین و کوشتار و دانانی فەرماندارانی سەربازیی لەناوچەکەو... دوور خستنەوە و کۆچ پێکردن و. وەرگێڕ) بۆ ئەوەی نارەزایی کوردەکان کەم بکاتەوە.

## دوایین کۆبوونەوەی مەجلیسی تورکیا

*1925/7/30*

زاریا وەستوك لە ژ ێر ئەم ناونیشانەی سەرەوەدا دەنووسێت کە مەجلیسی تورکیا، کۆتایی بە دوایین کۆبوونەوەی خۆی هێنا بە بۆنەی پشووی شەش مانگەی خۆیەوە. (زۆر سەیرە مەجلیسێك بە ناو پەرلەمان بۆ شەش مانگ بنێردرێتە پشوودان، وەرگێڕ). لەم کۆبوونەوەدا مەجلیس هەندێ هەنگاوی پێشنیار کراوی دەوڵەتی سەبارەت بە لەناوبردنی ڕاپەڕینی کوردەکان پەسەند کرد.

دادگا سەربازییە تایبەتەکان، درێژە بە ئیش و کاری خۆیان دەدەن، ئەو دادگایەش کە لە ئانکەرە کاردەکات مافی ئەوەی هەیە هەموو بڕیارێك بدات بە تایبەتی بڕیاری لە سێدارەدان. مەجلیسی تورکیا، هەروەها گلاڵەی گەمارۆ و بارودۆخی تایبەتی حەوت مانگەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینی کوردەکان ئاڕاستەی کرابوو، پەسەند کرد.

## ڕیفۆرم لە کوردستان

### زاریا وەستوك *1925/7/3*.

دەوڵەتی تورکیا بۆ بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات تەنیا بەڕاگەیاندنی بارودۆخی تایبەتی و دانانی فەرمانداری سەربازی ڕیفۆرمەکانی خۆی سنووردار ناکات، بەڵکو ناوچەکانی سەر سنوور و چەند ناوچەی تر بەڕێوەبردنی مەدەنی (شارستانیەتی) گشتییان لەسەر هەڵدەگیرێت و، فەرمانداری سەربازی بە دەسەڵاتێکی زۆرترەوە دادەنرێ بۆیان. دەوڵەت لەو باوەڕەدا نییە کە لە ماوەیەکی کورددا ئەم ڕیفۆرمانە جێبەجێ بکات.

## دادگاییکردنی شێخ سەعید

### زاریا وەستوك *1925/7/6*

ئانکارا. *1*/ئەیونی/*1925*. لە دیار بەکر، دادگاییکردنی شێخ سەعید و هاوکارە نزیکەکانی دەستی پێکردووە. شێخ سەعید دانی بەوەدا ناوە کە تاوانبارە، هەر وەها ڕایگەیاندووە، کە ڕاپەڕینەکەی بۆ گەڕاندنەوەو زیندوو کردنەوەی شەریعەتە، دادگاییکردنەکە هێشتا هەر درێژەی هەیە.

## کێشەی مووسڵ.

### زاریا وەستوك. *7*/ئەیونی/*1925*

"ئاگرێك کە ئینگلیزەکان لە کوردستانی تورکیا و ئێران کردیانەوە گەیشتووەتە ویلایەتی مووسڵیش. بەڵام ئەم جارە ئاگرەکە بە رەو ڕووی خۆیان بوویەوە. (مەبەست

شێخ مەحمووده کە لە ئینگلیزەکان وەرگەڕابووەوە، بەڵام تا ئەو کاتەی کە شێخ مەحموود وەرنەگەڕابووەوە چاپەمەنییەکانی سۆڤێت دژی بزووتنەوەی شێخ مەحموود شتیان نووسیوە کە پێویستە بە جیا باسی بکرێت، وەرگێڕ).

وتارەکە چەند سەر دێڕ و دروشمی ڕۆژنامەکانی تورکیا سەبارەت بە کێشەی مووسڵ نووسیوە، بۆ وێنە، مووسڵ بەشێکە لە تورکیا، ئێمە تورکین، وڵاتپارێزەکان دژی ئینگلیز لە ناموسی خۆتان پارێزگاری بکەن و.. لە ناو کوردە سەرهەڵداوەکانی ئێراندا ئەفسەرانی ئینگلیزی دەبینرێن.

زاریا وەستوك لە ژمارەی ڕۆژی *7*/مای/*1925* دا لە ژێر سەر دێڕی وتارێکدا بە ناوی "نامەیەك لە ئانکەرەوە"، باسی هەراو هوریای دەزگاکانی ڕاگەیاندنی تورکیا دەکات. باسی شایی گێڕانی تورکەکان دەکات، باسی سەر دێڕی ڕۆژنامەکان پاش گیرانی شێخ سەعید، وەك "گەنجە گیرا" "سەعید گیرا" "کۆتایی بە ڕاپەڕین هات" و "ستادی لەشکر چیتر ڕاگەیاندن لەسەر ڕاپەڕینەکە بلاوناکاتەوە" و دەڵێ هیچ کاتێك تیراژی ڕۆژنامەی (حاکمییەتی میللی) ئەوەندە زۆر نەبوە، خیابانەکانی ئانکارای نوێ زۆر کەم شادی و جموجووڵی وای بەخۆوە بینیوە، تەواوی دانیشتووانی ئانکارا ڕژاونەتە سەر شەقامەکان و سی هەزار نەفەری دانیشتووی شاری ئانکارا لە ناکاو بوونەتە سیاسی و بە تینووییەتییەوە خەریکی باسکردنی ئەو هەواڵە چاوەڕوان نەکراوە بوون (واتە گرتنی شێخ سەعید). ئەگەر (سۆفیا) گیرابا، یاخود بینای مەجلیسی تورکیا کەوتبایە بەر هەورە تریشقە و سووتا با هێندەی هەواڵی بە دیل گرتنی شێخ سەعید سەرنج و شادیی خەڵکی ڕانەدەکێشا، بە خۆڕایی نەبوو کە ڕۆژنامەکان وتەکەی کەمالیان لە مەجلیسی تورکیا دەنووسی، کە گوتبووی کێوەکانی کوردستان دەبێتە گۆڕی شێخە سەرهەڵداوەکان.

زاریا وەستوك دەنووسێت: وتەیەکی ژیرانەی توورکەکان هەیە دەڵێت: "پەز بە لاقی خۆی هەڵدەواسرێت". لە ناوەڕاستی دیاربەکردا لەبەردەم دوو مزگەوتدا، سێدارەیەکی بەرز ڕێکخرا و گرووپێکی "تێکۆشەر لە پێناوی ئایین دا" هەڵواسران بەبێ

ئەوەی پلەی ئایینی یان لەبەرچاو بگیرێت، "چۆن دەبێ ڕاپەڕینێکی کۆنەپەرستانە مەترسی لێنەکرێت لە کاتێکدا کە شۆڕش سوڵتانی دەرکرد و خەلافەتی لەناوبرد لەگەڵ دادگای شەریعەت و مەدرەسەکان و...". "ئینگلیزی بەهێز و توانا لە پشتی شێخ سەعیدەوە بوو، فەرانسەی دۆستیش، بە دەستێکی تەوقەی لەگەل کەمالیستەکان دەکرد و بە دەستەکەی تریشی پاڵی بە کۆمیتەی ئالپووە دەنا دژی رابەرانی شۆڕشی ئەناتولی کە ڕۆژانێکی زۆری پڕ لە پەرۆشی و شەوانێکی زۆری بێ خەوییان لە ماوەی ئەم دوو مانگەدا بردە سەر و عیسمەتیش لەم ماوەیەدا بەشێکی زۆری مووی سەری سپی بوو"، هەر چەندە ئێستا کۆتایی بەم مەترسی و کوێرە وەرییانە هاتووە کە کۆماری لاوی تورکیا تووشیان بوو بوو، بەلام هەر لە بەرامبەری ڕاوەستاوەو لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا هەموو ڕۆژێك هەواڵ و تەلگرافەکان ئەوە ڕادەگەیەنن کە گروپ و تاقمی رابەرانی ڕاپەڕینەکە هەڵدەواسرێن، پاشماوەی ڕاپەڕیوەکان کە لە خێڵە دوا کەوتووەکانی کوردستانن بە بەفر دەم و چاویان دەشۆن.

## ڕاپەڕینی کوردەکان

### زاریا وەستوك *8/مای/1925.*

لە ئەنجومەنی وەزیراندا، سەبارەت بەو ریفۆرمانە کە بڕیارە پاش سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە لە کوردستاندا ئەنجام بدرێت، بڕیارە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا دابەش بکرێت و بۆ هەر کام لەوانە فەرمانداریکی سەربازی دابنرێت. پلە و پایە و جێگای تایبەتی شێخ و بەگەکانی کورد لە ناو ببرێن و لەو ناوچانەدا پێگەی ژاندارم و سوپایی تایبەتی لەسەربازخانەکان دابمەزرێت.

لە زاریا وەستوك دا چەند وتارێك بلاو کراونەتەوە کە تارادەیەك ڕوونـاکی دەخەنە سەر ڕاپەڕینی کوردەکان و وەلامی ئەو هەموو درۆ و دەلەسەو پڕوپاگەندەیە دەدەنەوە کە ڕۆژانە زاریا وەستوك دەرخواردی خوێنەرانی خۆی داوەو دەڵێت: سەبارەت بەو ڕاپەڕینەی کوردستان جگە لەو تەلگرافانەی کە لە تورکیاوە دێن، شتێکی

باوەڕ پێکراو لەو بارەیەوە لەبەر دەستدا نییە، بۆ نموونە زاریا وەستوك لە ژمارەی *18*/ی مارتی *1925* دا، لە ژێر سەر دێڕی "سەبارەت بە ڕاپەڕینی کوردەکان"، "هۆکانی ڕاپەڕینەکە"، نووسەر دەڵێت:

بزووتنەوەی کورد بۆ خۆی ناتوانێت کۆنەپەرستانە بێت، ڕاپەڕینی یەزدانشێر بە بیری بەلشەویکەکان دەهێنینەوە کە لە سەردەمی شەڕی (کەرم - قەرم)ی نێوان ڕووسیا و تورکیا، ئەو ڕاپەڕینە یارمەتییەکی زۆری ڕووسەکانی داو تەنانەت دەڵێن کە ئەم ڕاپەڕینە لە لایەن ڕووسیای قەیسەرییەوە ڕێکخرا بوو، یا ڕاپەڕینی ساڵی *1880*ی شێخ عوبەیدوڵلا، نووسەر دەیەوێ بە بەلشەویکەکان بڵێت کە ئەو بزووتنەوانە دژی خەلیفە و سوڵتانی تورك بوون، چۆن ئێستا پشتیوانی لێدەکەن یا داوای گەڕانەوەی دەکەن، ئەگەر بەلشەویکەکان شتی وایان لە بیر نەبێت یا ئاگاداری نەبن، خۆ گەلی کورد کە لەم ڕاپەڕینانەدا ڕۆڵەکانیان کوژراون لە بیریانە، دەربارەی ئەوەش کە دەڵێن ڕاپەڕینەکە ئایینیە، ئەو ئایینەی کە خەلیفە و سوڵتانەکانی تورکیا کەڵکیان لێوەرگرت و دەی ان جار بە ناوی یەکسانی و برایەتییەوە درۆیان لەگەڵ کردوون، ئەمانە هەمووی بۆ گەلی کورد شتێکی زیندوون.

نووسەری ئەم وتارە زۆر ژیرانە بۆی دەچێت و دەڵێ ئێستا دونیا لە سەردەمی شۆڕشدا دەژی و گەلی کوردیش وەك گەلانی تر دەیەوێ ئاڵقەی کۆیلایەتی و کۆت و پێوەندی خۆی بپسێنێت. لە شوێنێکی تردا سەبارەت بەوەی کە ئەم ڕاپەڕینە ئایینی نییە دەڵێت: کوردەکان لە سروشتە و فەتاتیکی ئایینی نین تا داوای گەڕانەوەی سوڵتان و خەلیفە و دەسەڵاتی ئیسلامی بکەن، ئەمە جگە لەوەی کورد لە باری ئایینییەوە یەکپارچە نین، لەبەر ئەوە لە ژێر دروشمی ئایینیدا، هیچ کاتێك نەیەکی گرتووەو نەیەك دەگرێت و نە پشتیوانیی لەو دروشمە دەکات. هەروەها نووسەری بابەتەکە دەڵێت: ئایینی ئیسلام هەر بە ڕواڵەت سەپێندراوە بەسەر کورددا، بە کورتی هۆی ڕاپەڕینەکە ئایینی نییە، بەڵکو ئابوورییەو نا یەکسانی ژیانی گەلی کورد و تورکە لە تورکیادا، زەمینەی ڕاپەڕین لە کوردوستان ئامادەیە و هەر کەس بیەوێت لە تورکیا ڕاپەڕێت دەبێ کەڵك لە کوردستان وەربگرێت.

لــە کۆتــاییدا دەڵێــت کــە ڕاپــەڕینی نەتەوایــەتی کوردەکــان بەشــێکە لــە شۆڕشـی جیـهانی. بـەڵام ئێمـە لـە قـەفقاز نـازانین ئایـا کوردەکـان ڕێگایـەکی ڕاسـتیان گرتووەتە بەر یا نا؟.

ئەگـەر بڵێـین خـەڵکی سـوڤێت، بـە هـۆی سیاسـەتی دژ بـە کـوردی دەسـەڵاتدارانی بەلشـەویکەوە، ئاگایـان لـە مێـژووی گـەلی کـورد و خـەباتی بـێ وچـان و چەوسـاوەیی ژیانیان نەبێت و هەمیشە شۆڕشەکانی کوردیان بـە چەواشـە و نۆکـەری ئیمپریـالیزم و کۆنەپەرسـت و ... لـە چاپەمەنییـەکاندا ناسـێنراوە، خـۆ دیپلۆمـات و کۆنسـوڵەکان و سـیخوڕەکانیان لــە کوردســتان، دەیــانزانی کــە گــەلی کوردیــش دەیــەوێ لــەو ئیمپراتوریـیــە دارزاوەی تورکیـا رزگـاری ببێـت بـۆ دەبـێ بـەد نـاو بکرێـت و ئـەو مافـەی پێنـەدرێت، خـۆ گـەلانی ژێـر دەسـتی ئیمپراتورییەکـە پـاش شـەڕی جیـهانی یەکـەم بـە تایبـەتی ئـەو وڵاتـە عەرەبانـە کـە شۆڕشیشـیان نـەکرد و ئیمپریالیسـتەکان دەوڵـەتیان بـۆ دروسـت کـردن، کـەچی کـورد خوێـن و خـەباتی خـۆی بـۆ ئـازادی پێشکەشـکردووە، پێـی ڕەوا نـابینرێت، لەبـەرچی؟ چونکـە کوردسـتان لـە ڕوانگـەی بەلشەویکەکانەوە، ئەگـەر ببێتـە دەوڵەت ئیمپریـالیزم لـە پشـتییەوە دەبێـت و دەبێتـە پێگـە بۆیـان و دەکەوێتـە نێـوان پاشمـاوەی ئیمپراتورییەتـە دارزاوەکـەی عوسمـانی و ئیمپراتورییەتی بەلشەویکەکان، ئەو کاتـە هـەر دوو لا نـاتوانن بـە ئاسـانیی بـەرەنگاری ئیمپریالیزم ببنەوە.-

لـە وتـارێکی تـری زاریـا وەسـتوك – ڕۆژی حـەوتی ئـەپریلی *1925*دا، لـە ژێـر سـەر دێــڕی مێــژووی بزووتنــەوەی کــورد، بابــەتێك نووســراوە تیــایدا باســی بەشــداری شۆڕشـگێڕانی کــورد لــە بزووتنــەوەی ڕزگــاری خــوازی تورکیـا دەکـات، باسـی زانـا و تێك ۆشەرانی کورد دەکات، باسی خەڵەتاندن و درۆ و دەلەسەی تورکە لاوەکان دەکات کـە ئەمجارەش بەڵێنی برایەتی و یەکسانییان دا، بەڵام کـە دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت، نـەك تەنیا بەڵێنەکانی خۆیان بـەجێ نەگـەیاند و خیانـەتیان کـرد، بـەڵکو کەوتنـە ڕاونـان و گرتــن و ئــازاردانی شۆڕشــگێڕانی کــورد و بەشــێوەی توندتــر و خراپــتر وەڵامــی داخوازییەکانی کوردییان دایەوە.

ئەگەر لە ڕابوردوودا کوردەکان وەزیر و سەفیر و پۆستی گرنگیان هەبوو لە سەردەمی سوڵتاندا، ئەمڕۆ بە پێچەوانەوەیە. وتارەکە بۆیە لێرەدا ئاماژەی پێدەکرێت چونکە لە چاو وتارەکانی تردا هەندێ ڕاستیی خستووەتە ڕوو، ئەگینا هەر لەو وتارەشدا هەندێ سووکایەتی بە ناودارانی کورد کراوە.

هەر شێخ سەعید و شۆڕشەکەی لە لایەن بەلشەویکەکانەوە بەدناو نەکراون بەڵکو پێش شێخ سەعید، شێخ مەحموود و سمکۆ و بە گشتی تەواوی ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد بەدناو کراون، سمکۆ جگە لەوەی کە بە تاوانی دژایەتیکردنی دۆستەکانی ڕووسیای بەلشەویکی واتە تورکیا و ئێران، دەسگیر دەکرێ بە تۆمەتی ئەوەی گوایا یارمەتی لە ئینگلیز وەرگرتووە و بەخۆ فرۆش و بەکریگیراو دادەنرێت، سەیر ئەوەیە کە دەڵێن سمکۆ جاری وا هەبوە سەربە تورکیا یا ڕووسیا و جاری واش هەبوە کە سەر بە هەردوولا دانراوە. باشە ئەگەر ئەمە ڕاستە، لەو سەردەمانەدا کە سەر بە ڕووسەکان بووە بۆ پشتگیرییان نەکردووە بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی کوردی سەر بە ڕووسیا دابمەزرێنێت، ئیتر سیاسەتی ڕووسیا چ جیاوازییەکی دەبێ لەگەڵ دەوڵەتانی تردا کە دەڵێن سمکۆ جگە لە خۆ فرۆش و یاخیبوون و پارە وەرگرتن لەم و لەو، کارێکی تری نەبوە.

لە وتارەکانی پاش سەرکەوتن بەسەر ڕاپەڕینی کوردەکاندا، زاریا وەستوك باسی بەهێزیی و ڕێکوپێکی سوپای تورکیای نوێی و دەوڵەت و سەرکردەکەی دەکات کە بەسەر دەسەڵاتدارانی نیوە وەحشی چیا نشینەکاندا سەرکەوت. زاریا وەستوك زۆر جاریش بە نەزانی زۆر شتی دەرخستووەو هەر بۆ خۆی وەك چاپەمەنییەکانی ڕژێمی ئەتاتورك خۆی بەدرۆ خستووەتەوە، بۆ وێنەدەڵێت ڕاپەڕینی کوردەکان لە دەرەوەی کوردستان ڕێکخرابوو، ئەنجا دەڵێت داوای گۆڕانی ناوخۆی تورکیای کردبوو ئەگەر ڕاپەڕینەکە داوای گۆڕانکاری ناوخۆیی کردبێت واتە شتێکی خراپی داوا نەکردووە.

بەلشەویکەکان ڕێنمایی دەسەڵاتدارانی تورکیا دەکەن کە پێویستە لە کوردستان دەست بکەن بە جێبەجێکردنی هەندێ ریفۆرم، بۆ وێنە لەناوبردنی فیودالیزم و

شـێخەکان کـە کـارێکی زۆر زەحمەتـە، ئـەویش لـە نـاو هـەندێ هـۆز و عەشـیرەتی دوا کەوتوو و کۆچەردا.

پاشان زاریا وەستوك پێویستی کردنەوەی قوتابخانەی کوردی لە کوردستان لە باتی قوتابخانەی تورکی و بەتورك کردنی گەلی کورد یا تورکیزاسیای کوردستان باس دەکا و دەڵێت ڕاپەڕینەکانی کورد لە ڕابوردوودا دژی سیاسـەتی بـە تـورك کردنـی کـورد بـووە، دژی ژاندارم و دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی و دەسەڵاتداری ڕژێمی ناوەندی تورکیا بـووەو ئێسـتاش تورکیـا هـەر ئـەو سیاسـەتە پـەیڕەو دەکـات و وتەیـەکی عیسـمەت پاشـا دەگێڕێتەوە کە گو تووویەتی تورکیا یەك ناسیونالیسیزم دەناسێت ئەویش ناسـیۆنالیزمی تورکییە و هـەر کـەس دژی ئـەم ناسـیونالیزمە بێـت دەبـێ بـە بـێ بەزەییانـە سـەرکوت بکرێـت، هـەروەها دەڵێـت چاپەمەنییـەکانی دەوڵـەتی هـەموو ڕۆژێـك ئـەوە دووپـات دەکەنەوە کە ناسیونالی کورد بوونی نییە و ئەمە شتێکە کە لـە دەرەوە دروست کـراوەو کوردیش هەر تورکن.

زاریا وەستوك دەڵێت ئەگەر بێتو سیاسەتی نوێی دەوڵەتی تورکیا هەر ئەمـە بێـت خەڵك پەسەندی ناکات و دژی رادەوەستن و شێخ و ئاغا و مەلا و کۆنەپەرسـتان لەگـەڵ ئیمپریالیزم دووبارە کەڵك لەم نارەزایی و بێزارییە وەردەگرن. هەروەها زاریا وەسـتوك دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئینگلیزەکان لە پارچەیەکی تری کوردستانی دراوسـێی کوردسـتانی تورکیـا، مـافی کولتوورییـان داوە بـە کـورد ئەمـە دەبێتـە هـۆی ڕاکێشـانی کـورد لـە شوێنەکانی تر بەلای خۆیاندا، لە ئەنجامدا کوردەکان هەر ڕادەپەڕن و سـەرکوتکردنیان، هەرچەند بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە و تیروریستییانە بێت بـێ سـوود و ڕاپـەڕینی پـێ لە ناو نابرێ.

لێرەدا دەبێ پرسیارێك لە زاریا وەستوك و بەلشەویکەکان بکەین کە ئایا کوردیش هەر داوای ئەو شـتانەی نـەکردبوو کـە بـێ بەزەییانـە وەڵامـی درایـەوەو نوقمـی خوێـن کرا؟ڕ اپەڕینی شێخ سەعید و سمکۆ هەر بۆ بەدیهێنانی ئەو مافانـە نـەبوو؟ کەواتـە بـۆ لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا نەدەبوا ڕەخنـە لـە ڕژێمـی ئـەتاتورك بگـیرێت و بـە پێچەوانـەوە ڕاپەڕینەکە بدرێتە بەر هەموو تانەو تەشەر و سووکایەتی و دوژمنایـەتی. ڕاپەڕینەکـە

کۆتایی هاتووە، ئینجا ڕێنوێنی بەلشـەویکەکان بـۆ ڕاکێشانی کوردەکـان بـۆ لای کۆمـاری نوێی و تورکیای نوێ ئاشکرایە کە جێبەجێ ناکرێت.

زاریا وەستوك بە پێوانەی بەلشەویکەکان دەنووسێت ئەم ریفۆرمانە بابـەبێ شـێخ و ئاغا و دەرەبەگ ئەنجام بدرێن، بـا کـورد لـە بـاتی ئـەوەی کـە مـافی خـۆی لـە دەسـتی ئینگلیزەکانەوە وەربگرێت لە دەستی تورکیای نوێـوە وەریبگرێـت. بەلشـەویکەکان بـاش دەیانزانی کە تورکیای نوێ دان بـە بوونـی کـورددا نـانێت و پێـی وایـە کێشـەیەك نییـە ناوی کێشەی کورد بێت.

زاریا وەستوك لـە *17* ی مـارتی *1925* دا، ڕاگـەیاندنی ئـەندامانی دادگـای نـیزامی و سـەربەخۆکانی بڵاوکردووەتــەوە، پـاش بــەدناوکردنی شۆڕشــەکە لــە زاری ئــەندامانی دادگاوە دەگێڕێتەوە: "گەل نایەوێ ئەو ڕووداوەی کـە لـە مەکـە دونیـا و ئـەڵبانیا دیتـی دووبـارە ببێتـەوە. ئـەرکی نیشـتمانی ئێمـە ئەوەیـە کـە وشـەی کوردیـزم لـە لیکسـیکون بسڕینەوە. هەروەها لـە بەیاننامەیـەکی دادگاکـاندا هـاتووە کـە: دادگاکـان ئیـش و کـاری خۆیان بە نهێنی بەڕێوە دەبەن بۆ ئەوەی لە کارو باریاندا تووشی گێرەو کێشە نەبن.

وتــاری *18/* مــارتی *1925*، وەڵامــی هـــەموو ئـــەو درۆو دەلەســـانەی تـــورك و بەلشەویکەکانی داوەتەوە. دیارە نووسەری وتارەکە یا کورد ناس بووە، یاخود پێدەچێت کە کورد بووە. بەلشەویکەکان هەوڵێکی زۆریان دابوو کە فەرەنسـا بـواری سـوپای تـورك بـدا بـە نـاو خـاکی سـووریادا گـوزەر بکـات، بـۆ ئـەوەی سـوپاکە زووتـر بگاتــە ناوچـەی سەرهەڵدانی کوردەکان. ڕاستە کە ئەو کاتە پەیوەندیی نێوان ئینگلیز و فەرەنسا لەسەر دابەشـکردنی پاشمـاوەی ئیمـپراتورە داڕزاوەکـەی عوسمــانی گـێرە و کێشـەیان هــەبوو، تورکیـای کــەمالیش کــە هــەر کوردســتانیان لــە بندەسـت مـابوو، نــەیدەوێرا نــە لــە کوردستانی بن دەستی ئینگلیز و نە لە کوردستانی بن دەستی فەرەنسا (سـوریا) جووڵـە بکات، بۆیە بەرانبەر بە فەرەنسا بێدەنگ دەبێت و فەرەنساش دەیەوێ بۆ بەربــەرەکانی لەگەڵ ئینگلیزەکان لــە تورکیـای کـەمالی نزیـك ببێتـەوە، بەلشـەویکەکانیش لـە گـێرە و کێشەی فەرەنسا و ئینگلیس کەڵك وەردەگـرن و هـەم تورکیـا و هـەم بـۆ خۆیـان هـەوڵی زۆر ئەدەن لەگەڵ فەرەنسا نزیك ببنەوە.

درۆ و دەلەسەکانی تۆرانی و بەلشەویکەکان، زۆر جار وەك یەك یاخود تەواوکەری یەکتر یا ڕێنوێنی کەری یەکتر بوون. کەس بەلشەویکەکانی ناچار نەکردبوو، ئەو هەموو درۆ و دەلەسانە، ڕۆژانە لە تەواوی ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکانیاندا بلاو بکەنەوە لەگەلّ رادیوکانیاندا. لە زاریا وەستوکی *31*ی مارتی *1925* لە وتارێکدا لە ژێر سەردێڕی "بە ناوی خەلیفەوە" تیایدا دەلّێ: لە ئەستەنبوولەوە بانگەوازێکی شێخ سەعید گەیشتووە کە شێخ سەعید بە ناوی ڕاپەڕیوەکانەوە داوای گەڕانەوەی خەلیفە دەکات و بانگەوازەکە دەلّێت: "بەبێ خەلیفە ئیسلام بوونی نییە". بەلشەویکەکان زۆر بە باشی دەزانن کە ئەمە درۆیەکی رووت و بێ شەرمانەی تورکەکانە و ئەوان دروستیان کردووە، جارێك دەلّێن نەفەرێك یا دوو نەفەرمان لە ڕاپەڕیوەکان گرتووە پارەی ئینگلیزییان پێ بووە، یاخود دانیان بەوەدا ناوە. باشە بۆ دەبێ بولشەویکەکان ئەم درۆیانە بلاو بکەنەوە؟ کێ ناچاری کردوون؟. دیسانەوە دەلّێت لە بانگەوازەکەدا هاتووە کە دژی سیاسەتی دژایەتیکردنی ئایینە لەلایەن کەمالەوە، دژی ئەوەیە کە ئافرەت بەبێ چارشێو بێتە سەرشەقام و جادەکان و...، ئەو نامانە یا ئەو پارانە کە لە لای دیلەکانە گیراون، یا لە مێزەرەی مەلا و سەیید و شێخەکاندا دۆزراونەتەوە، یاخود ئۆرگانی پارتی بەلشەویکەکانی قەفقاز زاریا وەستوك دەلّێ: بە پێی وتەی فلان ڕۆژنامەی تورکی یا بەپێی بروسکەیەك کە لە ئانکارا یا ئەستەنبوولەوە گەیشتووە، یا بە وتەی کەمال پاشا، یا عیسمەت پاشا، یا فلان وەزیر و.. کە هیچیان راست نین و لێرە بەلشەویکەکان باسی دەکەن و شتی تری دەخەنە سەر و زیاتر شۆڕشی ڕەوای کورد بەدناو دەکەن.

زاریا وەستوك لە هەشتی ئەپریلدا دەنووسێت، هۆی ڕاپەڕینەکە کە پێش وەخت لە لایەن شێخ سەعید و شێخەکانی ترەوە دەستی پێکرد ئەوە بوو کە دوو کەس لە پیاوەکانی شێخ کە بە تاوانبار دانرابوون لە لایەن دەولّەتەوە، شێخ ئامادە نابێت بیانداتە دەست پۆلیس ئەمەش دەبێتە هۆی بەیەکدا هەلّچوون لە نێوان هێزەکانی شێخ و دەولّەتدا و.. ڕاپەڕینەکە دەست پێدەکات. باشە ڕاپەڕینەکە بۆ گەڕانەوەی

خەلافەت بووە یا دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی یا.. ئەم درۆ و دەلەسانە یەکناگرنەوە.

کاتێك باسی پەیوەندیی یەکیەتی سۆڤێت و تورکیا دەکات، باسی برایەتی و هاوپەیمانی دوو ڕژێم دەکات، بەلاّم بە ناوی دوو گەلەوە کە دوژمنیان یەکە و ستراتیژیان یەکە و لە یەك بەرەدان.

لە وتاری *17*/مارتی *1925*دا دان بەوەدا دەنێت کە سۆڤێت بە تایبەتی لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا یارمەتی تورکیای داوە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی تورکیا و شانازی بەو پەیوەندییانەوە دەکا کە لە سەردەمی سوڵتان و قەیسەردا ئەو پەیوەندییانە نەبووە دەڵێت کە یەکیەتی سۆڤێت گەورەترین هاوهەستی خۆی لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا بەرامبەر بە تورکیا نیشانداو ڕێبەرانی سۆڤێت هیوادارن، یاخود باوەڕی تەواویان هەیە کە ئەم ڕاپەڕینە کۆنەپەرستانەیە کۆتایی پێدێت و تورکیا بایەخێکی زۆر بەو پەیوەندییانە دەدات.

زاریا وەستوك جاروبار بە نابەدڵی باسی ئامانجی ڕاپەڕینەکە دەکات و دەڵێ: ڕاپەڕینەکە لە ژێر دروشمی سەربەخۆیی یا ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەڕێوە دەچێت و بەڕواڵەت یا ڕووی دەرەوەی ئەم دروشمە شتێکی باشە و کوردەکان بۆ ئە م مەبەستە خەبات دەکەن و دەڵێ ڕاپەڕینەکە هیچ شتێکی دژی شۆڕشی پێوە دیار نییە، نووسەر دەیەوێ بڵێت لە ژێر پەردەی ئەم دروشمەدا دژی شۆڕشەکانی کورد ئەیانەوێ خەڵك بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆیان بەلاّم لە ڕاستیدا وا نییە و ئەم دروشمە جگە لە تاکتیك شتێکی تر نییە، لەلایەکی تر دەڵێت ڕاپەڕیوەکان دەیانەوێ کوڕی عەبدولحەمید سوڵتانی پێشووی تورکیا بکەن بە مەلیك یا شای کوردستان. بەلاّم کێ بەو نووسینانەی بەلشەویك و پان تورکیستەکانی تورکیا باوەڕ دەکات، بۆ کورد پیاوێکی تیا هەڵنەکەوتووە بیکەن بە مەلیك یا شا یا سەرۆکی کوردستان. هەروەها کورد کەی لەگەڵ سوڵتانەکانی تورکیا نێوانی خۆش بووە. کورد چەند جار دژی عەبدولحەمیدیش ڕاپەڕیوە (وەك خومەینی چۆن ڕاپەڕینی کوردەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستانی بە لایەنگری و هێنانەوەی شا تاونبار

دەكرد و فەرمانی جیهادی دژی كوردەكان ڕاگەیاند كە ناوی دەبردن بە دوژمنانی شۆڕشی ئیسلامی).

لە وتاری چواردەی مارتی *1925*دا دەڵێت: ئەم بزووتنەوەیە جگە لە قورستر كردنی باری ژیانی كوردەكان شتێكی تری بە دواوە نابێت. ڕاپەڕینەكە دژی سەربەخۆیی توركیا و دەستكەوتەكانی گەلی توركیایە بەسەرۆكایەتی كەمال پاشا كە بە خوێن هاتوونەتە دی و وڵاتەكەی لە ڕژێمێكی سوڵتانییەوە گۆڕیوە بۆ كۆماری و دەوڵەتێكی سینترالیزمی یەكگرتووی ناوەندی پێكهێناوە كە جاران وانەبوەو گوایا جاران دەسەڵاتی ناوەندی لاواز بووە.

ئاشكرایە كوردەكان جاران نیوچە دەسەڵاتێكیان هەبوەو وەك ڕژێمەكەی كەمال هیچ كاتێك دەسەڵاتی تورك لە كوردستان نەبوە، توركیای نوێ یا كۆماری توركیا كە ئیمپراتۆرە دۆڕاو و گەنیوەكەی پاش شەڕی جیهانی یەكەم تەنیا كوردستانی لە ژێر دەسەڵاتدا ماوەتەوەو هەرچی گوشار و هێزی توركە ڕەگەزپەرستەكانە پاش شەڕی یۆنان، خراوەتە سەر كوردستان، ناونانی كۆمار لە پاشماوەی ئەو ئیمپراتۆرییەتە، گوایا ڕێگایەكی دیموكراتی و پێشكەوتنخوازانەی گرتووە بەر و لەوەی سوڵتان باشترە. بەبۆچوونی بەلشەویكەكان هەر هێز و جووڵانەوەیەك دژی كۆماری ئەتاتورك راوەستێت، دەچێتە ڕیزی دوژمنانی توركیای نوێ، بەبێ ئەوەی ئەم ڕژێمە فاشیستە هەنگاوێكی نابێت بۆ سووككردنی باری ژیانی گەلی كورد، یاشتێكی پێ ڕەوا دیبێت جگە لە بە تورك كردنی زیاتری كورد و كوردستان، توركیای نوێ هیچ هەنگاوێكی هەڵنەگرتووە، چونكە لە توانایدانەبوە هەم ئابوورییەكەی هەم پارەكەی روخابوو وەك ئیمپراتورییەكەیان تا بڵێین ڕژێمەكەی ئەتاتورك هەنگاوێكی بۆ ئاوەدانكردنەوەی وڵات هەڵگرتبێت و فیودال و ئاغا و شێخەكانی كورد دژی بن، هەروەها دەڵێ برایانی كۆنەپەرست خۆیان لە سیمای شێخ سەعیددا دۆزییەوەو یەكیان گرت. ئەوەش كە دەڵێ توركیای نوێ هەرەشەیە بۆ سەر كولونیالیزمی ئینگلیز ئەوە كەس باوەڕی پێناكات، ئیمپراتورییەتی عوسمانی خۆی لە لایەن ئانتانتەكانەوەو لە پێش هەموویانەوە ئینگلیز لەت و پەت كرا و توانای خۆپاراستنی نەبوو و ملی بۆ هەموو مەرجەكانی

ها وپەیمانان دانەواند. ئێستا تورکیایەکی بچووك و لاواز چۆن هەڕەشــە لــەوان دەکـات و مەترسییە لەسەر ئەوان. یەکیـەتی و هاوبـەندی کەمالیسـت و بەلشـەویکەکان تورکیـای ئەمڕۆی هێشتەوەو یۆنان و کوردستانی تووشی شکست کرد.

بەلشەویکەکان مووسڵ بە بەشێکی جیانەکراوەو مولْکی تـورك دەزانـن هـەر بۆیـە داوای گەڕانــەوەی دەکـەن بـۆ تورکیــا و شۆڕشــی کوردیــش بــەوە تاوانبــار دەکــەن کــە دەیانــەوێ مووسـڵ بـە نەوتەکەیـەوە لـە تورکیـا دابـڕن و بیدەنـە ئینگلیـس لەبەرئـەوە ئینگلـــیز دەوڵـــەتی ســــەربەخۆی کوردســــتانی ڕاگــــەیاند و ئــــەرکی پاراســــتنی بەرژەوەندییەکانی خۆی خستووەتە ئەستۆی کوردستان.

لەبەشێکی تری ئەم وتارەدا نووسەر دەڵێت: بەم چەشنە کوردەکان بـۆ گەڕانـەوەی تورکیای کۆن، بۆ بەرژەوەندییە نەوتاوییـەکانی ئینگلیـز، بـۆ کردنـەوەی دەرگاکـانی بـە ڕووی کاپیتاڵی ئینگلیزیی و بۆ هێشتنەوەی کولوینالی ئینگلیز خەبات دەکەن. بەڵام ئایا ئەو شتانە هـەر بـە سـەرۆکایەتی کـەمال نـەکراون. بەلشـەویکەکان بـاش دەیـانزانی کـە کەمال کێیە، بەڵام ڕاستەوخۆ نەیاندەویست لەسەری بنووسن و خەڵکی تریـان لـە بـاتی وی تاوانبـار دەکـرد و دەیـانگوت دەبـێ دوژمنـانی شـۆڕش بـێ بەزەییانـەو بەشـێوەیەکی توند و بە دەستێکی ئاسنین سەریان بکوترێتەوە.

ناسیونالیسـتە تورکـەکان دەبـێ بزانـن کـە بـەبێ تـیرۆری بـە کۆمـەڵ هیـچ شــتێك ڕێگایان لێناگرێت و نابێ بەزەییان بە هیـچ کەسـدا بێتـەوە، ئەمـە هەڵوێسـتی پـارتێکی کۆمۆنیست و ئەنتەرناسیونالیستییە بەرامبەر بە گەلێکی بێ بـەش لـە هـەموو مـافێك. بەلشەویکەکان بە قسەی خۆیان بێت، دەبێ یارمـەتی گـەلانی چەوسـاوە و بزووتنـەوەی ڕزگاریخوازی گەلان بدەن، بەڵام نەك هـەر یارمـەتییان نـەداوە، بـەڵکو لەسـەرکوتکردنی ڕاستەوخۆی بزووتنەوەی کورددا بەشدارییان کردووە.

چیچیرین، وەزیری دەرەوەی پێشووتری سۆڤێت لـە مـانگی مـارتی *1925* دا کـە بـۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی چوارەمی شوورا لینینییەکان دەچێتـە ئـەوێ، دەڵـێ: نـاتوانم ئـەوەش نـەڵێم کــە لــەم کۆبوونەوەیــەدا هاوڕێیــانی کــورد هــەن و لــەم ناوچەیەشــدا دانیشـتووانی کـورد دەژیـن و زۆربـاش بـوو ئەگـەر ئەوانـە لـە سـەرکوردەکانی دەرەوەی

کۆمارەکەی ئێمە دەوریان هەبوا و کاریان تێکردبان تا نەکەونە داوی کۆنەپەرستانی جیهانییەوە. من دەزانم و هەمووماں دەزانین کە هیچ ناوچەیەکی یەکیەتی سۆڤێت وەك ناوچەی لینینییەکان لە دەستی دراوسێکەمانەوە (واتە تورکیا) زیانی لێ نەکەوتووە، بەڵام هاوڕێیان ئێمە دەبێ ئەو فاکتە مێژووییەمان لەبەر چاو بێت کە تورکیا یەکەم دەوڵەتی موسوڵمانی ڕۆژهەڵاتە کە ئایینی لە دەوڵەت جیا کردووەتەوەو سیستمی خەلافەتی لەناو بردووە، بە گشتی جێگایەکی پێشڕەوانەی گرتووەو دژی ئیمپریالیزمە، لەم کاتەدا کە تورکیای نوێ بەرامبەر سەرمایەداریی و کۆنەپەرستی جیهانی راوەستاوە، ڕاپەڕینی کوردەکان ناتوانێت نەبێتە چەکێك بە دەستی ئیمپریالیزمەوە بۆ روخاندنی تورکیای نوێ، ئەو هاوڕێ کوردانەی لێرەدا ئامادەن دەبێ بزانن کە ڕاپەڕینەکە لە خزمەت ئیمپریالیزمی جیهانی دایە.

ئەحمەد شوکری سەر نووسەری ڕۆژنامەی (وەتەن) کە دێتە سۆڤێت و چەند شارێك دەگەڕێ لە باتوم وتو وێژی لەگەڵ دەکەن (*14/ی مارتی 1925*) پاش بەد ناوکردنی بزووتنەوەی کوردان، دان بەو ڕاستییەدا دەنێت و دەڵێ: سەرکردەی کوردەکان ناتوانن دەست لەو سەربەخۆییەی کە لە سەردەمی سوڵتاندا هەیانبووە، هەڵبگرن و لە یادی بکەن، ئێس تا بێ بەشن لەو شتە، بۆیە دەستیان داوەتە هێرش و پەلامارو دژایەتی کۆماری تورکیا، هەروەها دەڵێ تورکیا لە ئاڵۆزترین ڕۆژانی خەباتی بۆسەربەخۆیی و یەکپارچەیی نیشتمانەکەی ئەو یارمەتییە لە بیر ناکات کە یەکیەتیی سۆڤێت پێی گەیاندووە.

زاریا وەستوك بۆ ترساندنی کوردەکانی سۆڤێت و دابەزاندنی ورەیان، کۆمەڵە هەواڵێك بڵاو دەکاتەوە لە ژێر سەر دێڕی "ڕاپەڕیوەکان گەمارۆدراون"، "ئاڵقەی گەمارۆی ڕاپەڕیوەکان ڕۆژبە ڕۆژ تەسکتر دەکرێتەوە"، "ڕاپەڕیوەکان هەڵدێن" "شێخ سەعید بە فەرمانی کۆمیتەی سەربەخۆیی کوردستان کە لە بەغدا کۆبووەتەوە دەستی داوەتە ڕاپەڕین و کاربەدەستانی تورکیا نامەیەکیان لەم بارەوە لەو دوو کەسە بە دیل گیراوە کەوتووەتە دەست و.. هەروەها هەواڵی یارمەتیدانی هەندێ لە هۆز و عەشیرەتەکان بۆ سوپای تورک دژی بزووتنەوەکەی بڵاو دەکرێتەوە".

## ڕۆژنامەی پراڤدا چواری مارتی *1925*
## -ڕا پەڕینی دژی شۆڕش لە تورکیا و گرنگییەکەی-

سەردێڕی وتارەکە:

-گۆڕینی یاسای باج، دوژمنانی شۆڕشی لە شوێنە کشتوکاڵیەکانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بەهێز تر کردووە.

-بەشێك لە بورژوای ئەستەنبووڵ هاوسۆزن لەگەڵ ڕاپەڕیوەکاندا.

-ڕاپەڕ ینەکە بە پێی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی ڕێکخراوە.

-ڕاپەڕین پەیوەندی هەیە بە هاتنی کۆمیسیونی (کۆمەڵەی نەتەوەکان)ەوە بۆ مووسڵ.

ڕۆژنامەی (حاکمییەتی میللی) ئورگانی ڕەسمی دەوڵەتی تورکیا لە وتاری سەرەکی خۆیدا، بە تەواوی ئاماژە بۆ ئەو فاکتە دەکات کە ڕاپەڕینی ڕۆژهەڵاتی ئەناتولی بە هیچ شێوەیەك ناوچەیی و سەربەخۆ نییە. ڕۆژنامەکە دەنووسێت "نابێ وەك ڕاپەڕینێکی ناوچەیی تەماشای ڕووداوەکانی گەنجە بکەین، مەترسی کۆنەپەرستی لە سەرانسەری وڵاتدا وەك یەك هەیە، چونکە جەم و جووڵی کۆنەپەرستانە لە هەموو شوێنێك بەرچاو دەکەوێت. ئەم ڕاگەیاندنەی ڕۆژنامەی ناوبراو هیچ گەورە نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە. ڕووداوەکانی ئەم چەند مانگەی دوایی بە تەواوی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەرئەخات کە بڵێین دژە شۆڕش دەستی بە خۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی هێزەکانی کردووە لە سەرانسەری وڵاتدا و لەم بارەشەوە هەندێ سەرکەوتنی بە دەست هێناوە.

## کام لایەن لە ناوەوەی وڵات لە پشتی ئەم ڕا پەڕینەوەیە؟.

گۆڕەپانی بزووتنەوەکەی ئەمڕۆ تەنیا لە خاکی کوردا نییە، بەڵکو لە ناوچەیەکدایە کە فیودالیزم دەستەڵاتی بە دەستەوەیە تیایدا. بزووتنەوەکە چەند ناوەڕۆکێکی نەتەوایەتی یاخود عەشایەری هەبێت ئەوەندەیش بەرژەوەندی چینایەتی تیا بەدی دەکرێت، واتە بەرژەوەندی خاوەن موڵك و بورژوای تێدایە، لەبەرئەوەیە کە ڕاپەڕینەکە لە لایەن چینی چەوسێنەری فیودال و خاوەن موڵکە گەورەکانی تەواوی تورکیاوە کە دوورن لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە هاوسۆزی لەگەڵ دەکرێت.

ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات لە مێژە کردەوە پێشکەوتنخوازەکانی ئانکارا پەسەند ناکەن و بە باشیان نازانن، وەك چۆن لە مەجلیسی دەورەی یەکەم و هەروەها لە دەورەی دووهەمیشدا نوێنەرانی ناوچەی ڕۆژ هەڵات لە مەجلیس چ کورد و چ تورك زۆر لەسەرخۆ و بە بەردەوامی نوێنەرایەتی بەرژەوەندی فیودال و خاوەن موڵکەکانیان کردووە، لە کاتی خۆیشیدا ئەوانە دژی لەناوبردنی دەسەڵاتی سوڵتان بوون و لە پێناویشیدا خەباتیان دەکرد و تا ئێستاش ئەوانەلەگەڵ لەناوبردنی پاپای تورکیا واتە خەلیفە ناتوانن سازش بکەن و بە توندی دژی هەر چەشنە ڕیفۆڕمێك بوون کە باری ژیانی جوتیاران کەمێ سووکتر بکات.

ئوردوگای فیودالە کێوییەکان بەهۆی گلاڵەی یاسای باج و دەیەکەوە کە دەوڵەت دەری کردووە ترسێکی گەورەیان لێ نیشتووە، ئەو یاسا چەوسێنەرەی سەدەکانی ناوەڕاست کە هیچ شتێکیان بە جوتیاران و وەرزێران ڕەوا نەدەبینی و گەیاندبوونیە رادەی مەمرەو مەژی. فیودالەکانی تورکیا بەم ڕیفۆڕمە هەستیان بە گورزێکی گەورە کرد. لەویلایەتە دوورەکانی ڕۆژهەڵات (نەك هەر تەنیا لەویش) دانان و دیاریکردنی

بـڕی بـاج و کۆکردنـەوەی هـەر بـە دەسـتی دەرەبەگـەکان بـووە، بــە نــاوی دەیەکــەوە و هەندێ جاریش (*30-40*) لـە سـەد و بگـرە پـەنجا لەسـەدی تـەواوی بەرهـەمی جوتیـار و وەرزێرانیان لێدەسەندن ئیتر باسی ئەوە ناکرێت کـە دەوڵـەت بەشـێکی زۆر کـەمی ئـەو باجەی پێدەگەیشت ئەمە سەرچاوەی هەرە گەورەی دەوڵەمەند بوونە کە دەرەبەگـەکان بـەهۆی ئـەم یاسـا نوێیـەی باجـەوە لەکیسـیان دەچێـت، هـەر بۆیـە نـابێت گومـان لـەوە بکرێت کە یاسـای لابردەنـی (یـەك لـە دە) کـە لـەم ڕۆژانـەدا مـەجلیس پەسـەندی کـرد ڕۆڵێکی گرنگی هەبوە لە سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکەدا.

بەڵام پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە دوژمنانی شۆڕش تەنیا خاوەن موڵکـی گەورە و دەرەبەگەکان نین، هەر چەند ئەمانە کادری سەرکردایەتی شـەڕەکانن، چونکـە هاوپەیمانەکانیان لە باری فیکـری و داراییـەوە بەشـێکی گـەورەی بـۆرژوازی بازرگـانی و پیشەسـازی ئەسـتەنبوڵ و ناوەندەکـانی تـری وەك شـارە بەندەرییـەکانی تورکیـان، بــورژوای دەوڵەمــەندی بــەندەرەکانی تورکیــا، لــە پێــش هەموویانــەوە شــاری کوستانتینەبول، تا شۆڕشی نەتەوایەتی تورکیا، پردێك بوون بۆ تێپەڕبوونی سەرمایەی سەرمایەدارە فەرەنسی و ئینگلیزییـەکان و تێپـەڕاندن و جێبـەجێکردنی ئیـش و کـاری کۆلۆنیالیستانەیان لە ناوەوەی وڵاتدا.

بورژوازی کۆمپرادوری دوژمنێکی گەورە و دڵڕەقی شۆڕشـی نەتەوایـەتی تورکیایـە و بەهۆی توانا و هێزی ئابووری و پەیوەندی لەگەڵ سەرمایەدارانی فەرەنسـا و ئینگلـیز دوو ئەوەندە دەوڵەتی نیشتمانی تورکیای تووشی مەترسی کردووە.

لـەم مانگانــەی دواییــدا تاقمــە کۆنەپەرســتەکان دەســتیان داوەتــە کۆکردنــەوەی هێزەکانی خۆیان و لە کۆتایی ساڵی *1924*دا باڵی ڕاستی پـارتی گـەل جیابوویـەوەو یـەك ڕۆژ دوای جیابوونەوەکــە، دروســتکردنی "پــارتی جومــهوریی پێشــکەوتنخواز" ڕائەگەیەنێت و بەرنامەی خۆی کە پێشتر ئامادەی کردبوو بڵاو دەکاتەوە، لـە ریزەکـانی ئـەم پارتـەدا لایـەنگران و هـەوادارانی ڕۆژئـاوا و ئەوانـەی کـە دەیانـەوێ بەرامبــەر بــە ڕۆژئاوا و کاپیتاڵی ڕۆژئاوا پاشە کشە بکەن، هەروەها ئەوانەی کە دژی قــووڵ بوونـەوەو پەرەسەندنی شۆڕشی نیشتمانی ئێستای تورکیان بەرچاو دەکەون.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پڕۆگرامی ئەم پارتە نوێیە پروگرامێکی ئوڵترا دیموکراتییە چاپەمەنییەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، هەر بە شان و باڵی ئەم پارتەدا هەڵدەدەن دیلی تەلەگراف، لە *27*ی نۆڤەمبەری *1925*دا لەسەر پڕۆگرامی ئەم پارتە دەنووسێت: کە یەکەم خاڵی گرنگ لەم پڕۆگرامەدا ئەوەیە کە دەڵێت پێویستە سەرمایەی وڵاتانی دەرەوە رابکێشرێت بۆ تورکیا و بارودۆخێکی باش بڕەخسێنرێت بۆ ئەو سەرمایانە.

## بە گوێرەی ئاژانسی تیلگرافی ئاناتولی:

شێخ سەعید هەندێ ڕاپەڕینەکەی دواخستبوو تا کوڕەکەی لە ئەستەنبوول بگەڕێتەوە، کە بۆ هەندێ پەیوەندی کردن چوو بووە ئەوێ، لە بانگەوازەکەی شێخ سەعیدەوە دەرئەکەوێ کە بزووتنەوەکە دەیەوێ سوڵتان و خەلیفە بگەڕێنێتەوەو مەبەستی لە ناوبردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کافر و مولحیدی ئێستایە، بەڵام سەرەڕای پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکە، کە ناوچەیەکی بەدرێژایی *500* کیلۆمەتر و بە پانایی *250* کیلۆمەتری گرتووەتەبەر، ئەو راستییە یەکسەر بەرچاو دەکەوێت کە بزووتنەوەکە بە باشی ڕێك نەخراوەو لە ناو خۆیشیدا ڕێك و پێك و یەکدەست نییە، لە تەلگرافەکاندا دیار بوو کە ڕاپەڕینەکە لە مێژە ئامادە دەکرێت و دەبوا لە کۆتایی مانگی مارتدا دەستی پێکرابا، بەڵام سەرهەڵدانە لە ناکاوەکەی گەنجە بوو بەهۆی پێشخستنی ڕاپەڕینەکە.

گەرچی ئێمە ئەوەندە دەنگوباسی پێویستمان بە دەستەوە نییە کە بڵێین بۆچی وا زوو دەستی پێکرد، بەڵام لە ڕێگای بەراوردکردنی هەندێ فاکتەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە پێش خستنی ڕاپەڕینەکە بە تەواوی لە خزمەتی بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی ئینگلیزەکاندا بووە، چونکە هەر لەم کاتەشدابوو کە کۆمیتەی کۆمەڵەی نەتەوەکان هاتە ناوچەی مووسڵی نزیك سنووری تورکیا. ئەرکی ئەم کومیسیونە تەنیا چارەسەرکردنی کێشەی مووسڵ نەبوو، بەڵکو بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ئەو ناوچەیەی تورکیا بوو کە ئەکەوێتە باکووری مووسڵەوە و لە کونفەرانسی

ئەستەنبوولی ساڵی پاردا ئینگلیزەکان داوای پێکەوە لکاندنی ئەو ناوچە تورکیانەی کرد بە مووسڵەوە کە گرنگترینیان ناوچەی هەکاری بوو، ئەو جێگایە کە هێلانەی راپەرینەکەی شێخ سەعید بوو.

لە کۆتایی مانگی سیپتامبەری ساڵی رابوردوودا گۆڤاری "دی دیبا" لەسەر گرنگی ئەم ناوچەیە نووسیبووی: پێوە نووساندنی ناوچەی هەکاری بە مووسڵەوە، ئینگلیز دەکاتە خاوەن قەڵایەکی شاخاویی کە زاڵە بەسەر مووسڵدا و کۆنترۆڵی رێگاکانی بەرەو میزوپوتامیا دەکات، رێگاکانی تەخوم و رەواندز کە سوپای قەیسەری ساڵی *1916-1915* بەویدا گەیشتە میزوپوتامیا و بەم چەشنەیش دەکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان. ماوەیەك لەمەوبەر رۆژنامەی تایمزی لەندەنی ئاماژەی بە گرنگی ئەم ناوچەیە کردبوو بۆ هێمنایەتیی وڵاتەکەی و رێگاکانی بەرەو هیند، ئەو شاخە بەرزانەی کە ئینگلیز داوایان دەکات دەتوانێت ببێتە هۆی پتەوکردنی ئەو گۆڕەپانەی کە لەوێوە ئینگلیز بەسەر ناوچەی وان و دیار بەکر و ورمێ و تەواوی ئەو رێگایانەی کە بەرەو ئەرمەنستان و قەوقاز و ئێران دەڕوات.

بەم چەشنە ئێمە دەبینە شاهیدی رێکەوتێکی باش، واتە ئەو کاتەی کە کومیسیونی کۆمەڵەی نەتەوەکان دێتە ناوچە سەر سنوورییەکانی تورکیا، واتە بۆ ئەو ناوچەیە کە ئینگلیزەکان دەیانەوێ لە تورکیای دابڕن، راپەڕین دەست پێدەکات ئەویش بە سەرۆکایەتی کابرایەکی نەناسراو "کەسایەتییەکی نەتەوەیی" واتە شێخ سەعید. دەستەی نوێنەرایەتی تورکیا لە کۆنفەرانسی ئەستەنبووڵ پێشنیاری ئەوەیان کرد کە کێشەی مووسڵ بە رێگای راپرسییەکی گشتی لەناو دانیشتووانی ناوچەکە چارەسەر بکرێت. دیپلۆماتەکانی ئینگلیز نەیانتوانی دژی ئەم پێشنیارەی تورکیا بچووکترین دەربڕینێك بۆ رەتکردنەوەی دەربڕن بەڵام راپرسی گشتی بۆ ناوچەی مووسڵ و ناوچەکانی تر لە پێشدا دیار بوو کە بە واتای دەست کێشانەوەی لە دەسەڵاتداریەتی خۆی بەسەر ناوچە ناوبراوەکاندایە کە لە باری ستراتیژییەوە زۆر گرنگن، لەبەرئەوە ئینگلیز بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر دەستەی نوێنەرایەتی کۆمەڵەی نەتەوەکان و هەروەها "بیروڕای گشتی" خەڵك بەلای خۆیدا راکێشێت هەڵبژاردنی گشتی خۆی دێنێتە سەر

شانۆ، واتە ڕاپەڕینی شێخ سەعید دروست دەکات. کە ئەم بزووتنەوەیە بە پێی پلانی ڕێکخەرەکانی، دەبێ بە یەکجاری بە کۆمەڵەی نەتەوەکانی بسەلمێنێت کە نەك تەنیا دانیشتوانی مووسڵ. بەڵکو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەناتولیش لە دەوڵەتی نیشتمانی تورکیا بێزارن.

ئەمە ئەو هۆیە بوو کە ئینگلیزەکانی ناچار کرد ڕاپەڕینەکە پێش بخات بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کە ئەمە زیان ئەگەیەنێ بە بزووتنەوەکە خۆی.

بە پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکە ئیمپریالیزمی ئینگلیس بۆ پێش خستنی مەبەستەکانی تری، خۆ وە درەنگ ناخات، پێکهێنانی "کوردستانێکی سەربەخۆ" و نوێکردنەوەی دەوڵەتی "قانونی" سوڵتان و ...هتد.

کام هێزە دەتوانێ بەرامبەر بە دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیا ڕابووەستێت گەر بلۆکی هاوبەشی دوژمنانی شەڕی ناوخۆیی و ئیمپریالیزمی ئینگلیز نەبێت؟ پێش هەموو شتێك دەبێ یەکیەتیەکی نزیك لەگەڵ کۆمەڵانی فراوانی جوتیاران ببەسترێت. تا ئێستا دەوڵەت هەنگاوی تەواو و ڕادیکاڵی لە بواری ڕیفۆرم بۆ جوتیاران هەڵنەگرتووە. لابردنی (دەیەك) تەنیا یەکەم هەنگاوی ئازایانەی بوو، دەوڵەت دەبێ بەرانبەر ئەو ڕاپەڕینە کۆنەپەرستانەیە، ریفۆڕمەکانی خۆی بە پەلە جێبەجێ بکات و دەست بکا بە لەناوبردنی سیستمی فیودالی - موڵکداری و هەر چەندە بە خێرایی و زووتر بەرامبەریان خەبات بکات ئەوەندە زووتر و خێراتر دەتوانێ کۆمەڵانی جووتیاران کە ئێستا لەناو بزووتنەوەکەی شێخ سەعیددان لێیان دابڕێت.

لە ساڵی *1921*ەوە جێگای وا نییە کە ئینگلیزەکان تیایدا هەوڵی لەناوبردنی کۆماری سەربەخۆیی تورکیایان نەدابێت و هەوڵیان نەدابێت بۆ ئەوەی هەموو شتێك بگەڕێننەوە بۆ بارودۆخی کۆن بەڵام هەمووی بێ کەڵك بووە ئێمە باوەڕی پتەومان هەیە کە ئێستایش بانگەوازی ئیمپریالیستی ئینگلیز بۆ "گیانە مردووەکان"ی "تورکیای کۆن" دەمرن و نامێنن... س. بریکی.

## هەر لەو ژمارەیەی براڤدا ئەم بابەتە نووسراوە.
## کۆنە پەرستانی تورکیا خۆیان دەردەخەن و بانگەوازی گەڕانەوەی خەلیفە دەکەن.
## کێ یارمەتی ڕا پەڕیوەکان دەدات؟. هەڵوێستی ڕا پەڕیوەکان.

**ئانکارا**. *3/* **مارتی** */ 1925.*

کار بەدەستانی دەوڵەت رایانگەیاندووە کە پێویستە لەسەر ئەو ناوچە بەر بڵاوە کەڕاپەڕینەکەی لە خۆ گرتووە و ناوچەیەکی شاخاوییە حەسابی لەسەر بکرێت. ئەو شوێنانەی کە هێزی سەرەکی ڕاپەڕینەکەی تێدا کۆ بووەتەوە ئەمانەن: لە پالووە بەرەو باکووری دیاربەکر و پاشان بەرەو باشوور بەو هێڵەدا شۆڕ ئەبێتەوە کە تەواوی ویلایەتی خارپوت و سەرچاوەکانی (پۆرمەنگەنات) ئەگرێتەوە: بەو پلانەی کە دەوڵەت دایناوە، کۆکردنەوەی سوپا و ناردنی بۆ ئەوێ کاتێکی زۆر دەخایەنێت، بەڵام جارێ بوردومان کردن تەنیا بە هۆی فرۆکەوە جێبەجێ دەکرێت.

بەپێی ئەو هەواڵانەی دەگاتە ئێرە تەواوی خێڵە کوردەکان هێشتا تەسلیمی ئاژاوەکەی شێخ سەعید نەبوون. دەوڵەتی ئانکارا تا ئێستا لە لایەن چەند سەرکردەیەکی خێڵەکانەوە، بەڵێنی پێدراوە کە بەرامبەر بە دەوڵەت ڕانەوەستن و لایان وایە کە شێخ سەعید دار دەستی ئینگلیزەکانە. باشووری کوردستان بەرامبەر بە دەوڵەتی ئانکارا هەر بە وەفاداری ماوەتەوە. ناوەندی سەرەکی ڕاپەڕینەکە بتلیسە و ژمارەی ڕاپەڕیوەکان نزیکەی حەوت هەزار نەفەرن.

دەستەی نوێنەرایەتی ڕێکخراوە جیاجیاکان لە ئەستەنبووڵ و ئەدەنە بروسکەی پشتگیری خۆیان ناردووە بۆ دەوڵەت و ئامادەییان دەربڕیوە بۆ بە دەنگەوە چوونی "یەکەم بانگەوازی دەوڵەت بۆ پاراستنی کۆمار".

بەپێی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەی جومهوریيــەت، ئۆرگـانی ڕەسمـی دەوڵـەت، دیاربـەکر، مالاتیا، ئارگانا، لە دەستی ڕاپەڕیوەکاندایە، هـەروەها دەرسیمیشـیان گرتـووە، ڕۆژنامـەی (تانین) لەو باوەڕەدایە کە گرتنی دەرسیم بـۆ ڕاپـەڕیوەکان زۆر گرنگـە، چونکـە دەست گەیشتن بەو ناوچەیـە زۆر زەحمەتـە و هێرشـی سـوپای دەوڵـەتی دژی سـەرهەڵداوەکان دەتوانین بڵێین بە هیچ شێوەیەك جێبەجێ نابێت و سەرناگرێت. سـەبارەت بـە گرتنـی دیاربەکر لەلایەن ڕاپەڕیوەکانـەوە، هێشـتا کاربەدەسـتانی دەوڵـەتی هـەواڵی تـەواویان لا نییە.

## کێ لە پشت کۆنە پەرستانەوە خۆی شاردووەتەوە؟

لە بەیاننامەو ڕاگەیاندنەکانی ڕاپەڕیوەکان کە لە ناوچەکەدا بڵاویان کردووەتـەوە هاتووە، "خەلیفە چاوەڕێتان دەکات"، "بەبێ خەلیفە ئیسلام نابێت". "دەوڵەتی ئێسـتا بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە دەیەوێ گیانی ئایینداری خـەڵك لـەناو ببـات"، "ژنـان بــەبێ چارشــێو دەچنــە دەرەوە"، لــە قوتابخانــەکان وانــەی بــێ دینــی و خوانەناســی دەڵێنەوە.

ئــەم بەیاننامــە و ڕاگەیاندنانــە بەشــێوەیەکی تــەکنیکی بــڵاو دەکرێنــەوە، کە زەحمەتە ئـەم تەکنیکـە لـە بەردەسـتی شـێخ سـەعیددا بێـت. ئەوانـەی کـە بـە دیـل گـیراون جلوبــەرگی بێگانــەیان لەبــەردا بــووە، ئــەم دوو فاکتــە هیــچ شــکو گومــانێك ناهێڵێتـەوە لـەوەدا کـە ئەمانـە هاودەسـتیان هەیـە لـە دەرەوە. جگـە لـەوە لــە گیرفـانی دیلـەکاندا، پــارەی بێگانــە دۆزراوەتــەوەو، هــەندێ لــەو دیلانــە چــەکی دروســتکراوی بێگانەیان پێ بووە.

## پراڤدا *4*ی ئۆكتۆبەری *1925*
## -نەوت و مەسیحییەت لە مووسڵ.
## -ئاسوورییەكان لە *7٪*ی دانیشتووانی مووسڵ پێكدێنن.

-ئیمپریالیستی ئینگلیزی بە دەستی كوردەكان ئاگرەكە دەكوژێنێتەوە.

*15* /ی سیپتەمبەری ئەمساڵ، نوێنەرانی ئینگلیز یاداشتنامەیەكیان دایە كۆمەڵەی نەتەوەكان، تیادا توركیا تاوانبار دەكەن بە دەركردنی بەردەوامی مەسیحییەكان لە ناوچەكاندا. هەروەها بە ناوی عێراقەوە داوای كردووە كە هێڵی سنووریی نێوان عێراق و توركیا كە لە كۆنفرانسی برۆكسل دیاری كرابوو، بە ڕەسمی بناسرێت، بەم چەشنە ئینگلیز دەوری بەرهەڵستكاریی مەسیحییەكان دەبینێ لە ناوچەی مووسڵ كە كێشەی لەسەرە. ئیمپریالیزمی ئینگلیزی غیرەتی ئایینی جووڵاوە. هەروەها ڕۆژنامەی (مورنینگ پۆست)ی كۆنەپەرست دەنووسێت كە ئینگلیز ئەركی پاراستنی مەسیحییەكانی سووریای گرتووەتە ئەستۆی خۆی، چونكە ئەوانە لە كاتی شەڕی جیهانیدا پشتی هاوپەیمانانیان دەگرت. بەڵام هۆی راستی مەسەلەكە ئەوەیە كە لە پەیمانی سێڤەردا، فەرانسە بە تایبەتی پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو كە كوردستانێكی سەربەخۆ لە ژێر چاودێریی ئینگلیز و فەرەنسادا دروست بكرێت و كوردەكانی ویلایەتی مووسڵیش بگرێتە خۆ و لە چوار چێوەی ئەودا بن. بەڵام ئەم پلانە سەری نەگرت. كێشەی مووسڵ وەك كێشە یەكی سەربەخۆ مایەوە. بڕیار درا كە كۆمیسیۆنێكی تایبەتی سەر بە كۆمەڵەی نەتەوەكان بۆ چارەسەركردنی كێشەی مووسڵ لە ڕێگای ریفراندومەوە پێكبێت و دەبێ ئەم كۆمیسیونە بچێتە ناوچەكە و بڕیاری چارەسەركردنی تەواوی كێشە كە بدات، كۆمیسیون هاتە مووسڵ و گەڕایەوە و ئەو ڕاپرسییەی كە بڕیاریان لەسەردابوو نە لەلایەن تورك و نەلەلایەن ئینگلیزەكانەوە

پەسەند نەکرا. ئینگلیزەکان ئێستا لە هەوڵی فڕوفێڵێکی تردان و داوای ئەو ناوچەیەی سەرووی مووسڵ دەکەن و بەم چەشنە دەیانەوێ تورکیا ناچار بکەن کە بەرامبەر بە کێشەی مووسڵ پاشەکشە بکات و ئەمانیش لەو ناوچەیەی سەروو مووسڵ بێنە دواوە و بیدەن بە تورکیا.

سیاسەتی ئینگلیز کە لە ژێر پەردەی پاراستنی مەسیحییەکانەوە بەڕێوە دەچێت، پێش هاتنی کۆمیسیونی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە ئاسووری و مەسیحییەکانی ڕاگەیاند کە بگەڕێنەوە شوێنی نیشتەجێبوونی پێشووی خۆیان. ئەم کردەوەیە بۆ ئەوە بوو کە ئەوانە بکا بە بیانوو بۆ هێرش کردنە سەر تورکەکان کە گوایا بەرژەوەندی مەسیحییەکان دەپارێزێ. تورکەکان بەرامبەر بەم پیلانەی ئەوان ڕاوەستان و لەچەند ناوچەشدا چەکدارە ئاسوورییەکانیان دەرکرد. ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە ئینگلیزەکان دەست بکەن بە بلاوکردنەوەی ئەو کارەساتە پڕ لە مەترسی و خەمناکەی کە تورکەکان بەسەر مەسیحییەکاندا هێناویانە.

بەلام بۆ بارودۆخی مەسیحییەکانی مووسڵ وایە؟ زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی ناوچەی مووسڵ کە ‎-/801‎ هەزار نەفەرن واتە ‎-/494‎ هەزاریان کوردن. ژمارەی مەسیحییەکان لەناویاندا تەنیا ‎-/61‎ هەزارە واتە ‎7.5٪‎ مەسیحییەکان لە ئاسووری و نەستوورییەکان پێکهاتوون کە لە خێڵە هەرە جەنگاوەر و چالاکی چیاکانن، کە دیپلوماتە ئینگلیزەکان دەیانەوێت دەوڵەتێکیان بۆ دروست بکەن لەگەڵ مەسیحیە خالدیەکاندا . جگە لەوە بە پێی سەرچاوە ئینگلیزییەکان 26 هەزار یەزیدی بە ئایینی نهێنی و شاردراوەو تایبەتی خۆیانەوە دەژین، هەروەها پانزە هەزار جوولەکەی لێ دەژی.

ئەگەر لە میتودی کولونیالیستی ئینگلیزەکان ورد ببینەوە، بومباران کردنی گوندەکان لە لایەن فرۆکەوانەکانی ئینگلیزەوە کە خەڵکی بێ تاوانیان تیابوو بە بیانووی نەدانی باج و.. هتد، کێشەی مەسیحییەکان لەناو کورد و عەرەبدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەراو هۆریای خۆشەویستی و پاراستنی مەسیحییەکان لە لایەن ئینگلیزەکانەوە هیچ مانا و بنچینەیەکی نییە و هەمووی درۆیە و هەر بۆ ئەوەیە کە

نیشانی دونیا بدات کە نەك تـەنیا مەسـیحییەکان بـەڵکو کـوردە موحەممەدییـەکانیش، ئینگلیزیان لە تورك پێ باشترە.

بەکرێ گیراوەکانی ئینگلیز بەهۆی پارەوە توانـی فیودالـە کوردەکـان بـەلای خۆیـدا رابکێشـێت و کوردەکـانی هێنایـە ڕیـزی ئاسـوورییەکانەوە و یـەکی خسـتن و ئـەوە بـوو دە ستدرێژییان کردە سەر ئەو ناوچەیە کە گێرەو کێشەی لەسەر بوو، پاش تێکهەڵچوون لەگەڵ تورکەکان، کوردەکان شکستیان هێنـا و ڕایـان کـرد بـۆ ناوچـەی مووسـڵ. لـێرەش دووبارە پیلانێکی تـر دروست کـرا، بـە پـارەو چـەکی ئینگلـیز ڕاپـەڕینی کوردەکـان لـە ئەناتولی ڕێکخرا، ئەم ڕاپەڕینـە وەك ئاشـکرایە لـە ماوەیـەکی کورتـدا لـە لایـەن سـوپای تورکیاوە سەرکوتکرا، لەگەڵ ئەوەشدا ئینگلیزەکان پێیـان وایـە سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێناوە، ئەوان لایان وایە کە توانیویانە جیهان تێبگەیەنن کە کوردەکان نایانەوێ لەگەڵ تورکەکان بژین و خۆشیان ناوێن و راپرسی گشـتیش بـۆ مووسـڵ پێویست نییـە. بـەڵام تورکەکانیش بە کەڵك وەرگرتن لـە ڕاپەڕینەکـە توانییـان سـوپای خۆیـان بنێرنـە سـەر سـنوورەکان کـە ئێسـتا نزیکـەی سـەد کیلۆمـەتر لـە مووسـڵەوە دوورن و مەترسـی و هەڕەشەی چوونە ناو مووسڵ (دەستکەوتی ئینگلیز) دەکەن.

س. ئەرکئیر.

## لەناوبردنی ڕا پەڕینی دژی شۆڕش

لەماوەی *10-13*ی مانگی ئەپریلی *1925* دا سـوپای تورکیـا توانـی نزیـك بـە تـەواوی ڕاپەڕینەکـەی شـێخ سـەعید لـەناو ببـات. سـەرکردەی ڕاپـەڕیوەکان لەگـەڵ هـەموو ئـەندامانی سـەرکردایەتییەی بـە دیـل گـیران، کومیسـاری کاروبـاری نـاوخۆی تورکیـا (جەمیل بەگ) لەوتووێژێکدا لەگـەڵ چاپەمەنیـەکاندا، ڕایگـەیاند کـە بـە گرتنـی شـێخ سـەعید هێشـتا تـەواوی ڕاپـەڕیوەکان چـەك نـەکراون، ژمارەیـەکی زۆریـان لـە چیاکـان خۆیـان شـاردووەتەوە، بـەڵام ئەمانـە چـەند گروپێکـی پـەرت و بـڵاون، ئەوانـە ورەیـان

بەرداوەو بێ سەرکردەن و هیچ مەترسییەکیان لێناکرێت، دەوڵەت گلاڵەی پڕۆژەیەکی ریفۆرمانەی بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات بە دەستەوەیە و دەرەبەگایەتی لەناو دەبرێت لە کوردستان و خێڵە کۆچەرەکان نیشتەجێ دەکرێن، کوردەکان چەك دەکرێن. لە باری ئیداری و بەرێوەبردنەوە گۆڕانکاری دەکرێت لە ناوچەکەدا و ویلایەتەکان کەم دەکرێنەوە.

## کاری دادگا سەربەخۆکان

ئەم دادگایانە لەسەردەمی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیددا دامەزراون، یوسف زیاء، نوێنەری پێشووی بیتلیس لە مەجلیسی تورکیا، پالکوڤنیك خالید جیرانلی و هەندێ کەسی تر کە بەشداری ڕاپەڕینەکەیان کردووە، بە مەرگ تاوانبار کران.

-کۆمیتەکانی پڕوپاگەندەی بیروباوەڕی کۆماریی تورکیا، کە لە قوتابییەکانی ئەستەنبوول پێکهاتوون دەنێردرێن بۆ کوردستان بۆ ئەو ناوچانەی کە ڕاپەڕینە دژ بەشۆڕشەکە گرتبوویەوە.

-ئینگلیزەکان دەستیان کردووە بە گرتنی ئەو نوێنەرانەی کە داوای یەکگرتنەوەی مووسڵ دەکەن لەگەڵ تورکیادا، هەروەها دەستیان بە ناردنی چەکداری ئاسووری کردووە بۆ سەر سنووری تورکیا، ئەمەش دوای ئەوەی کە ڕاپەڕینی کوردەکان ئەنجامێکی بەدواوە نەبوو بۆیان.

## دەنگوباسی بزووتنەوەی کرێکاری لە تورکیا

کۆنفیدراسیۆنی کاری تورکیا، بە بۆنەی بەدیل گیرانی شێخ سەعیدەوە بروسکەیەکی ناردووە بۆ مەجلیسی تورکیا بەم چەشنەی خوارەوە:

**بەبۆنەی بەدیل گیرانی شێخ سەعیدەوە پیرۆزباییتان لێ ئەکەین لە ناوبردنی ڕاپەڕینی دژی شۆڕش ڕێگایە بۆ لەناوبردنی کۆنەپەرستی کە دەست درێژی دەکاتە سەر کۆمارەکەمان.**

**ئەندازیار عەبدی سەرۆکی کۆمیسیۆنی کونفیدراسیونی کاری تورکیا.**

**سکرتێری سەرۆك کۆمار وەڵامی پیرۆزباییەکەی بە بروسکە داوەتەوەو سوپاسی هەستی نیشتمان پەرستی کونفیدراسیۆنی کردوەو وەڵامەکە لە بولیتونی ژمارە (*1*) سەر بە بەشی ڕۆژهەڵاتی کومینترن، بڵاو کراوەتەوە.**

**- (*29*)ی ئۆکتۆبەری ساڵی پار لە کۆبوونەوەی شووڕای کۆمەڵەی نەتەوەکان لە بروکسل بەسەرۆکایەتی وەزیری بلجیکی (گومانس) بڕیاری هێشتنەوەی (ستاتوسی - کڤو) لەسەر مووسڵ دەرکرد، کە تورکیا و بەریتانیا کێشەیانە لەسەری. ئەم بڕیارە چییەو چی دەڵێت؟ بۆ ڕوونکردنەوەی پێویستە کورتەیەکی مێژووی کێشەی مووسڵ بزانرێت. مووسڵ ناوچەیەکە لە کوردستان کەسەر بە ئیمپراتورییەتی عوسمانی بوو، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردن، ئەم ناوچەیە کەوتووەتەسەر ناوەندێکی ستراتیژی کە ڕێگاکانی بەرەو ئەرمینیای سۆڤێتی، میزوپوتامیا و کوردستانی ئێران یەك ئەخاتەوە.**

**گرنگی ناوچەی مووسڵ، ئەو ناوەی کە لەم ڕۆژانەدا لەسەر پەڕەی ڕۆژنامەکانی جیهان دوور ناکەوێتەوە ئەوەیە کە کانگای لەبن نەهاتووی نەوتە. لاتان ئاشکرایە کە ئەم کەرەسە شل و سووتەمەنییە چ دەورێکی مەزن لە بواری پیشەسازی و ترانسپورتەوە دەبینێت. تێکۆشان لە پێناوی نەوتدا بووەتە یەکێك لە کێشە گەورەکانی سیاسەتی ئیمپریالیزمی جیهانی.**

**ئیمپریالیزمی بەریتانیا، پێش دەست پێکردنی شەڕی وێرانکەری ساڵانی *1914*-*1918* چاوی بڕیبووە سەر ئەم ناوچە گەورە نەوتاوییە. ئەوەتا کاتێك شەڕ بەسەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر بەرەی نەمسا – ئەڵمانیادا کۆتایی هات، ئینگلیزەکان بە پەلە بۆ پتەوکردنی جێ پێی خۆیان لە میزۆپۆتامیا مووسڵی لە دەوڵەتی تورکیا بە**

ئەنقەسـت و بەمەبەسـت دابـڕی و خسـتیە بـەردەم کۆمەڵـەی نەتـەوەکان و ناوچـەی مووسڵی خستە سەر خاکی عێراق. لە راستیشدا هەر لەوکاتەدا هەوڵی دەدا لـە ناوچـەی مووسڵ دەوڵەتێکی پووکەلی بە ناوی کوردستانی سەربەخۆ دروست بکـات. بـەڵام کـاتێك کە دەرکەوت زۆربەی دانیشتووانی حەز بە توورکیـا دەکـەن، پیـاوانی ئینگلیـز بـە خـەت کێشـان –راسـتتر وایـە بڵێـین بـە سـەرەنێزە- کوردسـتانی سـەربەخۆیان هەڵوەشـاندەوەو لکاندیـان بـە عێراقـەوە. تورکیـای شۆڕشـگێڕی لاو نـەیتوانی لەگـەڵ فـاکتی داگـیرکردنی مووسـڵ بێدەنـگ بێـت کـە لـە *60*٪ی دانیشـتووانی ناوچەکـە کـورد و تورکـن. دوای کونفرانسی لۆزان، پاش گفتوگۆیـەکی دوور و درێـژ بڕیـار درا کێشـەی مووسـڵ بـە جیـا لێی بکۆڵرێتـەوەو بـاس بکرێـت و هـەر دوو لا واتـە تورکیـا و ئینگلیـز لـە مـاوەی یـانزە مـانگدا پـاش چۆڵکردنـی ئەسـتەنبووڵ بڕیـاری لەسـەر بـدەن، ئەگــەر هــەردوو لایــەنی کێشەکە نەگەیشتنە هیچ ڕێکەوتنێك ئەوا جارێکی تر ڕووبەڕووی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەکرێتەوەو هەردوولا لەو شوێنانەدا دەمێننەوە کە لە کاتی کۆتایی هاتنی کۆنفرانسی لۆزان تێیدا بوون.

لە مانگی ئەپریلی *1924* دا لە کوستانتینەپول کۆبوونەوەیەك کرا لە نێـوان تورکیـا و بـەریتانیادا بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی مووسـڵ. نوێنـــەری مـــەکدونالد، کومیسـاری بەرزی عیراق، میستەر کۆکس، ئەو کەسـەی کـە بۆردومـانی گونـدە عـەرەب نشـینەکانی دەکرد کە ئامادە نەبوون خۆیان بدەن بە دەستەوە داخوازییـەکی ئـەوتۆی پێشکەشـکرد کە بە ئاشکرا ناوەڕۆکەکـەی پەسـەند نـەکراو بـوو و مەبەسـتی تێکدانـی کۆنفرانسـەکە بوو، ئینگلیس داوای داگیرکردنی ناوچـەی هـەکاری دەکـرد کـە بـە ئاشـکرا ناوچەیـەکی سەر بە تورکیایەو زۆربە ی دانیشتوانیشی تورکن و لە لایەن تورکیاوە بەڕێوە دەچێت.

نوێنەرانی تورکیا هەر ئەوەیان بۆ مایەوە دەسـت لـە داخوازییەکـەیان هـەڵبگرن و بـڕۆن و خـاچێکیش لەسـەر کۆنفەرانسـەکە دابنێـن. تورکـەکان داخوازییـەکی زۆر دیموکراتییانەیان هێنایە پێش، کە بریتی بوو لە ئەنجامدانی ڕاپرسییەکی گشـتی لـەناو دانیشتووانی ناوچەی مووسڵ بـۆ ئـەوەی بزانـرێ دەیانـەوێ سـەر بـە چ دەوڵـەتێك بـن. ئەمە بەڕاستی گورزێك بوو نەك لە برۆ بەڵکو لـە چـاوی میسـتەر مـەکدۆناڵد درا، ئـەو

کەسەی کە بەسەرزارەکی هاواری بۆ دیموکراتییەت دەکرد، بیرسی کوکسی نوێنەری مەکدۆناڵد بە ئاشکرا ئەو داخوازییە حەق و بەجێیەی تورکیا، وا ڕاپرسی پێشنیار کراو لە لایەن دەستەی نوێنەرایەتی تورکیاوە ڕەتکردەوە.

بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکە کار گەیشتەوە کۆمەڵەی نەتەوەکان کە لەوێ زۆربەی دەنگەکان لە بەرژەوەندی ئینگلیسەکاندا بوو. لە مانگی ئەیلولدا لە کۆبوونەوەی بەشی تایبەت بە کۆمەڵەی نەتەوەکان بە بەشداریکردنی ڕێبەری خێرخوازی ئەنتەرناسیونالی دووهەم سەرۆك وەزیرانی ئەمڕۆی سوید سوسیال دیموکرات برونتینگ کێشەی مووسڵ باسکرا. شایانی باسە کە تەواوی روناکی ئینتەر ناسیونالی دووهەم کەسیاسەتمەداری دوو ئاگرەن وەك، پول، وانکو، (بانکو)، ڤاندیر ڤالدو هیتر دادگای بەرزیان رازاندووەتەوە بڕیاریاندا کە کۆمیسیونێکی تایبەتی لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە، بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی مووسڵ بچێتە ناوچەکەوە. ئەو کاتە مەکدوناڵد سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بوو، ئینگلیزەکان بڕیاریاندا بە یارمەتی بەکرێگیراوانی ئاسووری، لەو ناوچە سەر سنوورییەی کە کێشەی لەسەر بوو داگیر بکەن، بەم چەشنە کۆمەڵەی نەتەوەکانیان خستە بەردەم حاڵەتێکی رووداوەوە. (ئاسوورییەکان پاشماوەی ئاسوورییە خالیدییەکانن).

ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە چوونە ناوەوەی گوندەکانی ناوچەی سەر سنووری تورکیا بە مەبەستی گرتنی دۆڵ و چیاکان. تورکەکان دەستەوئەژنۆ لێی دانەنیشتن و هێزێکیان بەرەو ڕووی هێزەکانی ئینگلیز بەرێ خست و هێندەی نەمابوو ببێتە شەڕێکی تەواو لە نێوانیاندا. ئەنجا مەکدوناڵد بە بروسکە بەناوبانگەکەی بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان داوای چارەسەری کێشەکەی کردو ئەوە بوو کە لە ڕۆژی (*29*)ی ئۆکتۆبەردا کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەو بڕیارەی دەرکرد کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، کە هەر دوولای کێشەکە بەو چەشنەی کە ئێستا تێیدایە لە ناوچەی مووسڵ رابیگرن.

بە لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەم بڕیارە دەرئەکەوێت کە کۆمەڵەی نەتەوەکان، لە خزمەتی بەرژەوەندی ئینگلیزەکاندایە و بەگوێرەی توانایش نایەوێ تورکیاش تووڕە بکات و بەرامبەر بەم منداڵە ساوایە کەم یا زۆر پاشەکشەی کرد. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم

بڕیارە لە دادگایی کردنەکەی حەزرەتی سلێمان دەچێت وەك لە تەورات داهاتووە کە بڕیاریدا ئەو منداڵەی کە دایك و باوکەکەی کێشەیان هەبوو لەسەری بە شمشێر بیکەن بە دوو کەرتەوە. ئەگەر چی ئەم بڕیارە وەك میستەر برانتینگ دەری بڕیوە ناوەڕۆکێکی کاتی هەیە، تا ئەو دەمەی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بە تەواوی دەرفەتی ئەوەی دەبێ کە بە باشی لە کێشەکە ئەکۆڵێتەوە.

ئێمە لێرەدا بەوردی لەسەر ئەم بڕیارە "ژیرانە"یە نادوێین، تەنها هەر ئەوەندە دەڵێین کە تەواوی ناوچەی مووسڵ -ناوچەکانی سەر سنوور- جیاکراوەتەوەو لەمێژە پارچە پارچە کراوەو ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکان کراونەتە دوو بەش یا زیاتر، تەنیا شتێك کە بۆ تورکیا مابێتەوە، ناوچەی هەکارییەکە (بیرسی کوکس) داوای دەکات بەڵام نابێ بە تەواوی لە بیرمان بچێت کە هەکاری ناوچەیەکی تورکیایە و کۆمەڵەی نەتەوەکان دەبوا بەتورکیایان بنوساندبا بەرامبەر بە ناوچەی سلێمانی کە بۆ ئینگلیزەکان ماوەتەوە. دوایین بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان لەسەر مووسڵ لە مانگی سی باشەشی ساڵی ئایندەدا دەردەچێت، بەڵام هەر لە ئێستاوە دیارە کە لە بەرژەوەندیی بەریتانیا دەبێت.

تورکیای شۆڕشگێڕ، لەگەڵ بڕیاری دادگاکەی سلێمان بەشێوەیەکی کاتی پێکهات ووەو هیوادارە کە بەشێوەیەکی ئاشتیانە بگاتە مەبەستی خۆی کە ئەوەش جێی گومانە. بەڵام پێش هەموو شتێك تورکیا ناچارە پەنا بەرێتە بەر چەك وەك تەنیا شتێك کە کاریگەری هەیە لەسەر ئیمپریالیستەکان و بە چەك نەبێت مووسڵ لە قوڕگی شێر دەرناهێنرێت.

## بڵاوکراوەی حەفتانەی دەنگوباس ژمارە ( *3* ) ساڵی *1925*

## بەشی ڕۆژهەڵاتی کۆمینترن.

نەرمی و هەڵنەگرتنی هەنگاوی توند و تۆڵ، دەوڵەتی فەتحی بەگی ناچار کرد بەرامبەر بە دەستی ئاسنینی بێ دەستەوانەی عیسمەت پاشا، پاشەکشە بکات و جێگای

بۆ چۆڵ بکات. پارتی گەل بە لە پێشگرتنی سیاسەتی روونی خۆی دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕین لە کوردستان پێشکەوتووی و توانای خۆی دەرخست، وەك هەڵوەشاندنەوەی تەواوی سیستمی بەڕێوەبردنی ویلایەتەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لەناوبردنی پاشماوەی سوڵتان و لایەنگرانی، سینترالیزەکردنی وڵات، لەناوبردنی پاشماوەی فیو دالیزم کۆتایی هێنان بە گەرمیان و کوێستان کردنی خێڵەکان و نیشتەجێ کردنیان، نەهێشتنی دەسەڵاتی شێخەکان، ناردنی سوپا بۆ ئەناتولی بەرەو سنوورەکانی تورکیا – ئێران، سەرباز گرتن لە کوردەکان و ناردنیان بۆ ڕۆژئاوای ئەناتۆلی.

سەرکردەکانی ئۆپۆزسیون لە زۆر کێشەدا ناکۆکن لەگەڵ پارتی گەلداو بە ئاشکرا دژی سیاسەتی توندوتیژیی دەوڵەتی تورکیان سەبارەت بە نەهێشتنی سەربەستی خێڵە کوردەکان و مەترسی ئەوەیان هەیە کە دەستدرێژی کردن بۆ لەناوبردنی بنەمای ژیان و ئایینی ئەوان کۆمارەکە دەخاتە ناو گێژاوێکی نوێوە. هەروەها دەڵێن کە لە بارودۆخێکی وادا خێڵە کوردەکانی کوردستانی ئێران بێگومان لەگەڵ کوردەکانی تورکیا بەرامبەر بەو دەستدرێژییانە یەك دەگرنەوە.

## جیاوازی پارتی گەل و سەرکردەکانی ئۆپۆزسیون سەبارەت بە ڕۆڵی بەریتانیاو فەرنسا لە کاروباری کوردەکاندا

ئانکەرە بەرپرسیاریەتی گەورە ئەخاتە ئەستۆی کۆنەپەرستانی تورکیا کە بەهاندانی کۆمەڵانی تاریکی پەرست و ئایینی – فەناتیکی، دەیانەوێ بە یارمەتی ئەوان دەسەڵات بگرنە دەستی خۆیان، هەروەها ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە ئەو کۆنەپەرستانە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا. ئۆپۆزسیون پێیان وایە کە تەواوی ئەم ڕاپەڕینانە و کێشەی مووسڵ و بە گشتی ململانێی فەرنسا و بەریتانیا لەسەر کێشەکانی ڕۆژهەڵاتە.

بەپێی بۆچوونی ئانکەرە، فەرانسە کە دەرفەتی تێپەڕبوونی سوپای تورکیای لە ڕێگای سووریاوە داوە (ئالبو - ئورفە) بەپێی پەیمانی فەرانسە – تورکیا بووە کە لە

ساڵی *1922* دا لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا بەسترا.بەڵام بۆچوونی ئۆپۆزسیۆن ئەوەیە کـە بەندەکانی ئەو پەیمانە هیچ پەیوەندییەکی بـەو کێشـەوە نییـە، بـەڵکو نـاردنی سـوپای تورکیـا بـە ناوخـاکی سـووریادا، تـەنیا لـە کـاتی تێـك هــەڵچوون و نائـارامیی نـاوخۆ و هەروەها دەست درێژی ئینگلیز بووە بۆ سەر تورکیا.

## ڕا پەڕینی کورد

بزووتنەوەی سەر هەڵداوەکان لە گەنجە بەڕێبەرایـەتی شـێخ سـەعید نـاوەڕۆکێکی کۆنەپەرستانەی هەیە و دژی کەمالیزمە و شێخ سەعید هەر لە سەرەتاوە ڕایگەیاند کە دانیشـتووانی ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەلاَت بـە کـورد و تورکـەوە چونیـەکن و تەنانـەت بــە جیاواز سەیر کردنی گەلی کورد و تورکی یاسـاغ کردبـوو، بزووتنـەوە کـە بەوتـەی ئـەو، دژی کەمالیستەکانە کـە ئـایین رەت دەکەنـەوەو خەلیفـەیان دەرکـردووەو.. هتـد. بـەڵام هـۆی ســەرەکی ڕاپەڕینەکــە ئــاژاوەی ئینگلیزەکانــە زۆر ســەرچاوە و دەنگوبــاس ئــەم ڕاستییە دەرئەخەن. لە ئێرانەوە ڕادەگەیەنن:

لە سەرەتای مانگی یەکەمی *1925* دا، دەستەیەکی نوێنەرایـەتی هـەردوو کوردسـتان کە ژمارەیان چواردە کەس بـوون لـە خێڵەبەناوبانگـەکانی کـورد لـە ئـێران و تورکیـا و سـکالاَی خۆیـان لەسـەر تـەنگ پـێ هـەڵچنین و چەوسـاندنەوەی گـەلی کـورد بـە دەسـتی دەوڵــەتانی تورکیــا و ئــێران دایــە چیمــبرلین و داوای پێکــهێنانی کوردســـتانێکی سەربەخۆیان کرد. چیمبرلین وەلاَمی دانەوە کە کێشەی کورد و ئەرمـەن لـە نـاو لیسـتی ئـەو پرۆژانـە دایـە کـە لـە ماوەیـەکی نزیکـدا لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر دەکرێـت و پێیــان دەگوترێـت کـە دەبـێ زۆر بـە هیوابـن کـە کێشــەی ســەربەخۆیی کوردســتان چارەســەر کردنەکـەی پۆزەتیڤانـە دەبێـت. دەنگوباســی زۆریــش هەیــە ئیســماعیل ئاغــای سمکــۆ دەیەوێ بگەڕێتەوە ئێران، ناوبراو چەند جار هاتووەتە ناوخاکی ئێرانەوە و نامـەی بـۆ بەرپرسی ناوچەی سابلاَخ یوسف خـان و ئـەمیر لەشـکەر نووسـیوە، ئـەوەی دووهـەمیان

وەڵامی داوەتــەوە کـە دەوڵـەت دژی ئـەوە نییـە بگەڕێتـەوە بـۆ ئـێران، بـەڵام دەبـێ ئـەو مەرجانەی کە بۆی دادەنرێت پەسەندی بکات.

لـەم بـارەوە هـەندێ بەڵگــەی دەوڵـەتی تورکیـا هەیـە کـە ئێمـە بـە نــهێنی لـە کۆمیسـاریای کاروبـاری نـاوخۆی کۆسـتەنتینەپول چاومـان پێکـەوت تیـایدا هـاتووە کـە ڕاپەڕینی گەنجە بە دەست و ئاژاوەی ئینگلیزەکانە کە دەیەوێ لاوازیی ئێمە و نەبوونی ئارامی لە وڵاتەکەماندا بخاتە پێش چاوی جیهان و بیرورای گشتی کۆمەڵەی نەتـەوەکان بـۆ بـەرژەوەندی خـۆی سـەبارەت بـە چارەسـەرکردنی کێشـەی مووسـڵ بـەلای خۆیـدا ر اکێشێت. ئەم فاکتە بە بەڵگە ئاشکرا کراوە، هەر لەبەرئەوەشە کـە دەیـەوێ دەست بـە دروستکردنی ڕێکخراوێکی نهێنی بکات بـۆ ئـەوەی کـە بـەردەوام لـە ڕەوتـی ڕووداوەکـان ئاگـادار بێـت. وا پێدەچێــت کــە چــالاکیی بەلشــەویکەکانیش لــەم هەلومەرجــەدا پەرەبستێنێت و لە ئاسـتی ئەوانیشـدا بـە زووتریـن کـات کومیسـارەکانی تورکیـا ئاگـادار بکرێنەوە.

لەبەر ئەوەی کە ناکرێت بارودۆخی سـوپایی لـە کونسـتانتینە پـول رابگەیـەنرێت ئەم بەڵگەنامەیە دراوەتە تەواوی هێزەکانی ئەوێ بۆ ڕاگرتنی هێمنایـەتی و پـەیوەندی نزیـك بـە قوماندارەکانــەوە، تـا لـە کـاتی پێویسـتدا بـە زووتریـن کـات بــە بــێ ئیجـازە وەرگرتن لە ناوەند هەنگاوی پێویست هەڵبگرن. هەروەها دەرکەوت کە لەبەر ڕاپــەڕینی کوردەکـان، دەوڵــەت ئاگــاداری جموجــووڵ و چــالاکیی پروگریســتەکان بــوو و بــۆ بەربەرەکانی کردنیان دەستوری تایبەتی درابوو بە قومانداری کوستەنتینە پول.

هـەروەها گـەلێك لـە مووچـە خـۆر و کارمــەندی دەوڵـەتی و پۆلیـس دەســتوریان پێدراوە لە هەموو بارێکەوە هێمنایەتی ڕاگرن. دەزگای پۆلیسی نهێنیشیان دروستکردوە بۆ خەبات دژی بەلشەویزم و دەستوریان پێدراوە چاودێریی ئــەو کەسـانە بکـەن کـە لـە ڕووسیاوە دێن، یا پەساپۆرتی ئینگلیزییان هەیە و بە بەلشەویك دەناسرێن. بە تـەواوی ناوەندەکانی پۆلیس دەستوور دراوە کە گەڕەك بە گـەڕەك و مـاڵ بـە مـاڵ بپشـکێنرێ و سەیری بەڵگەنامە و ناسنامە و پاسپۆرتیان بکرێت و ئەوانەی کـە گومانیـان لێدەکرێت دەبـێ چاویـان لەسـەر هەڵنـەگیرێت. ئەوانـەی کـە پاسـپۆرتی ڕووسـی یـا ئینگلـیزی یـا

ئەمریکییان هەیە، زۆربەیان گومان لێکراون و ئەگەر هـاتن و داوای مۆڵەتی نیشتەجێ بوونیان کرد بیان نێرن بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیسی کوستەنتینەپول.

هـەموو ئەمانـە ئـەوە نیشـان دەدەن کـە بزووتنەوەکـە زۆر جیـددی بـووە و بـۆ لەناوبردنی، هێزێکی یەکجار زۆری دەوێ لەگەڵ هەندی هەنگاو بۆ ڕاگرتنی هێمنایـەتی لـە ناوچـە ناوەندییـەکان. ئـەم بزووتنەوەیـە ئـاژاوەی ئینگلیزەکانـە و مەبەسـتی دروستکردنی "کوردستانێکی سەربەخۆ"یە لە ناو خاکی تورکیا و ئێراندا.

سەرچاوەی پێشوو. ل *17-21*.

## بۆ سەرکردایەتی کۆمینترن – ڕاپۆرتی بەشی ڕۆژهەلات.

کۆبوونەوەی فراوانی بەڕێوەبەرایـەتی کۆمینـترن کـە ماوەیـەك لەمەوبـەر کۆتـایی هـات، بـە تایبـەتی ئـەوەی دەسـت نیشـان کـرد، کـە بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـە بـەم دواییانـە لـە تـەواوی وڵاتـانی ڕۆژهـەڵات و کۆلونییـەکانی ئـەفریقاو هـەروەها لەسـەر ڕۆخـەکانی ڕۆژهـەڵاتی ئۆقیانووسی ئـارام دەسـتی پێکـردووە، وەك ڕووداوەکـانی چـین، میسر، مەغریب، وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەم خەباتەن.

ماوەیـەك لەمەوبـەر کـە بزووتنـەوەی دژە شۆڕشـی دەرەبەگـە کوردەکـان لـە ناوچـەکانی ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا و هـەروەها لـە باشـووری ئـێران سـەرکوتکران نیشـانەی ئـەوەن کـە پەرەسـەندنی بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازیی لـە ڕۆژهـەڵات دژی ئیمپریـالیزمی ئینگلیس و فەرەنسا و ژاپۆن و ئەمریکا و.. هتد تا ئێستا، ئەوەندە بەهێز نەبوە.

بەشی ڕۆژهەڵاتی کۆمینتیرن لەم ساڵانەی دواییدا لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم چالاکییانەی نواندووە.

**تورکیـا**. چـەند مـانگێك لەمەوبـەر نوێنـەری لێپرسـراوی بەشـی ڕۆژهـەلاتی کومینتـیرن نـێردرا بـۆ تورکیـا و لـەوێ لەگـەڵ کۆمیتـەی نـاوەندی پـارتی کۆمۆنیسـتی تورکیا کاری کردووەو لەسەر چـەند پرسـیاری ڕێکخراوەیـی و تـاکتیکی یارمـەتی پـارتی کۆمۆنیستی تورکیای داوە، ئیش کردن لـەوی زۆر سـەختە، سـەرەڕای پشـتیوانی کردنـی

کۆمۆنیستە تورکەکان لە دەوڵەتی کەمال و هەنگاوە شۆڕشگێڕانەکانی، بە مەبەستی جێبەجێ کردن و بە ئەنجام گەیاندنیان کۆمۆنیستەکانی تورکیا کەوتوونەتە بەر شالاوی تەنگ پێ هەڵچنینەوە، بە تایبەتی لە کاتی ڕاپەڕینی ئەم دواییەی کوردەکان/*1925*، بە ڕوونی دەرکەوت، ئەویش لە کاتێکدا بوو کە تەواوی چاپەمەنییە ئازادەکانی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا یاساخ کران. بەلام لەم سالانەی دواییدا پارتی کۆمۆنیست بە هاوکاری کۆمینتێرن لە دەوری گۆڤاری "ئایدنلیك" کۆبووەتەوە کە بە زۆری پەیوەندی بە کاروباری کرێکاران و سەندیکاکانەوە هەیە.

بیرۆی کۆمەنتێرن، هەروەها توانیویەتی لەگەڵ سەرکردەی ڕاپەڕیوەکانی مەغریب "عەبدولکەریم" پەیوەندی دروست بکا، هەروەها بانگهێشتی نوێنەرانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە جەزائیر و تونس کردووە بە مەبەستی بەستنی کۆنفەرانس و بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەو بەهێز کردنی بزووتنەوەکەیان لەم ولاتانە.

هەروەها لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی - شۆڕشگێڕی جەزائیر لە ڕێگای نامەوە پەیوەندی کراوەو لەگەڵ سەرکردەکەیان ئەمیر خالید پەیوەندی کراوەو پارتی کۆمۆنیستی فەرنسی بەرپرسی پەیوەندی زیاتری لەگەڵ ئەمیر گرتووەتە ئەستۆی خۆی.